# یاقووت و زمڕووتی
# [illegible]

## ئایین و فەلسەفە

(بەرگی دووەم)

حوسێن محەممەد عەزیز

2704 ک — 2004 ز



سالی (1950) لە شارۆچکەی (پینجوین) لەدایکبووە. هەموو قۆناغەکانی خوێندنی لە شاری (سولەیمانیی) تەواوکردووە.
سالی (1976) لە کۆلێژی کشتوکالی زانکۆی (سلیمانی) بە پلەی بەرز دەرچووە و لە هەمان کۆلێژدا بە مامۆستا دامەزراوە.
پاشان، لە بەرگەلی هۆی تایبەتیی، رووی لە دەرەوەی وولات کردووە و لە (یەکێتی سۆڤیێت) گیرساوەتەوە.
تا سالی (1987) دوکتورای لە تەرخانی تایبەتیی خۆیدا بە پلەی بەرز وەرگرتووە. لە سالی (1988)ەوە، وەک پەنابەری رامیاری لە (سوید) دەژی.
هەر لە سەردەتای لاویتییەوە، لە ریزەکانی (ی.ق.ک) و (پ.د.ک)دا، تیکەلی کاری رامیاریی و کوردایەتی بووە.
پاشان لە سالی (1970)ەوە، لە ریزەکانی (کازیک و پاسوک)دا، بەردەوامیی بە چالاکیی رامیاریی و خەباتی کوردایەتی خۆی داوە.
تا دواجار، لە سالی (1981) و تا ئەوروش، بە تەواوەتی، وازی لە کاری پارتایەتی هیناوە.
نووسەر تا ئیستە، بە دەیان گوتاری لە رۆژنامە و گۆڤارەکانی دەرەوە و ناوەوەی وولاتدا بلاوکردوتەوە. جگە لە سی کوری رامیاریی و نەتەوەیی
لە وولاتەکانی (ئەورووپا و کوردستان) گرتووە، (21) نامیلکە و پەرتووکی چاپ و بلاوکردۆتەوە.

حکومەتی هەرێمی کوردستان
وەزارەتی رۆشنبیری
بەڕێوەبەرێتیی گشتیی چاپ و بڵاوکردنەوە
زنجیرە (٢٧٩)

# یاقووت و زمڕووتی کوردیی

## ئاین و فەلسەفە

بەرگی دووەم

حوسێن محەمەد عەزیز

٢٠٧٤ک
٢٠٠٤ز

# یاقووت و زمرووتی کوردیی

نووسەر: د. حوسێن محەمەد عەزیز

بابەت: ئاین و فەلسەفە

سەرپەرشتیاری چاپ: سەلام فاتح

چاپ: چاپخانەی شڤان

تیراژ: ١٠٠٠ دانە

ژمارەی سپاردن: (٦٥١)ی ساڵی ٢٠٠٤ی وەزارەتی رۆشنبیریی پێدراوە

www.roshnbiri . org

ئەم بەرهەمە، پێشکەشبێ، بە گیانی پاکی، هەموو ئەو هۆنەرە کوردە نیشتمانپەروەرانەی، شەوگاری دوورودرێژ و تاریکونووتەکیان، لە بەر ڕووناکایی تیشکی مۆم، قووتیلەی نەووت و چرای ڕۆنگەرچەکدا ڕۆژکردۆتەوە، « یاقووت و زمڕووت »ی هۆنراوەیان، بۆ ڕۆلەکانی نەتەوەکەی خۆیان هۆنیوەتەوە و ڕازەی زمانی کوردییان کردووە.

# - نــــــاوەڕۆک -

# پێشەکـــــــــــــی

بە پێویستی دەزانم، چەن خاڵێ، دەربارەی ئەم بەرهەمە ڕوونکەمەوە:
1. دوور نییە، هێندێ لە خوێنەران بپرسن: ئەم بەرهەمە، بۆ دواکەوت؟ چونکە، دەبووایە، بەرگی یەکەمی، ساڵی « 2002 » چاپکرایە.
لە وەڵامدا دەڵێم: جگە لەوەی، هەمـوو ئەو سەرچاوانەی پێویستمبوون، لە بەر دەسمـدا نەبوون، بۆ ئەو مەبەستەش، ڕۆژی « 10 .04 .2002 »، بەرهەمەکەم، ڕەوانەی دەزگەی « سەردەم » کرد. بەڵام، دوای ماوەیەک، ڕەتیانکردەوە، گوایە: ئەو مامـۆستـایەی دابوویانـێ، بیـخـوێنێـتـەوە و هەڵیسـەنگێنێ، بە دڵی نەبووە! منیش، خۆم لـە « سـوید » بووم، ئاگام لەو هەواڵە نەبوو. لەبەرئەوە نـەمـتـوانی، وەریـگرمـەوە و لە دەزگـەیەکی دیکەی ڕووناکبیریی، بە چاپی بگەیەنم.
پاشان، ڕۆژی « 24 .08 .2002 » گەڕامەوە و بەرهـەمـەکەم وەرگرتەوە. ئـینجـا، پێـشـکەش بـە دەزگـەی « بەڕێوەبەرێتی گـشـتـیـی چاپ و بڵاوکردنەوە »ی سەر بە « شالیارگەی ڕۆشنبیریی »م کرد، تا چاپ و بڵاویکەنەوە. دوای ئەوەی، مـامـۆسـتـایەکی شـارەزا، بەرهەمـەکـەی خوێندەوە، زۆر بە شێوەیەکی جوان هەڵیسـەنگاند و لە سەری نووسی، لەبـەرئەوە، بڕیاریاندا، بڵاویکەنەوە. بـەڵام، مــەخــابن، هەر ئەو بـڕیارە بوو، ئیـدی یەک سـاڵ و دوو مــانگی ڕێک، لەو دەزگـەیە کـەوت و بڵاو نەکـرایەوە. چـونکە: لە لایەکـەوە، وەک بەڕێوەبەری دەزگـەکـە گـوتی: پارەیان نەبوو. لە لایەکی دیکەشەوە، لەو کاتەدا، تەپڵی جەنگی نێوان « ئەمێریکا » و « عێراق » لێیدەدا، کە دەنگی جەنگیش، گوێی خەڵکی کەڕکرد، ئیدی، کێ پارە بە پەرتووک دەدا و دەیخـوێنێتـەوە؟!! ئەوەبوو، جەنگ ڕوویدا و « بەعس »ی فاشیی، لە زێرابی مێژوودا نێژرا!
لەبەرئەوە، بـەرهـەمـەکـە، هەر وا مـایەوە، تا، ڕۆژی « 27 .05 .2003 »، جارێکی دیکە، سەردانی « کـوردسـتـان »م کردەوە و لەوێ، پاڵێکم پێوە نا! ئینجا، بەو پاڵەش، مانگی « نۆڤـەمبـەری2003 » بڵاوکرایەوە! جا، گەر ئەوە، حاڵی بەرگی یەکەمی بەرهەمەکە بووبێ، ئیدی دەبێ، حاڵی بەرگەکانی دیکەی، چۆن بێ ؟!!

2. ئەو هۆنراوانەی، بە زمانێکی ڕەوان و کوردییەکی پەتیی گوتراون، بە پێویستم نەزانی، لێکیانبدەمەوە و باسیانبکەم. بەڵکوو، تەنیا هەر، نموونەم لە سەر هێناونەتەوە. بەڵام، ئەوانەی واتاکانیان، زۆر ڕوون نەبوون و بە زمانێکی تێکەڵاو هۆنرابوونەوە، کەمێ بە درێژیی، لێیان دواوم. هەموو ئەو هۆنراوانەی، بە دیالێکت و خواردیالێکتەکانی دیکەی، زمانی کوردیش هۆنراونەتەوە، ئەوا، لە بەر ڕۆشنایی، لێکدانەوەی کۆڵەرەکان و بە یارمەتیی فەرهەنگەکانی زمانی کوردیی، لەگەڵ باری سەرنجی خۆمدا، تێکەڵاومکردوون و لێکمداونەتەوە.
3. ڕێنووسی کۆنی، هەموو هۆنراوەکانم گۆڕیوە و بەو ڕێنووسە نووسیومنەتەوە، کە خۆم باوەڕم پێی هەیە. بەڵام، لە هەمان کاتیشدا، بە پێویستم نەزانی، پیتە عەرەبییەکانی، هۆنراوە کلاسیکییەکان، بە پیتی کوردیی بنووسم، وەک هێندێ نووسەر، ئەو پیتانەیان گۆڕیوە، بە پیتی کوردیی نووسیویانەتەوە، گوایە: ئەو پیتانە کوردیی نین، وەک پیتەکانی دیکە، زۆر کوردیی بن ! چونکە، هێندێ جار، گەر پیتێکی عەرەبیی، بە پیتێکی کوردیی بگۆڕین، واتای ووشەکە تێکدەچێ و شتێکی زۆر سەیری لێ دەردەچێ ! بۆ نموونە: زۆربەی هۆنەرە کلاسیکییەکانی کورد، باسی کێوی « طوور »یان کردووە، کەچیی، هێندێ کەس، لەبری ئەوە، « توور »یان نووسیوە. جا تو خوا « طوور » و « توور »، یەک واتایان هەیە؟ یا، گەر ناوی « سەیف ئەلقوضات »، بە « سەیف ئەلقوزات » بنووسین، چەن شتێکی ناشرینی لێ دەردەچێ؟ تۆ بڵێی، بنەماڵەی خوالێخۆشبوو، لێمان قەبووڵکەن؟!!
4. نیشانەکانی « خاڵبەندیی »م، بۆ هەموو هۆنراوەکان داناوە.
5. هەوێنی هۆنراوەی کوردیی، هەر لە کۆنەوە تا ئەوڕۆ، لە چەن سەرچاوەیەکی جیاواز پێکهاتووە. بەڵام، لەم لێکۆڵینەوەیەدا، تەنیا هەر، لە چەن هەوێنێکی دیاریکراو دواوم. بۆیە، باس و لێکۆڵینەوەکەم، بەپێی بابەت دابەشکردووە. لە چەن بەرگێکدا کۆمکردوونەتەوە، هەر بەرگێکیش، لە بابەتێکی تایبەتیی دەدوێ. لەبەرئەوە، هەموو کۆن و کەلەبەرێکی، ژیانی هۆنەرانم نەپشکنیوە. یا، لە هەموو جۆرە هۆنراوەکانیان نەدوام، بەڵکوو، تەنیا هەر، هێندێ بابەتی تایبەتییم، لای ئەو هۆنەرانە کۆکردۆتەوە و پێکەوە تۆمارمکردوون!

6. دەربارەی بەرهەمی هۆنەران، گەر هەر هۆنەرێ، دیوانی چاپکراوی هەبووبێ، ئەوا، بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ، هۆنراوەکانم لێ وەرگرتوون. بەلام، گەر هۆنەرێ، دیوانی چاپکراوی نەبووبێ، ئەوا، لە هەر سەرچاوەیەکی دیکەدا، هۆنراوەی گونجانم، بەر چاو کەوتبێ، وەرم گرتوون.

هەروەها، ژمارەی ئەو هۆنراوانەی، لەم لێکۆڵینەوەیەدا هەڵمبژاردوون، بەپێی بەرهەم و جۆری هۆنراوەکان، بەگوێرەی چێژی تایبەتیی خۆم، لێم گوڵبژێرکردوون. مێشەهەنگوینی چێژی دڵ و دەروونم، بە سەر گوڵی لقی سەوزی درەختی، بەرهەمی هەر هۆنەرێکەوە نیشتبێتەوە، تا توانیویتی، تێرتێر، بۆنی گەڵای سەوز و گوڵی ڕەنگاوڕەنگی هۆنراوەکانی کردووە، شیلەی شیرینی هەڵمژیوە، چەن چەپکە گوڵێکی جوانیشی، لێ چنیوە و گوڵدانی باسەکەی پێ ڕازاندۆتەوە! لەبەرئەوە، هێندێ هۆنەر هەن، زۆر بە کورتیی، دەربارەیان دواوم و تەنیا یەک، هێندێکی دیکە دوو، هێندێکی دیکەش، پتر لە دوو نموونەم، لە هۆنراوەکانیان وەرگرتووە. ئەمەش، ئەوە ناگەیەنێ، ئەم هۆنەر، لەو هۆنەر، لەو بوارەدا باشتربووبێ! نەخێر، بەڵکوو لەوە پترم دەس نەکەوتووە.

7. هۆنەرەکانم، بەپێی تەمەنیان ڕیزکردووە. لەبەرئەوە، سیستێمی ئەلفوبێی ناوم، بەکار نەهێناوە. یا، بەپێی ناو و ناوبانگیان، ڕیزم نەکردوون. چونکە، بابەت لای من گرنگبووە و بە هیچ شێوەیە، گوێم بە پلەوپایەی هونەریی و هونەرمەندیی هۆنەران نەداوە! جگە لەوەی، زۆریشم هەوڵداوە، هۆنەرە لەبیرچووەکان، بیری خوێنەر بخەمەوە، یا، هۆنەرە کەم ناسراوەکان، بە خوێنەر بناسێنم!

8. ساڵی لەدایکبوونی هۆنەرەکانم، لە چەن سەرچاوەیەکی جیاوازی وەک: « عەلادین سەجادیی، سدیق بۆرەکەیی » و دیوانی هۆنەرەکانەوە وەرگرتووە. ئەوی بە کۆچیی نووسرابوو، لە بەر ڕۆشنایی، پەرتووکە نایابەکەی « فریمان جرنفیل ـ التقویمان الهجری و المیلادی »دا، ساڵە زایینییەکانیانم وەرگرتووە. لەبەرئەوە، بۆم دەرکەوت، لە نێوان ساڵەکاندا، جیاوازییەکی سەیر هەیە، هێندێ ساڵی لەدایکبوونی، هێندێ لە هۆنەران، هێشتا بە تەواویی ساغ نەبوونەتەوە. یا هەڵەیەکی

زۆریان تێدا هەیە. بۆ نموونە: مێژووی لەدایکبوون و مردنی « وەلی دێوانە »، لە هەموو سەرچاوەکاندا، وەک یەک نین. « رازیی » لە دیوانەکەیدا، ساڵی « 1180 ک » بە ساڵی لەدایکبوونی داناوە و باسی ساڵی کۆچیدوایی نەکردووە. بەپێی « فریمان »، ئەو ساڵە « 1766ز. » دەکا. کەچیی، لای « بۆرەکەیی »، ساڵی « 1216-1158 » کۆچیی نووسیوە، کە دەکاتە « 1801-1745ز. ». بەڵام، « سەجادیی » بە ساڵی « 1881-1826 » زایینی داناوە. هەرچی چۆنێبێ، لەوانەیە، ئەوەی « بۆرەکەیی »، لە هەردووکیان ڕاستربێ. چونکە، لە لایەکەوە، هاوتەمەنی « ڕەنجووریی » بووە و ئەویش، ساڵی « 1164- 1225 ک. = 1750 - 1810 ز. » ژیاوە، یا، نزیکەی لە یەک سەردەمدا ژیاون. لە لایەکی دیکەشەوە، نامەیان لە نێواندا هەبووە، کاتێکیش، « وەلی » مردووە، « ڕەنجووریی » هۆنراوەی بۆ هۆنیوەتەوە!

9. هۆنراوەی کلاسیکیی کوردیی، لە لایەکەوە، بە سامانێکی گرنگی نەتەوایەتییمان دادەنرێ. لە لایەکی دیکەشەوە، ئاوێنەیەکی باڵانما و خاوێنە، زۆر بە ڕوونیی، مێژووی وێژەی کوردیی تێدا دەبینین و بە هۆیەوە دەزانین، لەو ڕۆژانەدا، ئەو هۆنەرە پایەبڵندانەی کورد، چ جۆرە ملوانکەیەکیان، لە خشڵی زێڕ و زیو، مرواریی و گەوهەر هۆنیوەتەوە و لە ملی وێژەی کوردییان کردووە. جگە لەوانەش، مەبەستی لێکۆڵینەوەکەی خۆشم، پتر، خۆی لە بواری هۆنراوەی کلاسیکدا دەبینێ. زمانیش، وەک بوونەوەرێکی زیندوو، هەمیشە لە گۆڕان و پێشکەوتن دایە. ئەوەش، بە یەکێ لە جیاوازییەکانی، نێوان هەردوو هۆنراوەی نوێ و کلاسیک دەژمێررێ. هۆنەرە نوێخواز و لاوەکانیشمان، هێندە زۆرن، پێویستیان بە لێکۆڵینەوەیەکی درێژی تایبەتیی سەربەخۆ هەیە !

لەبەرئەوە، هێندەی بایەخم، بە لێکدانەوەی هۆنراوە کلاسیکییەکان داوە، هێندە، بایەخم بە هۆنراوە نوێکان نەداوە. چونکە، جگە لەوەی، دەستەی یەکەم، بە کوردییەکی قورس، بە زمانێکی تێکەڵاو و پڕ لە ووشەی بیانیی نووسیویانە، بەپێی باری سەردەمەکەش، چەن دیالێکت و خواردیالێکتێکی جیاوازیشیان بەکارهێناوە، کە ئەوڕۆ، زۆربەی زۆری، خوێنەری کورد، لێیان تێ ناگا. بەڵام، هۆنەرانی دەستەی

دووەم، بە کوردییەکی پەتیی دەنووسن، لەبەرئەوە، زۆر پێویستی، بە ڕوونکردنەوە و شیکردنەوە نییە.

10. جگە لەوەی، لە نێو هەموو ئەو هۆنەرانەشدا، بەپێ سەردەم و شێوەی دیالێکتەکان، بایەخێکی زۆرم، بە هۆنراوەکانی ئەو هۆنەرانە داوە، کە بە خواردیالێکتی « کرمانجی ژرووور »، وەک: « مەلای جەزیریی، خانیی »، دیالێکتی « کەڵهور »، وەک: « بابەتایەری هەمەدانیی » و دیالێکتی « گۆران » وەک: « بێسارانیی، صەیدی هەرامیی و مەولەویی » هۆنراوەیان گوتووە. چونکە، لە هەر سەردەمێکی مێژوویی، مێژووی نەتەوەی کورد و وێژەی کوردییدا، یەکێ لەو دیالێکتانە، خۆی بە سەر زمانی نووسیندا سەپاندووە. لەبەرئەوە، هەر کۆڵینەوە و توێژینەوەیەک، ئاوڕێ لە بەرهەمی، ئەو هۆنەرە کلاسیکییانە نەداتەوە، سەرنجێکی قووڵ، لە زمانی نووسین، شێوە و ناوەڕۆکی بەرهەمەکانیان نەدا، کۆڵینەوە و توێژینەوەیەکی سەرکەوتوو نابێ. چونکە، گەر تەنیا هەر، سەرنجێکی سەرپێیی، لە مێژووی وێژە و دیالێکتەکانی زمانی کوردیی بدەین، ئەوا، بۆمان دەردەکەوێ، لە هەر قۆناغێکی مێژوویدا، هۆنەرانی کورد، بە یەکێ لەو دیالێکتانە، هۆنراوەیان هۆنیوەتەوە. هەر چەندە، تا ئێستە، شارەزایانی کورد و بیانیی، لە سەر بۆچوونێکی یەکگرتوو، بە تەواویی ساغ نەبوونەتەوە و هەر کۆمەڵێکیان، دیدێکی جیاوازیان هەیە، هەر بۆ نموونە دەڵێم: « کاکەی فەلاح » نووسیویێتی: (کۆنترین شاعیری ناسراوی کرد، « عەلی تەرمۆکێ »یە کە لە سەردەمی دەیەمی زاییندا ژیاوە، شیعری زۆر بە سۆزی هەیە، لە بابەتی دڵداریی و نیشتمانپەروەریی ...)«256،46»

هەروەها، چەن مامۆستا و شارەزایەکی دیکە، پێیان وایە: (یەکەم دەسنووسی ئەدەبی کوردیی لە سەرەتادا بە دیالێکتی کرمانجی ژووروو پەیدابووە، یەکەمین شاعیرێکیش، کە بەم دیالێکتە نووسیویێتی « عەلی حەریریی »یە)«18،5»

بەڵام، هێندێکی دیکەش لە شارەزایان، پێیان وایە: لە نێوان سەدەی دە و یازدەدا، یەکەمین دەقی وێژەی کوردیی، بە دیالێکتی « کەڵهوڕ » نووسراوەتەوە و هۆنراوەکانی « بابەتایەری هەمەدانیی »ش، بە نموونە

دێننەوە، گوایە: یەکەمین هۆنەری کورد بووە، هۆنراوەی بەو دیالێکتە نووسیوە. لەبەرئەوە، یەک دید و بۆچوونی یەکگرتوو نییە !*

هەرچی چۆنێبێ، هێندێ لە شارەزایان پێیان وایە، لە سەدەی یازدەدا، بەشەدیالێکتی « کرمانجی ژووروو »، بە سەر دیالێکت و خواردیالێکتەکانی دیکەی، زمانی کوردییدا زاڵبووە. هێندێ، لە هۆنەرە ناسراو و بە ناوبانگەکانی کوردیش، وەک: « عەلی حەریریی، مەلای جزیریی، فەقێ تەیران، ئەحمەدی خانیی ... » و گەلێکی دیکەش، هەر بەم بەشەدیالێکتە، بەرهەمەکانی خۆیان تۆمارکردووە.

هەڵبەتە، شانبەشانی ئەو دیالێکت و خواردیالێکتانەش، لە ناوچە جیاوازەکانی دیکەی کوردستاندا، هێندێ دیالێکت و خواردیالێکتی دیکەی زمانی کوردیی، وەک زمانی نووسین بەکارهێنراون. بۆ نموونە: گەر، دیالێکتی « گۆران » بە گشتیی و بەشەدیالێکتی « هەورامانیی » بە تایبەتیی بگرین، ئەوا، زۆر بە ڕوونیی دەبینین: شوێنێکی گەلێ گرنگی، لە زمان و وێژەی کوردییدا، بۆ خۆی داگیرکردووە. چونکە، جگە لەوەی، وەک شارەزایان بۆیان ساغکردووینەتەوە، پێش ئەوەی، هۆنەرەکانمان، هۆنراوەی پێ بهۆننەوە، هەموو پەرتووکە ئایینییە کۆنەکانی کورد، وەک: « ئاڤێستا، ماریفەت و پیرشالیاری زەردەشتیی، سەرئەنجام »، هەر بەو بەشەدیالێکتە نووسراونەتەوە، یا، زۆر لە یەکدییەوە نزیکبوون، کە بەشی هەرە زۆریان، بە هۆنراوە هۆنراونەتەوە. لەبەرئەوە، گەر ئەو دەقە ئایینییانە، بە چەن دەقێکی وێژەیی دابنێین، ئەوا، هیچ گومانی تێدا نامێنێ، نووسین بە دیالێکتی « گۆران » لە هەردوو دیالێکتی « کەڵهوڕ و کرمانجیی » کۆنترە!

هەروەها، لە سەدەی چواردەیەم و بە دواوە، دیالێکتی « گۆران »، وەک زمانێکی وێژەیی، لە هێندێ ناوچەی ڕۆژهەڵات و باشووری کوردستان بەکارهاتووە، زمان و وێژەی کوردیی، بە هۆی ئەو دیالێکتە و کەڵەهۆنەرانی وەک: (مەلاپەرێشان، بێسارانیی، خانای قوبادیی، شێخی سیراجەددین، صەیدی هەورامیی، ئەحمەد بەگی کۆماسیی، میرزا شەفیعی جامەڕێزیی، مەلا فەتاحی جەباریی، مەولەویی تاوگۆزیی، سەی یاقوو، مەستوورە ... )«86-25،52»وە، پێشکەوتن و گەشەسەندنێکی لەبەرچاوی، بە خۆیەوە دیوە، ڕاژەیەکی زۆر گەورەی،

زمـان و وێژەی کوردیی کـردووە. شـاراوەش نییـە، ئەو هۆنەرە مـەزنانە، چەن سـەدەیەک دوای خۆشـیـان، کـارێکی زۆریان، لـە هێندێ هۆنەرانی دیکەی کورد کردووە. بۆ نمونە: دوو کەڵەهۆنەری وەک: « بێسارانیی » و « مـەولەویی »، کاریان لە دوو هۆنـەری گەورەی وەک: « پیـرەمێرد » و « گۆران » کردووە و پێویستیشی، بە بەڵگەهێنانەوە نییە!

11. لە بەشی یەکەمی ئەم لێکۆڵینەوەیە و ئەم بەشـەشـدا، هەمـوو ئەو سـەرچاوانەی بەکارمـهێناون، لە بەر ڕۆشنایی ڕێبازێکی زانسـتـانە و بەپێی فـەمـیلیـا، یا، نازناوی هۆنـەرەکـان ڕیز نەکـراون. چونکە، هێندێکیـان، ئەو مـەرجانەیان تێدا نییـە. لەبەرئەوە، تەنیـا، بەگوێرەی ئەلفوبێی، ناوی هۆنەرەکان تۆمارمکردوون.

12. لــەم جۆرە باسـانـە، هەم خـوێندکار، کۆڵەر و توێژەران دەتوانن، کـەڵکوەرگـرن. چونکە، چەن بابـەتێکی گـرنگم، بـۆ گـەڵاڵەکـردوون، بێ ئەوەی، بـە دوایدا بـگەڕێن و ئەرکـێکی زۆری پێـوە بکێـشن، لـە بەر دەسیـان دایە. هەم دەتوانرێ، پێشبـڕکێ لە سـەر بـابـەتەکانی بکرێ و خەڵاتیش، بەو کەسانە بدرێ، کە ئەنجامەکەی دەزانن. بۆ نموونە: کام هۆنەر، باشترین و جـوانترین، هۆنـراوەی ئایینیی گوتووە؟ یا، لە سـەر « بەهـار، هـاوین، پاییـز، یـا زسـتــان »، تـەڕ و پاراوترین هـۆنراوەی هۆنیـوەتەوە؟ یـا، کـام پارچە هـۆنراوە، لە بـواری هۆنراوەی « ئـەڤین و دڵدارییی، نەتەوەیی و نیشتمانیی »دا، سەرکەوتووتربووە؟

لە کۆتاییشدا، هەر ئەوە ماوە بڵێم: ئەوا، بە پشتیوانی یەزدانی گەورە، بـەرگی دووەمی « یاقـــووت و زمــــڕووت » تـەواویـوو و لە بـەر دەسـی خۆێنەوارنـی نەتەوەکەم دایە. هیوادارم، کەلێنێکی پڕکربێتەوە، کەڵکی لێ ببینن و لە باری سەرنجی خۆشیان، بێ بەشم نەکەن!

دوکتۆر حوسێن محەمەد عەزیز
ستۆکهۆڵم
2003/12/12

---

* تەماشای سـەرچاوەی ژمارە « 18 » و بەرگی یەکەمی ئەم بەرهەمە بکە، زۆر بە درێژیی، باسی ئەو دید و بۆچوونانەم کردووە!

# هەوێنی

# هۆنراوەی کوردیی

هەڵبەتە، هۆنراوەش، وەک هەموو بەشەکانی دیکەی هونەر و وێژە، بەپێی گۆڕانکارییەکانی سەردەم و زانست، بەپێی بابەت و ناوەڕۆکی هۆنراوەکان، بە سەر چەن جۆرێکدا دابەشدەکرێن.
لە سەردەمێکی زۆر کۆندا، فەیلەسوفێکی وەک « ئەرستۆ »، هۆنراوەی، بە سەر چوار جۆردا دابەشکردووە: (جنێودان، کۆمیدیا، ستایش و تراژیدیا.)«24،47»
بەڵام، ئەم دابەشکردنە، جگە لەوەی، خوڵ و گەردی، مێژووی لێ نیشتووە و زۆر کۆنبووە، ئەوڕۆش، شارەزایان، بە هیچ جۆرێ، بە ڕاستی دانانێن. چونکە، لە هەموو ڕوویەکەوە، بە تەواویی گۆڕاوە، گەلێ فراوانتربووە و چەندین جۆری دیکەی، لە ئامێزی خۆی گرتووە.
با بزانین، چۆن؟
لە قۆناغە جیاجیاکانی مێژوودا، هۆنراوە و هۆنەر، بە شێوەی جیاواز جیاواز، خۆیان نواندووە. دەتوانم، بڵێم: لە سەرەتادا، هۆنراوە، تەنیا هەر، بۆ دەستەیەکی دیاریکراو بووە. زۆربەی زۆری هۆنەرەکان، هۆنراوەکانیان، بۆ خۆیان و چەن کەسێکی دیاریکراو گوتووە و هەستی دەروونی خۆیان، لەو ڕێیانەوە دەربڕیوە.
بەڵام، کاتێ، مەڵبەندی دەسەڵاتی ڕامیاریی و فرمانڕەوایی، لە وڵاتە جیاجیاکانی جیهاندا، دامەزراوە، دەستەی فرمانڕەوایان، وردەوردە،

دەسەڵاتیان پەیداکردووە، بەهێزبوون، پەلوپۆیانهاویشتووە و پایەکانی فرمانڕەوایی دەوڵەتیان چەسپاندووە، ئیدی، ئەم شێوە هۆنراوانە، زۆر گۆڕاون. هێندێ جار، پلە و پایە، هێندێ جاری دیکە، زێڕ و زیو، هێندێ جاری دیکەش، چاوسووركردنەوە و زەبری شمشێر، كاری كاریگەری خۆیان كردووە!

دووریش نییە، پێویستییەكانی ژیانی ڕۆژانەی، ئەو سەردەمانەش، وای پێویستكردبێ، شێوەی هۆنراوەكان، لە هەستی دەروونێكی ڕوون و خاوێنەوە بگۆڕێ، شێوەیەكی خراپ و ناشیرینی « ستایشكردن، پێداهەڵدان، مامەییكردن و هەلپەرستیی »، لە ئەندازە بەدەر، لە خۆی بگرێ. بۆیە، لە دەرباری زۆربەی زۆری « خەلیفەكانی عەرەب، شاكانی ئێران، سوڵتانەكانی تورك » و پیاوە دەسەڵاتدارەكانیاندا، هۆنەری دەربار پەیدابوون. هۆنراوەیان، بە « شان و بازوو، ڕەنگ و ڕوو، ئازایەتیی و جوامێریی، لێهاتوویی و بلیمەتیی » دەسەڵاتداران و دەسوپێوەندەكانیاندا هەڵداوە.

بەڵام، دوای ئەوەی، هێندێ فێرگەی گیانیی جیاواز، لە مەڵبەندە جیا جیاكانی، جیهانی « خۆرهەڵاتی ناوەند »، لە نێو خودی ئایینەكە خۆیدا، پەیدابوون و سەریانهەڵداوە، زۆر لەو هۆنەرانە، لەو ڕێبازانە دووركەوتوونەتەوە. ئیدی، هۆنراوە، شێوەیەكی دیكەی جیاوازی وەرگرتووە، ڕێبازێكی دیكەی نوێی هەڵبژاردووە. بەرەبەرە، وازی لە پێداهەڵدانی دەسەڵاتداران هێناوە، لەگەڵ « ئەویندارییی، سۆفیگەریی و جوانپەرستیی »دا، جەمسەری هاوپەیمانیان گرێداوە. لە دوا قۆناغەكانیشیدا، هۆنراوەی ڕۆمانسیی پەرەیسەندووە. پاشان، لەگەڵ قووڵبوونەوەی كێشەی نەتەوایەتیی نەتەوە بندەسەكاندا، هەست و هۆشی نەتەوەیی، هوشیاریی ڕامیاریی، پێگەیشتووە و پێشكەوتووە، هۆنراوەی نەتەوەیی و نیشتمانییش، لە كێڵگەی زەویی بە پیت و سەوزی وێژەدا، چەكەرەیكردووە، لە هەگبەی هۆنەرەكانەوە، سەری دەرێناوە و لە نووكی پێنووسەكانیانەوە، وەك تاڤگەی زیو ڕژاوە!

لە سەردەمە جیاوازەكانی، قۆناغەكانی مێژووی كۆمەڵی كوردەوارییدا، ڕۆڵەكانی نەتەوەی كورد، گەلێ داواكاریی گرنگیان، لە بەرهەمی وێژەیی بە گشتیی و لە هۆنراوە بە تایبەتیی هەبووە. گەلێ جاریش،

قەپی زۆر گەورەیان داگرتووە. هەمیشە ویستوویانە، هۆنراوە، هەم، ڕووگەی دڵداریی بێ، ئاوپرژێنی، دڵ و دەروونی ئەڤینداران بکا. هەم، باسی جوانیی سروشت و ناسکی ژنیان بۆ بکا، بووکی ڕازاوەی ئەندێشەی، جوانیی سروشت و ناسکی ژنیان، بۆ لە پەردەکا. هەم، سەنگەری نیشتمانپەروەریی بێ، کۆمەڵانی خەڵک، بۆ خەبات و قوربانییدان هاندا. هەم، مامۆستایەکی گەورە و بلیمەتی، نەخۆشیی و دەردە کۆمەڵایەتییەکان بێ، ڕێی چاکە و سەرفرازییان پیشاندا. هەم، پیاڵەی مەی بێ، قوژبنی مەیخانە و مێزی خواردنەوەیان، بۆ برازێنێتەوە. هەم، لە قوژبنی « مزگەوت، تەکیە و خانەقا »کانیشدا، بەندی دڵ و هەستی دەروونی خواپەرستان بجوڵێنێ، ستایشی پەروەردگار و پەیامبەرەکەی بکا، دەروونی وشکەوەبووی خواناسان و سۆفییەکان پاراوکا!

بۆیە، گەر، هەر لە کۆنەوە تا ئەورۆ، هۆنراوە، لەگەڵ لقەکانی دیکەی، وێژەدا بەراوردکەین، دەبینین: گەلێ ئەرکی گەورە وگرانی، لە ئەستۆدا بووە، لە چاو لقەکانی دیکەی وێژەدا، ئەرکەکانی سەرشانی، زۆر زیاتر بووە و باری شانی قورستربووە. هەر لەبەر ئەوەش بووە، کۆمەڵانی خەڵک، پشتاوپشت، نەوە دوای نەوە، هۆنراوەکانیان، لە سنگی خۆیاندا هەڵگرتووە، لەبەریانکردووە و دەماودەم گێڕاویانەتەوە. هەر چەندە، زۆریان تێداچوون و نەماون، بەڵام، بەشێکی زۆریان پاراستووە، جگە لەوەی، هێندێکیشیان، بە نەمریی ماونەتەوە، لە دڵ و دەروونی، ڕۆڵەکانی نەتەوەکەدا، قوڵپیانداوە و تا ئەورۆش دەژین.

کەواتە: هۆنراوەی کوردیی، وەک هۆنراوەی، هەموو گەلانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و ئیسلام، وەک هەموو بەشەکانی دیکەی وێژە، بە پێی بابەت و ناوەڕۆکی هۆنراوەکان، لە گەلێ بواری جیاجیادا، بە سەر چەن جۆرێکدا دابەشدەکرێ. دەتوانم، بڵێم: هەر لە سەرەتاوە، هەوێنە سەرەکییەکانی هۆنراوەی کوردیی، خۆیان، لە گەلێ بابەتی گرنگی وەک: « هەستی خاوێنی ئەڤین و دڵداریی، دیاردەکانی سروشت و جوانیی، پاڕانەوە و ستایشی ئایینیی، هەستی دەروون، فەلسەی بوون و نەبوون، سۆفیگەریی، ڕەوشت و باری کۆمەڵایەتیی، باسکردن و پێداهەڵدان، پلارهاویشتن و داشۆرین، ڕەوشی نەتەوەیی و

نیشتمانیی، خەباتی ڕامیاریی و شۆڕشی چەکداریی، ئایدۆلۆژیای ڕامیاریی، چینایەتیی، مرۆڤایەتیی، ڕووداو و کارەساتی خوێناویی، شین و لاواندنەوە، یادی نەمران، گاڵتەوگەپ، گۆرانیی، سروود، شانۆگەریی، پەخشانەهۆنراوە، چیرۆکەهۆنراوە، داستانەهۆنراوە، پۆستەرەهۆنراوە و هۆنراوەی دراما »دا بینیوە.
لەبەرئەوە، دەتوانم، بڵێم: چەن زاراوەیەکی ڕەسەنی وەک: « هەست، سۆز، بیر، هۆش و گیان »ی، هەموو نەتەوەیەک، لە چەن شتێکی پڕ بایەخی وەک: « زمان، مێژوو، هونەر، وێژە و ترادیسیۆن »ی نەتەوەکەدا، خۆی نواندووە و خۆشی دەنوێنێ. لە بواری وێژەشدا بە گشتیی و هۆنراوە بە تایبەتیی، چەن سەرچاوە و هەستێکی پیرۆزی ئایدیالیی و مەرالیی وەک: « ئایین، ئەڤین و نەتەوەیی » هەن، بە سەرتۆپی، هەموو سەرچاوە و ڕەگەزەکانی دیکەی هۆنراوە دەژمێررێن. ئەو سێ هەستە پیرۆزەش، گەلێ جار، لە لایەکەوە، لەگەڵ یەکدیدا و لە لایەکی دیکەشەوە، لەگەڵ جوانیی سرووشتدا، تێکەلاو کراون، لە ئەنجامیشدا، یەک یەکەی وێژەیی بەرز و هاوئاهەنگیان پێکهێناوە. دواتریش، هەر هەموویان، لە ڕێژگەی یەک ئۆقیانووسی گەورەی، وێژەیی نەتەوەکە ڕژاون.
هەڵبەتە، هەر یەکێ لەو هەوێنانەش، چەن بەشێکی دیکەی، جیاوازی گرنگیان لێ دەکەوێتەوە. بەلام، ئەز لێرەدا، تەنیا هەر، لە هێندێ هەوێنی گرنگی، وەک: هۆنراوەی « ئایینیی و فەلسەفیی، سروشت و جوانیی، ئەڤین و دلداریی، نەتەوەیی و نیشتمانیی » بە گشتیی و هۆنراوەی « نەتەوەیی و نیشتمانیی » بە تایبەتیی دەدوێم، لە باخی ڕازاوەی، جۆربەجۆری هەر هۆنەرێکی کورددا، چەپکێ گوڵی ڕەنگا و ڕەنگی بۆنخۆش دەچنم، بەرهەمی ئەم جارە و سەرمێزی ماڵی، هەموو کوردێکی دڵسۆز و وێژەدۆستی پێ دەڕازێنمەوە.
هەر چەندە، « هێمن »ی دەسڕەنگین گوتوویەتی: (دیوانی هۆنەران، وەک باخچەی گوڵانن. گوڵی باخچە تا ڕەنگاوڕەنگتربن، تەماشاکەران زیاتر ڕازیدەکەن.)«198،66»
بەلام، هەر وەک چۆن، هەوێن و بابەتەکانی هۆنراوە، جیاوازییەکی زۆریان هەیە، بە هەمان شێوەش، هۆنەرەکانمان، لە نێو خۆیان و لە

بواره جیاجیاکانی هۆنراوەدانانەدا، ناویان ڕۆشتووە. واتە: هەر یەکەیان، لە بوارێکی تایبەتیی هۆنراوەهۆنینەوەدا، ئەسپی خۆیان تاو داوە. بۆ نموونە دەڵێم: لە بواری هۆنراوەی ڕۆمانسییدا، چەن هۆنەرێکی وەک: « نالیی، کوردیی، حەریق ... »، پتر ناسراون. لە کایەی هۆنراوەی، باسکردنی جوانیی سرووشتدا، چەن هۆنەرێکی وەک: « مەولەویی، پیرەمێرد، گۆران ... »، پتر ناویاندەرکردووە. لە بابەتی هۆنراوەی لاهووتیی و فەلسەفییدا، چەن کەڵەهۆنەرێکی وەک: « باباتایەری هەمەدانیی، مەلا پەرێشان، بێخود ... »، پتر بە ناوبانگن. لە بەشی هۆنراوەی سۆفیگەرییدا، چەن هۆنەرێکی بلیمەتی وەک: « مەلای جزیریی، خانیی، مەحویی ... »، پتر دەرکەوتوون. لە جۆری هۆنراوەی نەتەوەیی و نیشتمانپەروەرەییشدا، « سالم، حاجی قادری کۆیی، ئەحمەد موختار جاف ... »، پتر ناو و ناوبانگیان هەیە. هەروەها، لە بواری هۆنراوەی داشۆرینیشدا، جگە لە « شوکری فەزڵیی »، کە لە ناچارییدا، داکۆکیی لە خۆی کردووە، ئەوەی هەمانە و نیمانە، تەنیا هەر، « شێخ ڕەزای تاڵەبانیی »یە.

ئێستەش، کاتی ئەوەمان هاتووە، هەمووومان پێکەوە، کەمێ، لە خەرمانی وێژەی کوردییمان وردبینەوە، تا بزانین، ڕەگەزە سەرەکییەکانی هەوێنی هۆنراوەی کوردیی، خۆیان لە چیدا دەنوێنن؟ هۆنەرە کلاسیکییەکانمان، خۆیان بە چییەوە خەریککردووە؟ شەویان، لە بەر تیشکی مۆم، ڕووناکیی قوتیلەی نەوت و چرای « گەرچەک »دا، چۆن ڕۆژکردۆتەوە؟

ئایین، وەک پێوەندییەکی گیانیی، وەک ئایدیایەکی بەرز، کارێکی زۆری، لە ژیانی کۆمەڵی مرۆ کردووە و بە شێوەیەکی بەردەوامیش، کاریتێدەکا. پێوەندیی ئایین، (پێوەندییەکە، لە نێوان یەزدانی گەورە و تاکەتاکەی کۆمەڵی مرۆدا درووستدەبێ. ئەویش، لە ڕێی پەیامبەر و پەرتووکە ئایینییە پیرۆزە ئاسمانییەکانەوە پەیدادەبێ. وەک هۆز، هیچ جۆرە پێوەندییەکی ڕەگەز یا خوێن، ئەندامانی یەک ئایینی دیاریکراو، پێکەوە نابەستێ. هەروەها، پێویستی، بە هیچ جۆرە سەرکردەیە نییە. هۆز، لە نێوان کۆمەڵێکی دیاریکراو و لە نێو یەک نەتەوەی تایبەتییدا سەرهەڵدەدا. بە شێوەیەکی گشتیی، هۆزەکان، لە یەک ناوچەی جوگرافیای دیاریکراودا دەژین. بەڵام، جاری وا هەیە، هۆزێ، لە چەن ناوچەیەکی جیاوازدا نیشتەجێدەبێ، وەک لە نێو زۆربەی، هۆزە کوردەکاندا باوە. بەڵام، ئایین، سنووری هەموو « تیرە، هۆز، خێڵ، گەل، نەتەوە، ناوچە، وڵات و کیشوەر »ێ دەبڕێ، واتە: هۆز، سنوورێکی بەرتەسکی کۆمەڵایەتیی دیاریکراوی هەیە. بەڵام، ئایین، بێ سنوورە و پێوەندیی بە « هەست، هۆش، باوەڕ و گیان »ەوە هەیە. لە نێو دڵ و دەرووندا دەژی، وەک هەوا وایە، بە هەموو « ناوچە، وڵات و کیشوەر »ێکدا بڵاودەبێتەوە. لە نێو باوەڕی هەموو مرۆڤێکدا، ڕەگی قووڵی خۆی، بە شێوەیە لە شێوەکان دادەکوتێ. لەبەرئەوە، بە باوەڕێکی ئینتێرناسیۆنالی گیانیی دادەنرێ. بەڵام، هۆز، بە یەکەیەکی « کۆمەڵایەتیی ــ نەتەوەیی » دەژمێررێ. کاتێ، کۆمەڵ بەرەو پێشکەوتن دەڕوا، پێوەندییە ئابووریی و کۆمەڵایەتییەکان سەقامگیر دەبن، هۆز لە ئارادا نامێنێ و کۆتاییپێدێ. کەچیی، پێوەندیی ئایین، بە هیچ جۆرێ کۆتایی نایە. دەتوانم، بڵێم: ئایین، لەگەڵ تەمەنی زەویدا پەیدابووە، بە ژیان و مانی کۆمەڵی مرۆڤایەتییەوە بەسراوە، تا ئەم گەردوونەش بمێنێ، پێوەندیی ئایینیی، لە نێوان خەڵک و خوادا، هەر دەمێنێ و کاری خۆی دەکا.)«5،17»

لە سەرەتادا، هۆنراوە، لە نێو نەتەوەکانی « ڕۆژهەڵات » بە تایبەتیی و « ئەورووپا » بە گشتیی، پتر، بۆ باسی دڵداریی، پێداهەڵدان و جوانیی سروشت تەرخانکرابوو. بەڵام، کاتێ بیروباوەڕی ئایینیی، لە نێو کۆمەڵی مرۆدا بڵاوبۆوە، ئیدی، هۆنراوە، ڕووی لەو ڕووگە

سروشتییەی خۆی وەرچەرخان، ڕووی لە دەروازەی خواپەرستیی و ئایین کرد. بە تایبەتیی، کاتێ ئایینی ئیسلام هات و بە تەواویی بڵاو بۆوە، ئیدی، هەموو شت گۆڕا، هۆنراوەی ئایینیی، بە تەواویی، شوێنی شیاوی خۆی کردەوە و جێی، بە جۆرەکانی دیکەی هۆنراوە تەنگکرد.
هەر چەندە، هۆنراوەی ئایینیی، بە تەواویی نەیتوانی، هەموو جۆرە هۆنراوەکانی دیکە بسڕێتەوە و لەناویانبەرێ، بەڵکوو، هۆنەرەکان، هەر لە سەر، هۆنراوەهۆنینەوەی خۆیان، بەردەوامبوون. بەڵام، وەک جاران، نەبوو. یا، لە نێو خەڵکە موسوڵمانە خوێندەوارەکان بە گشتیی و نەخوێندەوارەکاندا بە تایبەتیی، ئەو بایەخەی، هۆنراوەی ئایینیی پێ نەدراوە. بۆیە دەبینین: لە کۆندا، زۆربەی هۆنەرە کلاسیکییەکانی کورد، گەر، هەموو هۆنراوەکانی خۆیان، بۆ ئایین تەرخان نەکردبێ، ئەوا، بە شێکی زۆریان، بۆ هۆنراوەی ئایینیی تەرخانکردووە.
لەبەرئەوە، بە ئاشکرا دەبینین: هۆنەرەکانی « عەرەب »، ستایشێکی زۆری، خەلیفەکانی « عەبباسیی » و « فارس »ەکانیش، گەلێ ستایشی « بەرمەکیی »یەکانیان کردووە.
لە نێو کۆمەڵی کوردەوارییشدا، هەر لە کۆنەوە تا ئەوڕۆ، گەلێ ئایینی وەک: « زەردەشتیی، جوو، فەلە، ئیسلام، کاکەیی، یەزیدیی »، چەن ئایینزایەکی وەک: « سوونە و شیعە » و چەن ڕێبازێکی ئایینیی وەک: « قادریی، نەقشیی و هەقە ... » هەبووە و هەیە. لەبەرئەوە، شتێکی زۆر ئاساییە، گەر، زۆربەی زۆری، هۆنەرە کلاسیکییەکانی کورد، هۆنراوەی ئایینییان گوتبێ. تەنانەت، لە نێو وێژەی کوردیدا، وای لێهاتووە، وەک دیاردەیەکی وێژەیی، زۆر بە زەقیی ڕەنگیداوەتەوە. چونکە، بە هەموو دیالێکت و بن دیالێکتەکان، لە هەموو بەش و ناوچەکانی کوردستان، هۆنراوەی ئایینیی هۆنراوەتەوە.
ئەز، کاتێ، باسی هۆنراوەی ئایینیی کوردیی دەکەم، تەنیا هەر، مەبەستم ئەوەیە، لە هۆنراوەی هۆنەرە کوردەکان بدوێم، مەبەستم ئەوە نییە، لە پەرتووکە ئایینییە کوردییەکان بکۆڵمەوە، کە بە شێوەی هۆنراوە و بە دیالێکتی « گۆران » نووسراون. ئەگینا، (تێکستی هۆنراوەی شێوەی گۆرانیی، کۆنترین تێکستە لە وێژەی کوردییدا. یاخود، بە واتایێکی تر دەتوانین، بڵێین: سەرەتای مێژووی وێژەی

کوردیی، بە هۆنراوەی شێوەی گۆرانیی دەستیپێکردووە، ئەگەر، چوارینەکانی « باباتایەری هەمەدانیی 935 - 1010 ز. » بخەینە ئەو لاوە، کە بە شێوەیەکی کوردیی ئێرانیی ناوچەیی تێکەڵاو یا بە شێوەی لووڕیی نووسراوەتەوە.)«91،51»

هەر وەک چۆن، لای هێندێ نەتەوە، زمانی نەتەوەیی و زمانی ئایین، زۆر بە توندیی، پێکەوە بەسراون، بۆ نموونە: زمانی عەرەبیی و ئایینی ئیسلام، هەر یەک زمانن. بە هەمان شێوەش، لە لایەکەوە، زمانی ئایین و وێژەی ئایینیی، لە لایەکی دیکەشەوە، زمانی نەتەوەیی و وێژەی ئایینییش، پێوەندییەکی زۆر پتەویان، لە نێواندا هەیە.

گومانی تێدا نییە، ئەوەتەی نەتەوەکان پەیدابوون و زمانی نەتەوەییان لا درووستبووە، پاشان، ئایینە جیاجیاکان، سەریانهەڵداوە، هەمیشە و لە هەموو قۆناغە جیاوازەکانی، مێژووی کۆمەڵی مرۆدا، وێژی ئایینیی، لە کالا و بەرگی ڕازاوەی جیاجیادا، خۆی نواندووە. جا، ئەو هۆنراوە ئایینییانە، لە چاخی کۆن و پێش ئیسلامدا بووبن، یا، دوای ئەوەی، ئایینی ئیسلام دەرکەوتووە، بەشێکی گرنگی، لە وێژەی نەتەوەکاندا، بۆ خۆی داگیرکردووە. لەبەرئەوە، لە کۆندا، بە شێوەیەکی گشتیی و بە تایبەتیش، دوای ئەوەی ئایینی ئیسلام بڵاوبۆتەوە، کەم هۆنەر هەیە، هۆنراوەی ئایینیی نەهۆنیبێتەوە.

بۆیە، (وێژەی کوردیی، لە سەدەکانی ناوەڕاستەوە سەریدەرهێنا و بە وێژەی ئایینیی و ئایینزایی و گیانی سۆفیزم دەستیپێکرد. ئەوەی ئاشکرایە، ئەوەیە: کە ئەو وێژەیە، بە هەموو شێوە سەرەکییەکانی زمانی کوردیی پەیدابوو و پەرەیسەند. « مەلای جزیریی » سەدەی یازدەیەمی زایینیی، هێندێ لە باوەڕەکانی « سۆفیزم »، ئەوەی « جەلالەدینی ڕۆمیی 1207-1273 ز. » بڵاویکردبووەوە، وەگرت و لە ڕوخساری « غەزەل »دا، بە شێوەی « کرمانجیی سەروو »ی زمانی کوردیی بڵاویکردەوە. هەر بەو شێوەیەش، دوو پەرتووکە پیرۆزەکەی « یەزیدیی »یان « جیلوە » و « مەسحەفی ڕەش » نووسراوەتەوە. ئەمە کۆنترین تێکستی ئایینیی « یەزیدیی »یەکانە، هەرچی وێژەی شێوەی « گۆرانیی »یە، ئەویش، بە وێژەی ئایینیی دەستیپێکردووە، کۆنترین هۆنەرێک، بەم شێوەیەی نووسیبێ، « مەلا پەرێشان »ە.)«93،51»

لەبەرئەوە، زۆربەی هەرە زۆری، هۆنراوەکانی « مەلا پەرێشان »، بە هۆنراوەی ئایینیی دادەنرێن. بۆیە، گەر کەمێ، لە بەرهەمی هۆنەرانی سەردەم و دوای سەردەمی خۆشی وردبینەوە، زۆر بە ئاشکرا دەبینین: (کارتێکردنی « مەلا پەرێشان »، بۆ سەر وێژەی کوردیی بە گشتیی و وێژەی ئایینیی بە تایبەتیی، زۆر بە هێزبووە. ئەو هۆنراوانەی، لە بابەتی ئیمان و ئیعتیقاد نووسیونی، لەو هۆنراوە ئایینییە مillییانەن، کە لە قۆناغی درووستبوونی نەتەوە و پەرەسەندنی پەیدا دەبن. لەم کارەدا، گەلێ هۆنەری میللیی جیاواز، بەشداردەبن و ناویان ووندەبێ و بەرهەمیان دەبێتە بەشێک لە سامانی وێژەی میلیی فۆلکلۆری نەتەوە.)«110،51»

بۆیە، ڕەنگە لە مێژووی وێژەی کوردییدا، بە سەدان هۆنەری کوردمان هەبووبێ، هۆنراوەی ئایینییان هۆنیبێتەوە، بەڵام، ناو و نیشانیان نەمابێ و ونبووبێ!

هەروەها، چەندین هۆنەری دیکەمان هەبووە، هۆنراوەی ئایینییان گوتووە. بۆ نموونە: هۆنەرێکی وەک « صەیدی هەورامیی »، کوردێکی موسوڵمانی سووننی بووە و هۆنراوەی ئایینیی داناوە.

« مەولەویی »، سووننیی بووە، هەر چەندە، بە تایبەتیی، هۆنراوەی ئایینیی نەنووسیوە و هۆنراوەی زۆری ئایینیی نییە. بەڵام، تەنیا هەر، (مەسنەوییەکەی کە بە ناوی « ئەلعەقیدە ئەلمرضیە » لە زانستی کەلام، ئەمە لە هۆنراوە ئایینییە دیارەکانە.)«115،51»

جا، هەر وەک پێشتریش گوتم و لێرەشدا، دووپاتیدەکەمەوە، هەموو ئەو هۆنراوانەی، بۆ ئایینە کوردییەکان گوتراون، ئەز لێرەدا، پەنجەیان بۆ ڕاناکێشم. ئەوڕۆش، گومانی تێدا نەماوە، ئەو ئایینانە، هەر هەموویان کوردیی بوون و دەقی هۆنراوەکانیش، هەر بە زمانی کوردیی نووسراون.

هەر وەک زۆر لە مێژە، ڕۆژهەڵاتناسێکی وەک « مینۆرسکیی »ش نووسیویەتی: (سۆفیزم، سەرەتایەکی تایبەتیی هەیە. ئەمە تەنیا ڕووداوێکی ئیسلامیی نییە. لەگەڵ ئەوەشدا، ژیانی ئایینیی، لە لای کورد ئەوەیە، کە ئایینزای زۆری گرتۆتە خۆ. دوو ئایینی سەیری تێدایە، ئەمانە، لە سەر بنچوبناوان و جەوهەری کوردیی دامەزراون.

یەکەمیان: « یەزیدیی »یە ... بەڵام، ئاییینی دووەم: « عەلی ئیلاهیی »یە. ئەمە، ئاییینێکی کوردیی بێ گەردە و تا ئێستەش، بە تەواویی، لێی نەکۆڵراوەتەوە.)«69،52-56» «51،93-94»

شتێکی ئاشکرایە، زۆربەی هەرە زۆری نەتەوەی کورد، پێڕەوی ئاییینی ئیسلام دەکا. دەتوانم، بڵێم: کورد لە هەموو گەلەکانی دیکەی ئەم سەر زەوییە، پتر باوەڕی بە ئایین و خواپەرستیی هەبووە و هەیە. ئاییینی ئیسلامی، زۆر بە توندیی وەرگرتووە و زۆر بە گەرمییش، لە ئامێزی گرتووە. لای کورد، لادان لە ئیسلام، نەک هەر بە گوناهێکی گەورە دادەنرێ، بەڵکوو، بە تاوان و گاوورییش دەژمێررێ. لەبەرئەوە، شتێکی سەیر نییە، گەر لەو ڕۆژەوە، ئاییینی ئیسلام لە کوردستاندا بڵاوبۆتەوە، بە هەزاران کورد، لە ڕێی ئەو باوەڕەدا، سەر و گیانی خۆیان بەخشیبێ. هەروەها، شتێکی سەیر نییە، گەر زۆربەی زۆری، هۆنەرە کلاسیکییەکانی کورد، گەلێ هۆنراوەی ئاییینییان گوتبێ، باسی گەورەیی و تاکوتەنیایی پەروەردگاریان کردبێ، لێی پاڕابنەوە، تا، لێیان خۆشبێ. هەروەها، بە چامەی درێژ، ستاییشی پەیامبەر و یارانیان کردبێ، بە پەیامبەر، پیر و پیاوچاکانیاندا هەڵدابێ.

لە بەر ڕۆشنایی، ئەو باسانەی سەرەوەدا، ئەوەمان بۆ ڕووندەبێتەوە: هۆنراوەی ئاییینیی، لە نێو کۆمەڵی کوردەوارییدا، مێژوویەکی کۆنی هەیە. واتە: پێش ئەوەی، ئاییینی ئیسلام، لە کوردستاندا بڵاوبێتەوە، هۆنەرە کوردەکان، هۆنراوە و سروودی ئاییینییان گوتووە. بە هۆنراوە و بە گۆرانیی فۆلکلۆریی، لە خواکانی خۆیان پاڕاونەتەوە، ستاییشی پیاوچاکانیان کردووە. بە تایبەتیی، ئەوەش دەزانین، هەموو ئەو ئاییینە کۆنانەی، پێشتر ناومهێنان و لە کوردستاندا هەبوون، پێش ئەوەی، ئاییینی ئیسلام، دەنگ و ڕەنگی هەبێ، هەموویان، هەر بە زمانی کوردیی و بە هۆنراوە نووسراونەتەوە.

دوای ئەوەی، ئاییینی ئیسلامیش، لە کوردستاندا پەیدابووە، وردەوردە، ڕەگی قووڵی خۆی داکوتاوە، ئیدی، هۆنەرە کوردەکانیش، وەک هۆنەری گەلانی دیکەی ئیسلام، هۆنراوەی ئاییینییان هۆنیوەتەوە.

لە مێژووی وێژەی کوردییدا، جگە لەوەی، زۆربەی زۆری هۆنەرانی کورد بە گشتیی، هۆنراوەی ئاییینییان داناوە، چەندین هۆنەری

ناسراوی وەک: « باباتایەری هەمەدانیی، مەلا پەرێشان، فەقێ تەیران، میر محەمەد ساڵح نیعمەتوڵڵا، خانای قوبادیی، مەولەویی، پیر شالیاری زەردەشتیی، مەحویی، موخلیس، خاکیی، خادیم، سەیید ئەحمەدی نەقیب، بێخوود، چروستانیی ... » هەبووە، لە سەردەمە جیاجیاکانی مێژووودا و بە تایبەتیی، هۆنراوەی ئایینییان گوتووە.
دەبێ، ئەوەش زۆر باش بزانین، زۆربەی هەرە زۆری هۆنەرە کوردەکان، زۆر رێزی خۆیان گرتووە، تەنیا هەر، لە گۆشەی خواپەرستییەوە، لە هەموو شتێکیان ڕوانیوە. چونکە، زۆر بە باشیی، لە ئایینەکە گەیشتوون. موسوڵمانێکی ڕاستەقینە و خواناسێکی تەواوبوون. بۆیە، تەنیا هەر، هۆنراوە و سروودی ئایینییان گوتووە، بە هۆنراوە، باسی گەورەیی و میهرەبانیی، پەروەردگاری جیهانیان کردووە و لێی پاڕاونەتەوە، تا، لە گوناهەکانیان خۆشبێ. هەروەها، ستایشێکی زۆری، پەیامبەر و چوار جێنشینەکەیان کردووە. ناوبەناویش، بە سەر پیر و پیاوچاکانی، موسوڵمانە کوردەکانی خۆشیاندا هەڵداوە.
لەبەرئەوە، گەر چاوێ، بە لاپەڕەکانی مێژووی وێژەی کوردییدا بخشێنین، دەبینین: هۆنەرە کوردەکان، لەو سەردەمانەدا، زۆر بە دەگمەن نەبێ، بە سەر خەلیفە عەرەبەکانی، هەر دوو ئیمپراتۆریای ئیسلامیی « ئەمەویی و عەباسیی »دا هەڵیان نەداوە. چونکە، زۆر باش زانیویانە، چۆن موسوڵمانێ بوون! تەنانەت، لە سەردەمی دەسەڵاتی، ئیمپراتۆریای توورکە « عوسمانیی »یەکانیشدا، مەگەر، هەر تەنیا، دوو هۆنەری وەک « مەحویی » و « شێخ ڕەزای تاڵەبانیی »، هۆنراوەی تایبەتییان، بۆ سوڵتان « عەبدولحەمید » هۆنیبێتەوە، ئەگینا، کەسی دیکە، هۆنراوەی بۆ نەگوتوون!
هەر بۆیە، لە سەدەکانی ناوەڕاستدا، هۆنەرە کوردەکان، هۆنراوەیان، بۆ ئەو جێنشینانە نەگوتووە. وەک هۆنەرە عەرەبەکان، لە دەرباری جێنشینەکانی « عەبباسیی »دا نەکەوتوون و چاوەڕوانی، بەزەیی ئەو جێنشینانە نەبوون، تا، لە پاداشتی هۆنراوەیەکدا، لە زێڕ و زیویان بگرن. یا، وەک زۆربەی هۆنەرە فارسەکان، بە شانوبازووی، دەسەڵاتدارانی « بەرمەکیی »یەکاندا هەڵدەن، تا، چەن تورەکەیە پارەوپوڵیان دەسکەوێ.

هەڵبەتە، شتێکی ئاشکرایە، نەتەوەی کورد، ڕۆژێ لە ڕۆژان، وەک نەتەوەکانی دیکەی « عەرەب، فارس و توورک »، نە خاوەنی دەوڵەتێکی یەکگرتووی ناوەندیی بەهێزی نەتەوەیی خۆی بووە، جگە لە کوردێکی وەک « سەلاحەددینی ئەیوبیی »ش، نە جێنشین و سوڵتانێکی کوردی موسوڵمان و مەڵبەندێکی تایبەتیی ئیسلامیشیان هەبووە، تا هۆنەرە کوردەکان، ڕووی تێکەن، هۆنراوە، بۆ دەسەڵاتداران و جێنشینەکانی کورد بڵێن. لەبەرئەوە، هۆنەرە کوردەکان ناچاربوون، بە دڵێکی خاوێن، لە دەروونێکی بێ گەرد و بە باوەڕێکی پتەوەوە، ڕوو لە دەروازە، ئاواڵە گەورە پڕ لە سۆزەکەی، بارەگای پەروەردگاری مەزن بکەن، پتر هۆنراوەی « فەلسەفیی، ستایشی ئایینیی و سۆفیگەریی » بڵێن، ستاییشێکی جوان و بێ وێنەی، « یەزدانی گەورە، پەیامبەری خۆشەویست، چوار جێنشینەکە، پیر و پیاوچاکانی ئیسلام » بکەن. جا، گەر، هەر لە هۆنەرێکی وەک « باباتایەری هەمەدانیی »یەوە بیگرین، تا، بە « بێخود » دەگا، ئەو ڕێبازەیان گرتووە! لێرەدا، هەوڵدەدەم، هێندێ نموونە، لە سەر هۆنراوەی ئایینیی بێنمەوە.

# « بابەتایـــــەری هەمەدانیی ـ عوریان »

# « 1010 - 0935 »

هۆنەرێکی گەورە و ناسـراوی کورد بووە. بە دیالێکتی « لووڕیی » و بەشەدیالێکتی « کەڵهووڕیی »، هۆنراوەی هۆنیوەتەوە. بە باوەڕ، سەر بە « ئەهلی هەق » بووە. دوای ئەوەی، بە تەواویی، لە دەوروبەری خۆی وردبۆتەوە، بە باشیی، لە نهێنییەکانی ژیان و گەردوون تێگەیشتووە، ئیدی، وەک ڕەندێکی بێ پەروای قـەلەندەر، لە هەمـوو ڕوویەکـەوە، پەرێشـانی دایگرتووە، جـێـیـە نەمـاوە، تا مـاندوێتی خـۆی، تێـدا بحەوێنێتەوە، گیانی شەکەتی، تێیدا ئارامبگرێ. کەسێ نەبووە، تا بە پشـتـیـووانی خـۆی دانێ. لە ناچارییـدا، ڕووی لە دەشت و چۆڵیی کردووە، لە تاو دەردی گەردوون، بە ڕۆژ خوولی خواردووە، بە جیهاندا گەڕاوە و سـوڕاوەتەوە. بە شـەویش، لە هەر کـوێ بـۆی ڕێککەوتبێ، سەرینی بەردبووە و لێی نووستووە. لەبەرئەوە، گەلێ هۆنراوەی بەرز و جوانی، لە بواری فەلسـەفـە و ئاییندا هۆنیوەتەوە، کـە تا ئەوڕۆش، لە بواری فـەلسـەفـەی ژیاندا، لە ڕووی کـێـشـەکـانی بوون و نـەبوونەوە، بایەخی تایبەتیی خۆیان هەیە.

دوای ئەوەی، بـە دوای خـۆیدا گـەڕاوە، ئەو گـەشـتـە گـرنگەی تەواو کردووە، بە تەواویی، خۆی دۆزیوەتەوە، ئینجا، خۆی پێ ناساندووین و لە چوارینێکدا گوتوویەتی:

من ئەو کەسەم، ناویاننا قەلەندەر\
پەرێشانم، پەرێشان لە هەموو سەر\
کە ڕۆژبۆوە، لە دەس دنیا ئەدەم خول\
کە شەوداهات، بەردێ ئەنێمە ژێر سەر «53،7»

ئەوەتە، لەبەرئەوەی، بیری لە ژیانی تایبـەتیی خـۆی نەکـردۆتەوە، پتر، بیری لە باری ژیانی خـەڵک و جیهان کـردۆتەوە، لەبەرئەوەی، هیچ جۆرە دەسـەڵاتێکیـشـی نەبووە، بە نـاچاریی، ڕووی لە دەروازەکـەی یەزدانی مەزن کردووە، زۆر بە ڕاشکاویی، لێی پرسیوە و گوتوویەتی:

ئەگەر دەستم، ئەگەیشتە تۆ خوایە
لێم ئەپرسیت، کە ئەم ژینە بۆ وایە
یەکێ مەستە، لەگەڵ یاری بە شادیی
یەکێ برسیی، بۆ نانـــێ موبتەلایە «54،7»

لەبەرئەوە، ئەو هەست و سۆزەی، لە خۆشەویستیی یارەکەیدا هەی بووە، لە هیچ جۆرە خۆشەویستییەکی دیکەدا نەیبووە! ئەو تام و چێژەی، لەو خۆشەویستییەی دیوە، لە هیچ شتێکی دیکەی نەدیوە! دواتریش، ئەو هەست و سۆزەی، ئەو تاموچێژەی، لە خۆشەویستیی پەروەردگار و ئەڤینێکی قووڵتری بێ کۆتاییدا دۆزیوەتەوە. باوەڕی شەقوشلۆقی، ڕێکبۆتەوە و گیانی شەکەتی حەواوەتەوە. بۆیە، هەر زۆر زوو، ڕووی پەشیمانیی، لە قاپی، پڕ بە سۆزی یەزدان کردووە، خولیای خواپەرستیی و ڕاستیپەرستیی، لە کەللەی داوە، خۆی بە قوڵفی سۆفیگەریی و فەلسەفەدا هەڵواسیوە. ئیدی، تەنیا هەر، لەو بوارەدا خولاوەتەوە، بە هەر چوارلای خۆیدا سوڕاوەتەوە، جگە لە سۆز و ئەڤینی یەزدانی مەزن، هیچی دیکەی لا گرنگ نەبووە، کەسی دیکەی نەبینیوە و گوتوویەتی:

ڕوویکەمە سەحرا، وێنەت ئەبینم
بچمە ناو دەریا، شێوەت ئەبینم
ڕوو لە هەر کوێ کەم، چۆڵ و بیابان
شێوەی بێ وێنە و هاوتا ئەبینم «42،7»

بۆیە، پەنای بۆ خوای تاکوتەنیا بردووە، داوای یارمەتیی لێ کردووە و گوتوویەتی:

ئەی پەروەردگار! وەرە فریای من
کەسی بێ کەسان، هەر تۆی پەنای من
ئەڵێن: « تایەر »، تۆ کەست نەماوە
تۆی هەموو کەسم، هەر تۆی هیوای من «14،7»

ئیدی، وای لێ هاتووە، هەمیشە، بیری لە « ژیان، مردن، گۆڕ، ڕۆژی زیندووبوونەوە و لێپرسینەوە » کردۆتەوە و گوتوویەتی:

دنیا سفرەیە، مرۆڤ میوانە
ئەمڕۆ گوڵزارە، سبەی خەزانە

چاڵێکی تاریک، کە ناوی گۆڕە
ئەڵێن: ئێرە، جێی گشت خان و مانە «19،7»
یا، کاتێ، دەربارەی ژین و مردن، لە دوو چواریندا گوتوویەتی:
جارێ ڕێم کەوتە، ناو گۆڕستانێ
هاتە گوێم دەنگی، بە کوڵ گریانێ
دیم ئێسقانێکە، لە خاکا ئەڵێت:
خۆشیی و لەزەتی، سەر دنیا کوانێ؟ «23،7»
ئەگەر خاوەن نگین بی، دوایی هیچە
شاهی سەر تەختنشین بی، دوایی هیچە
حوکمڕان بی، لە سەر تەختی « سولەیمان »
جێگەت دوو توێی زەمین بێ، دوایی هیچە «33،7»
هەروەها گوتوویەتی :
ئەی نەفسی شوم، لە دنیادا لەزەتخۆر!
قەڵەوکە لەش، بۆ خۆراکی مار و مۆر
نەم زانیوە، بۆچی هاتوومە دنیا
کوا چاکەیەک، لە دوایی ڕوم بکا سوور «67،7»
ئیدی، هۆنەر بە شێوەیە گۆڕاوە، وای لێ هاتووە، جگە لە یەزدانی مەزن، کەسێکی دیکەی شک نەبردووە، تا ڕووی تێکا. بۆیە، لە دوو چوارینەی دیکەشدا گوتوویەتی:
خوایە! ڕوو لە کێ کەم، یا لە کوێ کەم؟
منی بێ دەست، هاوار لە کێ کەم؟
هەموومان، ڕووی سکالامان لە تۆیە
تۆ لە کوێ بی، ئەبێ، من ڕوو لەوێ کەم
بێ پشتیوان و بێ کەس، ڕوو لە کێ کەین
بێ ئاشنا و بێ دەس، ڕوو لە کێ کەین
هەموو بێ ڕووین، ئەوا هاتین بەرەو ڕووت
تۆ بێ ڕووبی، بڵێ: بەس، ڕوو لە کێ کەین «72،7»

* * *

# « مـــــــــــەلا پەرێشان »

## « 1421 - 1356 »

« مەلا پەرێشـان »، بە یەکێ لەو هۆنەرە کوردانە دادەنرێ، کە پتر، لە بواری هـۆنراوەی ئایینیـیـدا ناسـراوە. چونکە، لە لایەکـەوە، گـەلێ هۆنراوەی، لە بابەتە جـیـاوازەکـانی ئاییندا هۆنیـوەتەوە. بۆ نموونە: (باسـی پێـغـەمـبـەر و عـەلی کـوڕی ئەبو طالیب، بەرپەرچدانەوەی سۆفییەکان، دەربارەی خـواناسیی، باسی عەلی و چواردە مەعصووم، چینەکانی ئادەمیزاد، صیفەتەکانی ئادەمیزاد، مـیعراجی پێغـەمبـەر، باسـی خـوای تاک و تەنها، باسی عەلـی کوڕی ئەبو طالیب، وەصیـەتی پێغەمبەر، ذولفەقاری عەلی کوڕی ئەبو طالیب و ... )«256-255،53»
لە لایەکی دیکەشـەوە، هۆنـەر، لە سـەر ڕێوشـوێنی ئایینزای « شـیـعـە » بووە. باوەڕی بە بزووتنەوەی « سـۆفـیـزم » نەبووە و پێی وابووە، گاوور دوو جۆرن:
یەکەمیان: سۆفیی.
دووەمیشیان: لووتبەرزەکان.
بەڵام، ئەوانەی وەک « سـۆفـیی »یەکان، بەرگی خـورییـان پۆشـیـوە، بە سەگ و چوارپێی چواندوون. پێشی وابووە، تاریکەنوێژکردنیش، ماڵی مرۆ خراپ دەکا، وەک « سۆفیی »، کە بە وێنەی سـەگ و کەرن!
بۆیە، « سـۆفـیی »یەکـانی بە گـاوور دانـاوە، گوایە: خـواناس نین و لەو بارەیەوە، لە هۆنراوەیەکدا گوتوویەتی:

وە مەزهەب حەقیر، دوو هۆزن کافر
یەکی سۆفییە، یەکی موتەکەبیر
لێکن، وە مەعنا، صووف پەشم پووشا
کیلاب و سیباع، دەواب و حووشا
تاریک و صەلات، مالی مەردووم خوەر
بە مەعنای سۆفییە، وێنە سەگ و خەر )«257،53»

بە بەرهەمەکانیدا، وا دەردەکەوێ، هۆنەر، لە فەلسەفە و خواناسییدا، بە تەواویی قووڵبووبێتەوە. بیری لە ژیان و سروشتەکەی دەوروبەری خۆی کردبێتەوە. بۆیە، پێی وابووە، کاتێ، یەزدانی مەزن، هەموو شتێکی دروستکردووە و ڕازاندۆتەوە، لە تیشکی پیرۆزی پەیامبەر، « لەوح » و پێنووس، لە تیشکی « حەسەن »، توانا و دەسەڵات، لە تیشکی « فاتیمە »، ئاسمان و زەویی، لە تیشکی « حوسێن »یش، بەهەشتی دروستکردووە. بە تیشکی « فاتیمە » ، جیهانی ڕووناک کردۆتەوە، بە تیشکی داوێنپاکەکانی وێنەی ئەو، حەوت تەبەقەی ئاسمانی ئارایشتکردووە. ئەتڵەس و ئاسمانەکان، خۆر، مانگ و ئەستێرەکان، بە دەوری خۆیاندا دەسووڕێنەوە، هەرچی لەم گەردوونەدا هەیە، هەموویان ڕۆشنکردۆتەوە.
پەروەردگاری جیهان، سێ جۆر مرۆی ئەفراندووە: مرۆ، مرۆی ناتەواو و مرۆی تەواوی پێگەیشتوو. چواردە مرۆ و مرۆی ناتەواو، « ئەبو ذڕ ئەلغەفاریی، میقدادی ئەلکەندیی، عەماری کوڕی یاسر و سەلمانی فارسیی »، لە هەڵە دووربوون. ئیدی، هەموو خەڵکەکانی دیکە، بە شێوەیەکی ڕەها، مرۆی نەزانن، باوەڕیان بە تاک و تەنیایی خوا نییە و نایناسن! بۆیە دەبینین، بە هەشت دێڕ هۆنراوە گوتوویەتی:

چون حەق، ژ ئیجاد ماسیوا پەرداخت
ژ نووری « ئەحمەد »، لەوح و قەڵەم ساخت
عەرش و کورس، هەم ژ نوور « مورتەزا »
ئاسمان و زەمین، ژ نوور « موجتەبا »
ژ نووری « حوسەین » ، بەهەشت کەرد بینا

جیلوەگەر بی نوور، « بەتوول »ی عەزرا
نووری « بەتوول » کەرد، مەشاتە هەر هەفت
ئەتلەس و ئەفلاک، گەردش و زەڕ بەفت
چون کە ڕەوشەن کەرد، کوللی ماسیوا
مولەققەب بی وەو زوهرەیی زەهرا
سێ نەوع بەشەر خەلق کەرد، خودای عالەم
ناس و شویهـ ناس، یەک ناسی ئەفهەم
ناس چاردە مەعسووم، شویهـ ناس بزان
« بووزەر » و « میقداد »، « عەممار » و « سەلمان »
مابەقا مەردووم، موتلەق نەسناسەن
وە ئەحەدییەت، خودا نەشناسەن «257-256،53»

لە هۆنراوەی « ساقینامە »شدا، هۆنەر، وەک خواناسێکی ڕاستەقینە، ڕووی لە یارە خۆشەویستەکەی خۆی « خوا » کردووە و لەگەڵی دواوە. داوای لە مەیگێڕ کردووە، تا، جامێ مەی بۆ بێنێ، بۆ ئەوەی، کەللەی مەستبێ وئاگای لە خۆی نەمێنێ. چونکە، کەڵکی لە سەرخۆشیی وەرگرتووە و بوونی زیانی پێ گەیاندووە! بۆیە ویستوویەتی: بە جامێ مەی، مێشکی خۆی جۆشدا، تا، هەرچی لەم گەردوونەدا هەیە، پشگوێیخا. تەنیا هەر، بە یادی کەسێکی زۆر خۆشەویستەوە، مەی بنۆشێ. چونکە، ژیان ساتێ بێ ئەو، مردنە. بۆیە، گەر کەمێ لەگەڵیدا بێ، خۆی بە گاوور داناوە، گەر، بە دوای بەهەشتدا بگەڕێ!
ئاخر، چ پێویستێکی بە بەهەشتی نەمریی، پەریی جوان و کۆشکە ڕازاوەکانی هەیە؟!! ئەو، بەهەشتی ناوێ و نایپەرستێ، یاری شیرینی خۆی مەبەستە! با، پەریی و بەهەشتی بەرین، تەنیا هەر بۆ « سۆفیی » بێ، خاکی دڵگیر و ڕەنگینی گەڕەکی کۆنیش، بۆ خۆی بێ!
سا، هەر تیرێ، لە پەنجە گەورە ڕێکەکەی یارەوە دەرچێ، ژارەکەی، لە میوەی داری « طووبا »ی بەهەشت خۆشترە! چونکە، بێ زامی تیری برژانگی دولبەر، شوورەییە، پێ لە خاکی ڕۆژی زیندووبوونەوە بنێ! بەڵام، تەنیا داوایەکی لە یارە شیرینەکەی کردبێ، هەر ئەوەبووە، کاتی سەرخۆشدەبێ، ئاگاداریبێ، یاریدەیبدا، نەک هەڵخلیسکێ !

ساقی ! یاوەرۆ، جامێ پەی مەستی
سوودەم مەستییەن، زیان ژ هەستی
جامێ کە مەغزەم، باوەرق وە جۆش
دنیا و ما فیها، بکەم فەرامۆش
تاکە بنۆشم، وە یادی کەسێ
زیندەگی مەرگەن، بێ ئەو نەفەسێ
یەک نەفەس وە ئەو، ئەر ڕووبەڕووبووم
کافرم ئەگەر، جۆیای مینو بووم
چ حاجەت وە خولد، حور و قوصوورەن
بەهەشتپەرست نیم، یارم مەنظوورەن
زاهید! تۆ و حور و بەهەشتی بەرین
من و خاکی کۆی، دڵڕوبای دێرین
هەر تیرێ، ژ شەست ساقی دڵبەرن
زەهرش، ژ میوەی « طووبا » وەشتەرەن
بێ زەخمی خەدەنگ، موژەی دلارام
نەنگەن پا نیان، وە سەحرای قیام
ژ عەینی مەستی، بەڵکم یاریم کەی
نەوا بلەغزم، نیگەهداریم کەی «260-259،53»

* * *

# « مــــــــەلای جزیریی »

## « 1481 - 1407 »

« جزیریی »، بە یەکێ لە هۆنەرە، کلاسیکییە هەرە گەورەکانی کورد دادەنرێ. گەلێ هۆنراوەی ناسک و جوانی، لە بوارەکانی « ئەڤین و دڵداریی، خواپەرستیی و فەلسەفە »دا هۆنیوەتەوە. هەر چەندە، یازدە سەدە لەمەوبەر ژیاوە، بەڵام، هۆنراوەکانی بە شێوەیەبوون، لە سەردەمی خۆیدا، کەم وێنەبوون و تا ئێستەش، لە ڕووی وێژەیی و مێژووییەوە، بایەخی تایبەتیی خۆیان هەر ماوە.
لە چامەی « دەریایەک »دا، بە چواردە دێڕە هۆنراوە، لە گەورەیی و تاکوتەنیایی یەزدان دواوە. جا، با لێرەدا، سەرنجێکی قووڵ بدەین، لەو دوور و گەوهەرانەی، لە نێو قووڵایی زەریای زانین و فەلسەفەی ژیاندا، دەریهێناون، تا بزانین، هۆنەر، بە چ شێوەیەکی بەرز و جوان، ئایین و فەلسەفەی، لە یەکدی مارەکردووە، کاتێ فەرموویەتی:
بەڵگەی زانین و سەلماندی تاکوتەنیایی، بوون و مانی تاهەتایی یەزدانی گەورە، ئەوەتەی هەیە، ڕوون و لە بەر چاوە. خۆی تاکوتەنیایە و ناژمێررێ. لەبەرئەوەی، خوا، هەر بووە. خۆی، ئەم ژیان و جیهانەی دروستکردووە. ئیدی، بە هیچ شێوەیە ناکرێ، لە بواری تاکوتەنیایی خوادا، باسی ڕابردوو، ئێستە و ئاییندەی بکرێ.
زاراوەی « تاک »، تەنیا هەر، بۆ کەسێ بەکاردێنرێ، هیچ کەسێکی دیکە، هاوتای نەبێ و تاقانەبێ! هەروەها، زاراوەی « یەک »یش، بە

کەسێ دەگوترێ، لە دروستبوونیدا، هاوبەشی نەبێ. جا، هەر وایە و لە ڕاستییشدا، « تاک » و « یەک »یش، هەر یەکن و هیچ جۆرە جیاوازییەکیان، لە نێواندا نییە!
پێویستە، باش لەوە بگەن، گەر باسی زەریامان کرد، ئەوا، شەپۆل و بڵقی سەر ئاوەکەش، هەر زەریاکە دەگرێتەوە. سەهۆڵ و ئاویش، هەر لە یەک ڕەگەز پێکهاتوون. بەڵگەی تاکوتەنیایی خوا، وەک تیشکی خۆر دەدرەوشێتەوە، هەموو کونوقوژبنێکی ئەم گەردوونەی پڕکردۆتەوە. بەڵام، ئێمەی چاو پڕوپوشاوی، پەڵەهەورێکی چڵکن، پێش چاوی گرتووین و ناتوانین، ئەو تیشکە ببینین! ئەو جوانییەی، سەرنجی بتپەرستان ڕادەکێشێ و لە بتەکانیاندا دەیانبینن، هەر تیشکی جوانیی خوایە و لە واندا ڕەنگیداوەتەوە. ئای چەن سەیرە! لە پەیکەری بتەکانیشدا، خۆشەویستیی خوا، بە ئاشکرا دیارە!
گەر ڕاستت دەوێ، بیابانیش، هەر زەریایەیەکە بۆ خۆی. بەڵام، گۆڕانکاریی بەسەرداهاتووە. ئاو، بە ئاویی خۆی ماوەتەوە و بیابانیش، وەک کەفێ وایە، زەریا چنیبێتی! خوا، توانای هەموو کارێکی هەیە، مرۆ نابێ، لە سۆزی ئەو بێ هیوابێ. گەر، هەموو ئەو زانیارییانەی، بە « ئادەم »ی داوە، بە « ئەهریمەن »ی بدایە، ئەوا، هەر زۆر زوو، کڕنووشی بۆ دەبرد، با، لە قووڕیش دروستکرابێ! بەڵام ئەو، ئەو نهێنییانەی نەزانی، بۆیە وا تێداچوو!
چ کات، چ شوێن، چ لایەک، چ سنوور، چ ئەندازە، چ درێژەپێدان، چ ژمێرە، چ ژماردن و ژمارە، چ پێچەوانە، چ دژەکان، چ بەراوردکردن، چ نموونەهێنانەوە، چ بەرهەمهێنان، چ لێکدان، چ تێکەڵکردن، چ لەش، چ باسی بوون و چۆنێتی گیان، بە هیچ شێوەیە نابێ، بەرانبەر زانستی خوا، هیچ جۆرە، گریمانێکیان بۆ دانرێ. گەر داشنرێ، هیچ کەڵکێکی نییە. چونکە، هۆشی مرۆ، لە ئاستێکی هێندە بەرزدا نییە، تا، هەر وا بە ئاسانیی، بە ئەنجامێ بگا! تا، بیر لەو جۆرە کارانە بکاتەوە، بەڵکوو، هەر بەرەو لای خۆی دەگەڕێتەوە.
هەر چەندە بتەوێ، لە هەموو نهێنییەکانی، زانستی یەزدان بگەی و بیزانی، هیچی لێ هەڵ ناکڕێنی. چونکە، بە تەماشاکردنێکی ڕواڵەتیی و بە چاوی ئاسایی، گەلێ سەخت و گرانە، پەی بەو ڕاستییانە بەری.

ئاخر، بیر و تێڕوانینی کورتی درووستکراو، چۆن، لەگەڵ بیر و تێڕوانینی درووسکاردا بەراورددەکرێ؟!!
« مەلا » ! هەر چی بکەی، چەن زمان پاراویشبی، بتەوێ، دەربارەی ناسینی خوا، هێندێ زانیاریی بزانی، هیچ داد نادا، چونکە، کەس بە ژیریی خۆی ناتوانێ، گەوهەری خواناسیی دەسکەوێ، مەگەر، خوا خۆی، دەس بە باڵییەوە بگرێ و یارمەتییبدا!

سیرڕی وەحدەت، ژ ئەزەل گرتیە، حەتتا بە ئەبەد
واحید و فەردە بذاتێ خوە، وی نینن چو عەدەد
د قیدەمدا، ئەزەل و عەینی ئەبەد، هەر دوو یەکن
سەرمەدێت وە دخوازت، نە ئەزەل بت، نە ئەبەد
فەرقە واحید ژ ئەحەد، لێ مەقامی صەمەدی
ب حەقیقەت، کو یەکن هەر دوو، چ واحید چ ئەحەد
یەکە دەریا تو بزان، قەنج چ مەوج و چ حوباب
د ئەصلدا، کو حەمی ئاڤە، چ ئاف و چ جەمەد
ئافتابی ئەحەدیەت، د خوەدا گرتییە کەون
نەکوو عەورەک هەیە، لی گرتییە چەهڤێن مە رەمەد
حوسنی ذاتی بت و لاتان، ژ جەمالا صەمەدە
ژ میثالی صەنەمێ، وەهکوو تەجەلایە صەمەد
غەیری دەریا نییە، صەحرا ب حەقیقەت، ئەمما
ژرۆی کەیفە، کو ئەڤ ئاڤە، بوی شوبهی زەبەد
« کول یەوم هوە فی شەئن » نەبی غافل ژێ
هەر پەیاپەی ژ شئونان، دکرت فەیض و مەدەد
گەر د ئادەم بدیا، سیرڕی عیلم ئیبلیسێ
« حینما ابصر کبر حینا و سجد »
چ زەمان و چ مەکان و چ جهات و چ حدود
چ مەقادیر و تەفاصیل و حیسابن، چ عەدەد
چ منافات و لزونم، چ قیاس و چ میثال
ئەڤ چ تەولید و چ تەرکیبە، چ روحن چ جەسەد
سەر ب عیجزێ ددرت، قووەتی دەڕاکەیی مە

« رجع العقل كليلا و متی قام قعده »
حیرەت و عیجزە سەرەنجام، دبابێ نەظەری
« کی بخالق نظر قاصر مخلوق رسد؟ »
گفتوگۆی مەعریفەتێ، چەندی « مەلا » پەیداکی؟
گەوهەرا مەعریفەتێ ناگیهێتێ، کەس ب خیرەد «212-208،58»

لە چامەی « ئیکسیری ئەوین »یشدا، بە دە دێرەهۆنراوە، ستایشێکی بەرز و جوانی، پەیامبەری کردووە، ڕووی دەمی لێ ناوە و گوتوویەتی:
ناوی تۆ، بەر لە هەموو ناوەکانی دیکە، لای خوا نووسراوە، زۆر بە ڕێکوپێکیی، لە سەروو هەموویانەوە دانراوە. یەزدان، ناوی تۆی، لە خاڵی ناوەندی بازنەی بوون و هەموو بوونەوەرەکاندا داناوە، هەموو بوونەوەرەکانی دیکەش، بە دەوری ئەو خاڵەدا دەخولێنەوە. خوای گەورە، پیتی « میم »ی، وەک ئاوێنە لێ کردووە، لە بەر تیشکی خۆری تاکوتەنیایی خۆیدا، تیشکدەداتەوە. تیشکی خوا کە تۆی، لەو ئاوێنەیەوە، لە وولاتی « عەرەب »ەوە، برووسکەی بە ناعەرەبەکان گەیاند و ئەوانیشی گەشاندەوە!
بۆ ئەوەی، هەموو ئەو ناوە زۆرانەی خوا، هەر یەکەیان، جێی خۆیان بگرن و بە هەمووانی بناسێنێ، هێندێ کەس، بە تاووتینی تیشکی ئەڤینی خوا، مەست و سەرخۆشن. هێندێکی دیکەیان، وایان لێهاتووە، لە بەر ئاوێنەکە، چاویان هەڵ نایە، لەبری ئەوەی، خوا ببینن، بتیان دیوە و سەرگەردانبوون. هێندێکی دیکەشیان، دوای خۆشەویستیی زوڵف و خاڵ کەوتوون و گیرۆدەبوون. ئەمەش، هەر ویستی خوا خۆی بووە. چونکە، لە لایە، ئاوێنەی بەشی « ئەسکەندەر » داوە و لە لایەکی دیکەشەوە، جامیشی بۆ « جەمشید » داناوە!
هەموو گیانە پیرۆزەکان، لە « شەوی قەدر »دا، هەر تۆیان مەبەستە و تامەزرۆی بینینی تۆن. ئەو تیشک و ڕووناکییەی، لە چرای « کابە »وە بڵاودەبێتەوە، تیشکی تۆیە. ئەز، دەسم لە ژیانی، ئەم سەر زەوییە بەر داوە، تا، ئەو کاتەی، بە دیدارت شاددەبم، گیان و دڵم، پێشکەش بە تۆ کردووە، بۆئەوەی، تاهەتایە بمێنمەوە و لەنێو نەچم! ئەو ڕوخسارە، لە سپێتییدا، ڕەنگی ئەڵماسی بڕیوە. خوای گەورە، نەخشیکێشاوە،

کارێکی وای، بە سەر خەڵک و جیهان هێناوە، گەواهێرفرۆشان، لە تاواندا، هێندە دەسی خۆیان گوشیوە، ئەڵماس بەو ڕەقییە، لە نێو دەسیاندا شکاوە و وردبووە!
دەی سا خوایە! من چیم و چۆن، ڕێ بە خۆم دەدەم، ستاییشی تۆ بکەم؟!! تۆ، زۆر لەوە بەرزتری، یەکێکی وەک من، باسی گەورەیی و جوانیی تۆ بکا! سوپاسی ئەو خوایە دەکەم، لەبری پول و پارە، ئیکسیری خەمی ئەوینی، بە « مەلا » بەخشیوە!

ئیسمی تەیە، مەکتوب د دیوانی قیدەم دا
حەرف ک قەلەمی عیلم، ب تەقویم رەقەم دا
ئەشکال و خەطێن، دائرەیی نوقطەیی عیلمن
ئەڤ نەقش و میثالێن، د خەیالاتی عەدەم دا
میم مەطلەعی شەمسا ئەحەد، ئایینە صیفەت کر
لامیع ژ عەرەب، بەرق ل فەخخاری عەجەم دا
دا شاهیدی ئەسما، بە هەمی وەجهی بناسین
یەک مەستی صەمەدکر، بە یەکی نەقشی صەنەم دا
یەک گرتیە زولفێ، ئو یەکێ خال نومایی
ئایینە ب « ئەسکەندر »ی و جام ب « جەم » دا
ئەرواحی موقەددەس، شەبی قەدران تە دخوازن
نورا تەیە، میصباح د قیندیلی حەرەم دا
دا وەقتی لیقایێ ب تە، حەی بن د بەقایێ
من نەقدی دل و جان، د فەنایێ ب سەلەم دا
یاقووت فرۆشان، د کەف ئەلماس شکەستن
ئەڤ صەفحەیی ئەلماسی، کو نەققاشی رەقەم دا
یا رەب ! ژ چ روو، لەب ب ثەنایا تە گوشایم
سبحانک لن أحصی فی شأنک حمدا
مینەت ژ خودایی، کو ب عەبدێ خۆ « مەلایێ »
ئیکسیری غەمی عیشق، نە دینار و درەم دا
«11-8،58»

* * *

# « بێســـــــــــارانیی »

## « 1702 - 1641 »

هۆنەرێکی گـــەورەی کـــوردبووە. زۆربەی هۆنراوەکـــانی، بۆ بابەتی خۆشـەویستـیی و فـەلسـەفەی ئایین تەرخـانکردووە. گەلێ لە هۆنەرە ناسـراو و گـەورەکـانی وەک: « صـەیدی هەورامـیی، مـەولەویی، وەلی دێوانە، پیـرەمێرد ... تاد »، کەڵکیان لە بەهرەی دەوڵەمـەندی وێژەیی وەرگـرتووە. (« بێسـارانیی »، لە زۆر شتـیدا، مامـۆستـای گـەلێ لە هۆنەرە بەرزەکانی کوردبووە.)«188،38»

« بێسـارانیی »، لە هۆنراوە ئایینییەکانیدا، زۆر جار، پەنای بۆ بەر، جـوانیی سـروشت و ئەڤین بردووە، بە خـۆشـەویسـتـیی و لێـهاتوویی یەزدانی گەورە، موتوربەیکردوون و تێکەڵاویکردوون. هێندێ هۆنراوەی بە « شیرین » و هێندێکی دیکەشی، بە « مـەولام » یا « میـرزام » دەس پێ کردووە. لە هەمـوو هۆنراوەکانیشیدا، لـە ڕوانگەیەکی فـەلسـەفیی قووڵەوە، لە خواناسیی ڕوانیوە.

لە هـۆنراوەیـەکی ئایینیـیـدا، وەک مـوسـوڵمـانێکی کـورد، دەسـی پـاڕانـەوەی، بۆ دەروازەی بـاڵای پـەروەردگـــار بـەرزکـــردۆتەوە، لێـی پاڕاوەتەوە، تا، لە گوناهەکانی خۆشبێ و بە هەشت دێڕ گوتوویەتی:

ڕاستـە، کـڕنووشـم بـۆ « کڵـیسـا » برد و بووم بە فـەلە. مـەیم، لە پاڵ مـینـبـەری « مـزگـەوت »دا خـواردەوە و ئایینـی « عـیسـا »م نوێکردەوە. فـتــوای خـودای « هـیندیی »یەکـانم « بەرهـەمــەن » لە گــوێ گـرت. ئایینەکەمم، بە ئاییـنی مەیفرۆشـان گـۆڕییـەوە. بەرگی کۆنی گەورەی،

فەلەکانم لە شانکرد و گسکی بتخانەکانم دا. ئەمە، هەمووی، کاری سەردەمی نەزانیی، کاتی سەرمەستیی و وەرزی لاوێتیم بوو. ئێستە، لە هەموو ئەوانە پەشیمانم. وەرزی پیریمە و تافی لاوێتیم بەسەر بردووە. سەردەمی پیریمە و سەرەی مردنم هاتووە. کاتی تۆبە و پەشیمانیشمە، خوایە! تۆبە و پەشیمانم. هیوام بە تۆیە، کە لێم ببوری و واز لەو تاوانانەم بێنی، کە لە سەردەمی نەزانیدا کردوومن.

تەرسا بەردەنم، .....

ڕاسەن سوجدەی دەیر، تەرسا بەردەنەم
مەی نە پای مینبەر، مەسجد وەردەنم
تەجدیدی مەزهەب، « عیسا » کەردەنم
فتوای « بەرهمەن »، گێرتەنم نە گۆش
دینم دان، جە لای دینی مەی فرۆش
کەردەنم نە دۆش، خەرقەی ڕەهبانان
کێشانم جاڕووی، دەوری بتخانان
ئانە گشت جە وەخت، نادانیم بیەن
فەصڵی سەرمەستیی و جەوانیم بیەن
ئیسە ها جە گشت، پەشیمانیم بەرد
فەصڵی پیریمەن، جەوانیم ویەرد
وادەی پیریمەن، یاوانم نۆبە
نۆبەی تۆبەمەن، کەرەمدار! تۆبە
ئومێدم بە تۆن، وەنەم نەگیری
بویەری جە جورم، وادەی کەم ویری «94،9»

« بێسارانیی »، لە هۆنراوەیەکی دیکەی حەوت دێڕییدا، باسی یارە شیرینەکەی کردووە. پاشان، لە کۆتاییشدا، خۆی بە خۆشەویستیی پەروەردگارەوە بەستۆتەوە و گوتوویەتی:

شیرین! جوانان مەرجیان هەیە، بەڵام، شەرمیان نییە. بۆچی دەڵێن: خۆ داپۆشین چاک نییە؟!! کێ لە خۆر جوانتری دیوە؟ ئەدی، بۆ خۆر، ڕووی خۆی دا نەپۆشیوە؟ گەر، ڕووپۆشین، بۆ جوانان چاکبووایە، ئەوا، کەس تیشکی خۆر و تریفەی مانگی نەدەدی!

کەسێکی وەک تۆ، ڕوخساری وەک مۆم داگیرسابێ، پێویستە، پەپوولەکان بێن و تەماشایکەن. ئێمەش، ئەو پەپوولانەین، کە مۆم دەناسن و بە دەوریا دەسووڕێنەوە. چونکە، شەیدای ئەو ڕووناکییەن. پەڕ و باڵ کونکونکراوی ئایینی پیاوچاکانین. چۆن پەپوولەکان، لە تاو خۆشەویستییەکەیان، ئاگایان لە خۆیان نامێنێ، هێندە، بە دەوری مۆمەکەدا دەخولێنەوە، لە پێشدا، بە هۆی گەرمایی ئاگرەکەوە، وردە وردە، باڵەکانیان و پاشان، خۆشیان دەسووتێن. ئێمەش، بەرانبەر بە تیشکی ڕاستەقینەی خواناسیی، هەر بەو شێوەیە، سەرەتا، بە دەوریدا دەسووڕێینەوە. پاشان، بێ ئەوەی هۆشمان بمێنێ، دەکەوینە ناوییەوە و دەسووتێین. ئەمەش، بۆیە وایە، چونکە، گەلی ئەو پەیامبەرانەین، کە ئایینێکی پاک و بێ گەردیان هەیە، ڕێی ڕزگاربوونمان، بۆ ڕووناکدەکەنەوە. نەک لە دەستەی نەزانەکان بین، کە هیچ جۆرە وردبوونەوە و تێبینییەکیان نییە. کەواتە، ڕوخسارت بنوێنە، ئەوە ڕۆشنایی پاکیتە، پاکێتیی تۆ نیشاندەدا. گەر تۆ پاکیی، لە کێ پاکت هەیە؟

شیرین شەرم نییەن، .....

شیرین پەی خاسان، شەرط هەن، شەرم نییەن
پەی چێش مەواچان، حیجاب خاس نییەن
جە ئافتاو خاس تەر، کەسێ کێ دیەن؟
ئەگەر پەی خاسان، حیجاب خاس مەدی
ئافتاب و مەهتاب، هیچ کەس نمەدی
کەسێ وێنەی تۆ، شەم بۆ جەمینش
لازم پەروانان، مەیان وە دینش
ئێمەیچ، پەروانەی شەم شوناسانیم
پەڕوباڵ سفتەی، دینی خاسانیم
میللەتی پاک دین، پێغەمبەرانیم
نەک جە طایفەی کەم نەظەرانیم
بنمانە جەمین، نووری پاکتەن
ئەر تۆ پاکەنی، جە کێ پاکتەن؟ «9،365-366»

* * *

## « خـــــــــــانیی »

« 1706 -1650 »

له شاکاره شیرینەکەی داستانی « مەم و زین »دا، کە بە « ڕۆمیۆ و جولێت »ی کوردیی ناویدەرکردووە! « خانیی »، دەسی پاڕانەوەی، بۆ ئاسمان بڵندکردۆتەوە، ڕووی دەمی، لە پەروەردگاری مەزن کردووە، داوای پەسەندیی بەرهەمەکەی لێ کردووە، بە پەنجاوحەوت دێڕە هۆنراوە و لە سەرەتادا گوتوویەتی:

ئەی هێنەری، هەر دوو عاسمانان!
ئەی دووری، هەموو هەڵە و گومانان!
بێ ڕۆڵە و داک و باب و کاکی
بێ هاوبەش و تاک و پاک و چاکی
نیتن، چە وەزیر و باری کارێک
لات وەک یەکە، پادشا و هەژارێک
هەر بووی و دەبیت و پایەداری
چوونت نییە، تاهەتا لە کاری

پاشان گوتوویەتی:

چی زیندووە لاشە، تۆی گیانی
تۆ ژانی نەمان، دەردی ژیانی
تۆی خشڵی، لە ڕەنگی خۆشەویستان
تۆی کینە، لە ناو دڵی نەویستان
« شیرن »، دەکەیە شەکر لە « پەروێز »
« فەرهاد »ی، لە ژین وەریز و پربیز
« یوسف »، دەبەیە پەنای « زلەیخا »
تا، دەست و دڵی، بدا بە تیخا

« مەجروون » و « لەیل »، دەکەیتە ناکام
« ڕامین » و « وەیس »، لە یەک دەکەی ڕام
دات « وامق »ی شەنگ، نیشانی « عەذرا »
لە سوێی دڵی، خەو لە چاوی دەزڕا
« پیر »ی لە جیهان، بە دووری چاژان
بۆ کیژێ، دەنێریە بەر بەرازان
لوولووپەری، خۆشەویستی نازدار
وات کرد، کە لە ڕۆژ ببێتە کڕیار
تۆ دات بە چنار، بڵندی بالاّ
تاقتاقکەرە، وا لە دەورەی هالاّ
دەڕوێنی لە ناو درود، گوڵی ئاڵ
بۆی شێت دەبێ، بولبولی ژیان تاڵ
ڕەنگان دەخەیە، گیا و گلووکان
چووکان دەخەیە، جرووک و نووکان

ئیدی، هەر بەو شێوەیە، بە باسکردن و پێداهەڵدانی یەزدانی مەزن، پێیدا هاتووە و بەردەوامبووە، تا، لە کۆتاییشدا، سەرسوڕمانی خۆی، لە کاری یەزدان پیشانداوە، بەندەیی و دڵسۆزیی خۆی پیشانداوە و گوتوویەتی:

دەر ناچێ سەرم، لە کاروبارت
کێی وابووە، بووبێ ئاگەدارت؟
خواناسی مەزن، گوتی: بە ڕاسیی
تۆمان، وەکوو تۆ هەبووی، نەناسی
« خانیی » دەبێ، چی لە تۆ بویژی
گێژێکە، سەری دەخاتە گێژی
لەو بارە، خەریکبی بە هەر جۆر
ڕێگەی هەڵەیە و لە تۆی دەکا دوور
جا، یاریدەری مەگین خودابێ
پێغەمبەری سایەدا و پەنابێ
تۆ خوایەکی گەورە و گرانی
پێغەمبەری ئاشناکە « خانیی » «7-5،24»

« خانیی »، له هۆنراوەیەکی دیکەدا، پێشەکیی، ستایشێکی گەلێ جوان و ناسکی، یەزدانی مەزنی کردووە. پاشان، باسی گەورەیی پەیامبەری ئیسلامی کردووە و بە شەستوچوار دێڕە هۆنراوە، لە سەرەتادا گوتوویەتی:

ڕوونبۆتەوە، هەر چی هەس دوو لایە
یان هەر هەیە، یان لە هاتنایە
ئەویانە: کە هەر هەیە، خودایە
چی دێت و دەچێ، لە دەست ئەوایە

پاشان، لە سەر پێداهەڵدانی خۆی، بەردەوامبووە و گوتوویەتی:

چی جوان و بە نرخی ئەم جیهانەن
لە جوانی خودای مەزن، نیشانەن

دواییش، لە باس و ستاییشی پەیامبەردا گوتوویەتی:

ئەو، تیشکی خودایە بۆ هەمیشە
بۆ هەر شتێ، بۆتە پنج و ڕیشە
گیانان، لە گیانی ئەو پەیابوون
چەند تیرە و هۆز، لە یەک جیابوون
هی بەختەوەر و بەرەی بەخترەش
چی ماون و هەر چی، چوونە ناو لەش
سەرپاکی، لە تیشکی ڕوونی ئەو بوون
گش هاتن و بوون، لە بوونی ئەو بوون
هێشتا، نە زەوی، نە عاسمان بوو
ئەو سەروەری، هۆزی سەروەران بوو
عاسمان و زەوی، لە بەر ئەوی بوون
بۆ وی بوو، فرشتە سەر نەوی بوون
پێغەمبەرێ بوو، لە لای خودا ئەم
پێ خوییەکی قوور بوو، باوە « ئادەم »

دواترشیش گوتوویەتی:

« هێرقل »، نەگەیی بە تۆز و گەردی
« قەیسەر »، سەری خۆی دەدا لە بەردی
« قبتیی و حەبەش و فەرەنگ و ڕۆمان »

دایانە ڕچەی، قەراچ و دۆمان
ئالای دەسی ئەو، شەکا لە بالا
« کیسرا »، سەر و لاشی، کەوتە چالا
چی دین و گەلن، لەناویبردن
یان، تەرت و تونا و بلاویکردن
ئاوورگی مراند و گاووری کوشت
جێگا بتی کش، بە ئاگری شووشت
« تەورات و زەبوور »، نەمان لە نێوان
« ئینجیل »، پەڕییە شکەوت و کێوان
« عیسا » گوتبووی: کە مابوو هێنگێن
پێغەمبەرێ دێ، لە ئێوە مزگێن

پاشـان، بە درێژیی، باسی ژیانی پەیامـبـەر و تێکۆشـانی، لە پێناوی سەرخستنی ئایینی خودا کردووە، لە کۆتاییشدا گوتوویەتی:

ئەی شای مەزنی بلندپایە!
عاسمان و زەویت، لە بەر دەسایە
چۆن ڕێم دەکەوێ، بدەم پەسەندت
خوای گەورە دەدات، پەسەندی ڕندت

لە دوا دێڕەکانی هۆنراوەکەشیدا، هانای بۆ پەیامبەر بردووە و دانی بە گوناهباریی خۆیدا ناوە، داوای لێخۆشبوونی کردووە و گوتویەتی:

« خانیی »، کە گەلێ گوناهکارە
ناپاکە، نەزانە، نالەبارە
هیوای هەیە پێت، کە لێی ببووری
لەو ڕۆژی ژمارە، نەگری دووری
ناتوانێ، لە ڕێوە سەربەخۆبێ
با، پەیرەوی یارەکانی تۆ بێ «10-7،24»

لە هۆنراوەیەکی دیکەشدا، دیسانەوە، ڕووی لە مـەزارگەکەی پەیامبەر کـردووە، لێی پاڕاوەتەوە، تا، لای یەزدانـی مـەزن، تکای بۆ بکا، لە هەڵەکانـی ببورێ، لە گوناهەکانی خۆشبێ و بە بیستوهەشت دێڕە هۆنراوە گوتوویەتی:

ئەی بوونەیی، بوونی دوو جیهانان
میوانی خودا، لە عاسمانان !
شابازیی و پاتەخت « مەدینە »
شانازیی بە تۆیە، ئەم زەمینە
لە وزەی هەموو کەس، بە دوورە کردەت
قامک دەنوێنی، مانگ دەبێ لەت
ئامادەکراوە، ئەسپی باڵدار
داخوازە بە دڵ، کە تۆی ببی سوار
تیژتر، لە برووسکەیەک بە ڕەوتە
سەرداری فرشتە، پێش جڵەوتە
نۆ بەرزیی و هەر چی وا لەوێیە
پێشوازن و گشتی چاوەڕێیە
جێبێڵە، بڵندی عاسمانی
نێزیکی خودا، بە ژیکەوانی
بەو جێ کە دەچی، کەس نەگەیوە
بێ پەردە، لەگەڵ خودا بپەیوە
بخوازە نیاز، ڕەوا دەبن بۆت
بیدوێنە گەلێ، لە مەڕ گەلی خۆت
دەسکاری ئەوین، لە خاک و خۆڵین
گەر بەختەوەرین و گەر کڵۆڵین
نیازی ئەوە، گەر هەبین و گەر بووین
ڕێمان کە نیشان نەدا، لەدەستچووین
هێزی ئەوە، هێز و پێزی پێ داین
هەر خۆی لە بەرێوە، ڕێزی لێ نانین
ئەو، بەو پلە بەرزییەی گەیاندین
خۆی، ڕازی گرینگی تێگەیاندین
دەیزانی، زەبوون و ناتەوانین
ئەم ڕازە گرانە، ناتوانین
بۆ کردەوەمان، لە ڕۆژی پێشا
هەر خۆیەتی، ڕێوشوێنی کێشا

دەسکردی ئەون، بە دین و گاوور
لای، چەشنی یەکن، بەهەشت و ئاوور
هەر چەن، بە ڕواڵە لێک جیایە
هەر یەک، ڕەوشێکی وی تیایە
سوچمانە، لە بەخشش و بزی ئەو
بێ باوەڕیی، تاوی تووڕەیی ئەو
ئاوورگ و بەهەشت، لە مێژە چێ بوون
هەر شت، بەری ئێمە، جێبەجێبوون
هەوری بەزەیی، کە بێتە ڕێژن
بۆ یار و نەیار، دەبێتە جێژن
گەر، تووڕەیی بێتە ڕوو، بە یەکدەم
گڕدەگرێ بەهەشت، وەکوو جەحەندەم
گەر، گاوور و گەر، گوناهبارین
گشتمان لە بەزەیی، هومێدەوارین
دەریای بەزەیی، دەبا بجۆشێ
چەوتیی و هەڵەی، مە دابپۆشێ
تۆ شوانی و ئێمە، پەز لە پەیتان
وەک گورگە، ددانی چیرە، شەیتان
ڕێگەی مەدە، کیس لە ئێمە بێنێ
هەر دەرفەتیبێ، دەمانڕفێنێ
کارێ مەکە، ئەو بە ئێمە خۆشبێ
گوڕی ئەوە، بێ بەش و پەرۆش بێ
هەر خۆی، بکرێتە دەستەچیلە
لەو ئاگری، پڕ پەڕەنگ و ژیلە
ڕزگاریبێ، بەرەی گوناهبار
بۆیان لە خودا، ببە تکاکار «12-10،24»

* * *

# « صەیدی هەورامیی »

## « 1848 - 1784 »

یەکێ لەو هۆنەرە کوردە، بلیمەت و هەست ناسکانەی، نێوچە جوانە دڵگیرەکەی « هەرامان » بووە. گەلێ هۆنراوەی تەڕ و پاراوی، دەربارەی « دڵداریی، جوانیی سرووشت و ئایین » هۆنیوەتەوە.
لە هۆنراوەی « شەرابو عەشقو تۆ »دا، بە سی دانە دێرە هۆنراوە، دەسی بۆ ئاسمان بەرزکردۆتەوە، ڕووی دەمی نزا و پاڕانەوەی، لە یەزدانی مەزن کردووە و لە سەرەتادا گوتوویەتی:
شەرابی ئەڤینی تۆ، ڕوون و ڕەوانە، بە ئاسانیی، بە گەرووودا دەڕوا، بە تام و تاڵیشە. تۆ، بێ منەت، ئەو شەرابە بە کەسێ دەدەی، کە دڵنەوایی بکەی. ئەو کەسەش، پێویستی بە داواکردنی ئەو شەرابە نییە. لەبەرئەوە، منەتی تێدا نییە! چونکە، خۆت ئارەزووتکردووە، بیدەیتێ! هەر کەسێ بیخواتەوە، تاهەتایە، مەستدەبێ. چونکە، مەیگێڕ خوای گەورەیە. ئەوەی دەشیخواتەوە، بە ڕوواڵەت سەرخۆشە و شێت دیارە. کەچیی، لە دڵدا، ژیر و تەواوە. نە بیری لە لای موڵک و ماڵ دەمێنێ، نە باکیشی لە ژن، مناڵ و خێزان هەیە. بەندەیەکیش نییە، تا، خۆی بە لووتبەرز بزانێ و فیزی هەبێ، ڕیاکاریش نییە، چونکە، هیچ مەبەستێکی، ماڵ و گەنجی ژیانی نییە. بە تەنیا هەر، ئەو پیری دەسگێڕە، لەبەرئەوە، دەسیبگرە. ئەوە نییە، تەمەنی درێژبێ، بەڵام، بە ڕاستیی گەورەیە.
داخەکەم! لەم ژیانەدا، پارچەیە زەویمان بۆ ڕۆژی زیندووبوونەوە و هەڵسانەوەمان نەچاند، چاکەیەکمان نەکرد، بۆ ئەم کۆچە بێ کۆتایی و ڕێ دوورە، کەرەسەیەکمان نەخست، تا بە کەڵکمان بێ! یاران! با، دەس لەم ژیانە بەردەین، پێی شاد نەبین. چونکە، شادییەکی پووچە!

گەر، سەد ساڵ لەم ژیانەدا، بە دڵخۆشیی بژین، تا سەر، مانمان مەحاڵە! هەزار جامی شەربەتیش بنۆشین، لە کۆتاییدا، هەر بە ژاری مەرگ دەمرین!

شەرابوو عەشقو تۆ، سافوو زەلاڵ
بە لەزەت وەش بنوشای، توند و تاڵ
مەدینەش، پەی کەسێ تۆ دڵ نەوازی
بەبێ مینەت، چە موحتاجی سواڵ
مە بۆ مەستی ئەبەد، هەر کەس مەنۆ شۆش
کە ساقیی پادشاهی « ذو ئەلجەلالا »
کەسێوەن، ئاکەسە، لێوەن بە زاهیر
بە باطن، عاقڵ و ساحێب کەماڵ
نە فکرش هەن، جەلا و موڵکی، نە ماڵی
نەهۆ باکش، چە فورزەندە و عەیاڵ
نەهۆ موعجب، نەهۆ، بەندەی ریاکار
نەمەقسوودش، بە دونیاد و گەنج و ماڵ
بە تاقی ئانە پیرەن، گێرە دەستش
نەهۆ پیریی و پەردەی ماهو ساڵ
درێغ، چی گشتوو دونیای، ئێمە هەرگیز
« شکارتێو » پەی قیامەتمان، نە کاڵ
دە یاران! وەر بدەیمێ، دەس چە دونیای
نەبیمی، شاد پەنەش، شادیش بەتاڵ
ئەگەر، سەدساڵ، چەنەش مەنمێ، بە دڵشاد
چەنەش تا سەر، مەنەیمان پەی مەحاڵ
هەزار جامێ، چە شەربەت، ئەر بنۆشمێ
چە ئاخر، ژاروو، مەرگیمان قەتاڵ

پاشان، هۆنەر، داوای لە خوا کردووە، لێی ببورێ و لە دێڕی « 23 »دا گوتوویەتی: ئەی خوای بەخشندە! ئەی لە گوناه و تاوان خۆشبوو! ئەی بە بەزەیی و دڵسۆز! ئەی بێ هاوبەش و نەمر! لێت دەپاڕێمەوە، بە بەخشندەیی و بەزەیی تۆ، هیوامان زۆرە، بە ژێر باری، تووڕەیی تۆوە

نەبین. دڵمان، بووە بە کۆی زوخاڵ. خوایە! هیوامان وایە، لە ئاگری دۆزەخ بمانپارێزی. ئێمە، « بەهەشت و پەریی »مان ناوێ، بماندەیتێ. خوایە! تۆبەی ڕاستیی و دڵسۆزییمان، لێ پەسەندکەی. ئەوانەی، تۆ لێیان خۆشدەبی، با، چی دیکە، لە تاو گوناهـ و تاوان نەناڵێنن. چونکە، دوای ئەوەی، خۆت لێیان خۆشدەبی، ئیدی، بۆچی بناڵێنن؟!!

کەریما! غافر ئەلذەنبا ڕەئووفا!
ڕەحیما! بی شەریکا! بێ زەوڵا!
بە لوطفی تۆ، قەوی ئومێدمانەن
نە بیمی قەهر و تۆ، دڵمان زوخاڵا
ئومێدمان هەن، پەنامان دەی، جە دۆزەخ
نەک ئێمە، حۆروو جەنەتمان، خەیاڵا
ئیلاهی! تۆبەی ئیخلاصمان، قبووڵکەی
« قبوڵ تۆبان » جە، عوصیان، چی بناڵا
لە دوو دێڕی کۆتاییشدا گوتوویەتی: ئەی « موحەممەد » ! مەگەر هەر تۆ، تکاکارمان بی، ئەگینا، لە ڕۆژی لێپرسینەوەدا، ڕزگارمان نابێ. خوایە! فریایمکەوی، لە کاتێکدا، لە نێو گۆڕدا، جێ چاڵ و تاریکە:

مەگەر، تۆ بی تکاکار، یا « موحەممەد » !
وەگەرنا، ڕوستگاریمان، مەحاڵا
خوداوەندا! بە فەریاو « صبەیدیی » یاوێ
جە وەختێو نە، کە لە مەنزڵ تیرە چاڵا «156-151،35»

لە هۆنراوەیەکی دیکەشدا، بە پێداهەڵدان، باسکردنی دەسەڵات و خەسڵەتە چاکەکانی خوا، دەسپێکردووە، هۆنراوەکەی درێژکردۆتەوە و لە سەرەتادا گوتوویەتی:
یا حەیی بێچوون! یا حەیی بێچوون!
یا حەیی بێ میثل، بێ هەمتای بێچوون
یا فەرمان فەرمای، ئەمری « کاف و نون »
کەریمی کارساز، بە « کون فەیەکون »

پاشان، بایداوەتەوە، خۆی و گشت کۆمەڵی مرۆی، بە گوناهبار داناوە. هیوایەکی زۆریشی، بە بەخشەندەیی و میهرەبانیی خوا هەبووە، تا، لە سیوسێیەمین دێڕدا گوتوویەتی:

بە خراپە دەدوێین، کرداری خراپە دەکەین، لایەقی سزا و ئازاری ئاگری دۆزەخین. لە هەزار کەسدا، یەکێکی چاک نییە، لەگەڵ چاکەکارانیشدا، دراوسێ بێ! گەر، بە کرداری خراپەی خۆمان لەگەڵ بکەی، ئەوا، کەسمان، بە پاکیی و بێ مەلامەت دەرناچین.

بەڵێ، تۆ بەخشندەی، هەر تۆش، لە گوناهەکانمان خۆشدەبی. چونکە، تۆ، ئەو ڕۆژە، لە ئێمە بووردی، کە فەرمووت: « لە سۆزی خوا، بێ هیوا مەبن. خوا، لە هەموو گوناهەکان خۆشدەبێ !»

تۆ لێمان دەبووریی، بەخشندەیەکی بێ باک و دڵ نالەخشێنی! هەر چەندە، گوناهمان زۆربێ، تیغی لێبووردنی تۆ، تیژترە!

بەد واچوو، بەد گۆ، بەد کردارێنمێ
لایق بە عەذاب، دەرگەی نارەنمێ
جە هەزاراندا، یەکێ خاس نیەن
چەنی خاسانمان، هامسایی نیەن
ئەر بە بەدکاری، بگێری پێمان
قەت بەرنمە شۆ، دەیاری لێمان
بەڵێ، تۆ کەریم، کەرەم داردنی
« ستار ئەلعیوب »، هەم « غەفارەنی »
ئەورۆ، عەفوت کەرد، پێمان بە خەڵات
« قول یا عیبادی، لا تەقنیطوا »ت وات
تۆ خەتا ئامورز، گوناە بەخشەنی
بەخشندەی بێ باک، دڵ نەلەخشەنی
هەر چەند گوناهکار، گوناش فێشتەرەن
تێغی عەفوی تۆ، بە ڕاو تێژتەرەن

«224-217،35»

* * *

# « ڕەنجووریـــــــــــــــــی »

## « 1810 -1750 »

بە داخەوە، « ڕەنجووریی »، یەکێ لەو هۆنەرە گەورانەی کوردبووە، کە تا ئێستەش، زۆر کەس هەن، نایناسن و ئاشنای بەرهەمەکانی نین! سا مەگەر، هەر زێڕینگەرێکی بلیمەتی وەک « پیرەمێرد »، بایەخی ئەو هۆنراوە بەرزانەی زانیبێ. چونکە، وەک گوتوویانە: نرخی زێڕ، هەر لای زێڕینگەرە!

بۆیە، کاتێ « پیرەمێرد »ی نەمر، لە شاری « ئەستەمبوڵ » ژیاوە، هێندێ لە هۆنراوەکانی، لە کوردییەوە، بۆ سەر زمانی « تووركیی » وەرگێڕاوە!

« ڕەنجووریی »، هاوسەردەمی « وەلی دێوانە » بووە، دۆستایەتییان خۆشبووە و هێندێ هۆنراوەیان، بە شێوەی نامە گۆڕیوەتەوە. بە هەر دوو دیالێکتی « گۆران » و « کرمانجیی »، گەلێ هۆنراوەی جوانی، لە بواری « دڵداریی و ئایین »دا هۆنیوەتەوە.

لە چامەی « میعراجنامە » و بە « 236 » دێڕ، هەموو سات و کات، هەموو ڕۆژ و بۆنە پیرۆزەکانی، ئایینی ئیسلامی بەسەرکردۆتەوە. پاشان، بە چەن دێڕەهۆنراوەیە، بە سەر پەیامبەردا هەڵیداوە و گوتوویەتی:

بەعزێ ڕاوییان، صاحب ئیعتیبار
بەو طەور ڕەقەم دا، نە حەرف ئەخبار:
وەرتەر جە ڕەسوول، ڕەهنومای ئوممەت
پەی گوناهکاران، شافی شەفاعەت
کەس نەبیەن، سوار بەو ئەسپ و زینە
غەیر جە « ختم الرسل »، مەکام « مەدینە »
ڕاویی، نەی جادا کەردەن ئیشتیبا:
هەردوو سواربین، یا « ئەحمەد » تەنها؟
بوراق وێنەی بەرق، جونبوشدا ئەوسا
قەدەم دا نە پای، « مسجد الاقصی »
جە قاپی « ئەقصا »، سەیید بی پیا
جە و حەلقە و جەو مێخ، جەی وەر ئەنبیا
بوراق مبەستن، هەم بوراق بەستن
« اخی » بەست، یا ئەو جە بەستن، ڕەستن
جەو دەمدا، بە ئەمر قەییوم قادر
ئەنبیا و ڕوسول، یەکسەر بین حازر
صەف بەستن، تەمام بێ ناز و نیاز
« خیر البشر » بی، وە پێشەوای نوماز
پێشەوایش، کەرد دوو ڕەکعەت تەمام
دۆعاوازان، گشت جە دانای عەللام
پەی صەلای « ئەحمەد »، بەحر نوور جۆشا
هەر کەس، خەلاتی نوورانی پۆشا
هیممەت وازیش کەرد، ڕەسوول بەرهەق
ڕوو نیا، نە ڕا ڕای چەرخ موطلەق «44-43،28»

دوایی، ڕووی دەمی لە پەیامبەر کردووە و گوتوویەتی:
یا ڕەسوولەڵڵا! بێ دەسەلاتم
سەرتاپای ئەندام، عیصیان خەلاتم
خاصیم هەر نییەن، هەر بەدی دارام
جە خۆف ڕۆی حەشر، وە بێ مدارام

تۆ دارای دەوڵەت، من چە دەوڵەت دوور
من کۆرِ ظوڵمات، تۆ سەرمایەی نوور
چونکە، وێم دەخیل میعرا ج تۆ کەرد
پەنای بێ کەسیم، وە لای تۆ ئاوەرد
چە لای خوداوەند، مەقبووڵەن کارت
لوطف حەق دایم، هەر ها نە بارت
ئەی مەطلەبانە، عەرض کەردم یەکسەر
طەڵەب کەر چە حەق، پەرێ سایەی سەر
حەق ڕەواش کەرۆ، پەرێ ڕەضای تو
ئەرجووم هەن وە تو، چون تووی جای ئەرجو
ئامین، هەر کەسێ بواچۆ: ئامین
گوناش ببەخشۆ « رب العالمین »
هەر کەس حاضرەن، چە یاران دین
پەرێ قەبووڵش، بواچان: ئامین
ئەو سەنەی میعرا ج، نەظمش وە کۆ بی
تەئریخش هەزار دوو صەد نۆ بی «52-51،28»

لە کۆتاییشدا، داوای لێ کردووە، بیبەخشێ و گوتوویەتی:
یا شاە شاهان! یا غەفوور ئیم شەو
یا « ستار العیب !»، یا صەبوور ئیم شەو
باجەتی ڕەسوول، مایەی نوور ئیم شەو
ببەخش « ڕەنجووریی »، دڵ ڕەنجوور ئیم شەو
دڵ وە فەیض توو، مەعمورەن ئیم شەو
« ڕەنجووریی »م، جەستەم ڕەنجوورەن ئیم شەو «55-39،28»

* * *

# « عەلی بەردەشـــــــــــانیی »

# « 1813 - 1771 »

هۆنەرێکی میللیی وەک « عەلی بەردەشانیی »ش، لە ستایشی پەروەردگاردا گوتوویەتی :

خالق، هەر تۆی بێ فکر
ئەمر تۆی و تۆی ئەمر
تۆی ئەرز و ئاسمان ڕاگر
داتنا بەهەشت و ئاگر
چەند باران و چەند بەفر
چەند ئەهەنگ و چەند بەحر
چەند تیپ و سوپا و لەشکر
داتنا، هەشتا هەزار عالەم
بەڵکوو، شتێک زیاتر «10،39»

دوای ئەوەی، هۆنەر، ستایشێکی یەزدانی گەورەی کردووە، لە کۆتاییدا، بە دێرە هۆنراوەیەکی میللیی، داوای لە یەزدان کردووە، زمانێکی پاراو و ڕەوانی بداتێ:

ئەزم، « عەلی بەردەشانیی »
لەنگم نەکـــــــەی زمانی «73،42»

* * *

# « نـــــــــــالیی »

## « 1855 - 1797 »

هەڵبەتە، « نالیی » هۆنەر، وەک مەلایەکی موسوڵمان و خواناسێکی ڕاستەقینە، هێندێ هۆنراوەی ئایینیی، لە شێوەی پاڕانەوە و ستاییشکردنی پەیامبەری ئیسلامدا گوتووە. بۆیە دەبینین، چامەیەکی شەستوهەشت دێڕیی، بە سەر پەیامبەردا هەڵداوە، ستاییشێکی زۆری کردووە و لێی پاڕاوەتەوە، تا، لە ڕۆژی لێپرسینەوەدا، لای یەزدانی گەورە، تکای بۆ بکا و لە گوناهەکانی خۆشبێ. لە سەرەتادا گوتوویەتی:

ئەی دانیشتووی، نێو گوڵزاری « مەدینە »ی ڕووناک ! بەزەییەکت بە مندا بێتەوە و بفەرموو: ئەم شارە، شاری منە و وەرە. تەختی پانوبەرینی یەزدان، کە بازنەیەکی گەورەیە، هەموو جیهانی لە ئامێزی خۆی گرتووە، مەزارگەی پەیامبەریش، ناوەندەکەیەتی. ڕووی زەوی، وەک فەرشێ وایە و ڕاخراوە، بە گۆڕەپانی « مەدینە »ی گەوهەردار ڕازاوەتەوە. ئەو شاری « مەدینە »یەی، کە بە شەو و ڕۆژ، بۆنی خۆشی بە جیهاندا بڵاودەکاتەوە. بە ڕۆژ: وەک کافوور، وشک و سپی، بە شەو: وەک عەنبەر، شێدار و ڕەشە! لە تاو خەمی، نەبینینی ڕۆژی وەک کافووری وشک و ڕۆشنی « مەدینە »دا، لێوم وشکبووە. لە داخی هەڵنەمژینی، شەونمی شەوی وەک عەنبەری ڕەش و تەڕیشدا، چاوم پڕ بووە لە فرمێسک و هەمیشە، هەر دەگریم.

ئەو شـــارەی، تـەنانـەت، نـاوەکـەشـی وا دەگـــەیەنێ، بـە هـەنـاســـەیـەکی پیرۆزی « جوبریل »، یا، لە سـایەی فەڕی پەیامبـەرەوە خـاوێنە، دەڵێن: جیاوازیی، لەگەڵ شوێنەکانی دیکەدا ئەوەیە: گڵی لە گوڵ و ئاوەکەشی لە ئاوی، حـــەوزی « کـەوســـەر » دەچێ! جـا، شـارێ بەو شـێـوەیەبێ، هەڵبـەتـە، گـوڵاوەکـــەی پیـرۆزە و گـڵاویی گـیـانـی گـونـاهـبـارانـی پێ دەردەکرێ. بۆیـە، لەو خـاکە چاکە پاکەدا و بەو ئـاوە خـاوێنە، گـیـانی گوناهبارانی لێ خاوێندەکرێتەوە!

ئەی ساکینی ڕیاضی، « مەدینە »ی مونەووەرە!
لوطفێ بکە، بفەرموو: مەدینەی منە و وەرە
عەرشی بەرین کە دائیرەیە، ڕەوضە مەرکەزە
فەرشی زەمین، بە عەرصەی طەیبە، موجەوهەرە
پاشان، باسێکی جوانی، شاری « مەدینە »ی کردووە و گوتوویەتی:
طەیبە کە یەعنی، عەکسی بەقیعی، هەموو عەبیر
طەیبە کە یەعنی، مایەی ئەو، میشکی ئەذفەرە
طەیبە کە یەعنی، ڕۆژ و شەوی، طیبی عالەمە
ڕۆژی کە وشکە، شەو تەڕە، کافوور و عەنبەرە
لێوم، لە ڕۆژی ڕۆشنی، کافووری وشکی، وشک
چاوم، لە شەبنمی شەوی، وەک عەنبەری تەڕە
طەیبە کە یەعنی، طەییب و طاهیر، بە ڕەوحی ڕۆح
فەرقی ئەڵێن: گڵی لە گوڵ، ئاوی لە کەوثەرە
یەعنی، گوڵاوی قودسە، گڵاویی ڕەفع ئەکا
ئەو خاکە چاکە پاکە و ئەو ئاوە مەطهەرە «418-415،63»

* * *

ئینجا، زۆر بە شێوەیەکی سەرسووڕهێنەرانە، باسێکی گەڵێ جوانی، خۆی کردووە و خۆی بە سەگێکی ئەو ناوچەیە چواندووە! بەڵام، چۆن سەگێ؟ سەگێکی مەشقپێکراوی بێ دەنگ و ناوەڕێ! ڕاخەری نییە، سەرینی بەردە، هەژارە، لە ژیاندا سەری خۆی کزکردووە و دوورە پەرێزە. بە خواردنی مردارەوەبوو و بۆگەن دەژی، گەڕبووە، بێ کەسە و

کەسیش، لایەکی لێ ناکاتەوە. لەبەرئەوە، هیچ چاری نییە، تەنیا ئەوە نەبێ، سەری خۆی هەڵگرێ و بۆ لای تۆ بێ! ئەمەک و لەیادنەچوونت، وەک ملوانەکەیەک وایە و لە ملیکردووە. بە پەتەکەی بەسراوەتەوە و مل کەچە. بۆیە، وا دێ بۆ لات، تا، وەک سەگێکی بۆز، ڕاوی بۆنی خۆشی، ئەو دەر و دەشتە بکا، کۆڵان بە کۆڵانی ئەو ناوچەیە بگەڕێ، خاک و خۆڵی بە سەر خۆیدا بکا، کە هەمووی تاجی شاهانەیە!

« نالیی »، کەوا سەگی ئەو مەرز و بوومەیە
ئەمما، سەگی موعەللەمی بێ دەنگ و بێ وەڕە
فەرشی پەلاسە، دۆشەکی خاکە، سەرینی بەرد
بێ تووک و ڕووتوقووت و فەقیر و قەلەندەرە
بێ تووکی جیفە، خواریی و گورگین و بێ وجوود
لەم ئاو و خاکە ظاهیر و باطین موکەدەرە
گەردنکەچی، قەلادەی ڕستی وەفاتە، دێ
بۆ ڕاوی بێنی، ئەو دەر و دەشتە موعەططەرە
دا کووچەکووچە، خۆڵی بە سەردا بکا بە چنگ
لەو خاکە ئەفخەرە، کە هەموو تاج و ئەفسەرە «421-419،63»

پاشان، ڕووی دەمی لە پەیامبەر کردۆتەوە و گوتوویەتی: ئەی ئەو کەسەی، وەک ئەشکەوت، پەناگەی هەموو مرۆیەکی! یارە شەونخونکێشەکانت، کۆچیانکرد بۆ لات. ئەوان، وەک « هاوڕێیانی ئەشکەوت » نەبوون، خەو بیانباتەوە و بخەون.
« نالیی »، بە خاکی خزمەتکاری سەگی « قەمطەریر » ئەو دەرە ڕاگرە! بەڵکوو، لە فەڕی شاری « مەدینە »وە، کە جێی بۆنخۆشیی تۆیە، گەڕیی ئەو سەگە بێ فەرە دامرێتەوە و چاکبێتەوە!

« کەهف ئەلئەنام »ی هیجرەتی، ئەصحابی بێ ڕوقوود!
بیکە بە خاکی، خادیمی « قیطمیر »ی ئەو دەرە
بەڵکوو، لە فەڕی طەیبە، کە طیبی پەیەمبەرە
ساکن ببێ، گەڕۆڵیی، ئەو کەلبە بێ فەڕە «422،63»

دوای ئەوەی، بە دووروودرێژیی، باسێکی نایابی، گەورەیی و خۆشەویستیی پەیامبەری کردووە و پێیدا هەڵداوە، ئینجا، پچووکیی و بێ دەسەڵاتیی خۆشی پیشانداوە. دیسانەوە، پاڕاوەتەوە و لە چلەمین دێڕدا، هاواریکردووە و گوتوویەتی:

قوربان! دەسەودامێنی، ئەڵقەی شیشبەندی سەر مەزارەکەت بم، پەنام بۆ هێناوی، سێ تکام هەیە. یەکەمین تکام: ئەی خاوەن بەغیرەتی نایندار! تۆ ناتەوێ، لەوانەی دواتکەوتوون، کەسێ بێ باوەڕ بمرێ. لە هەرا و بگرەوبەردەی، دەمی گیانەڵڵادا، ئامادەبی و نەیەڵی، ئەهریمەن گیانکێشانم لەدەسدا! تکام وایە، لە کاتی گیانکێشاندا، وەک گۆچان، غیرەتت لە ملمدا بێ، بمپارێزی، پەنامبدەی، بەرەڵام نەکەی، تا، مژدەی لێبووردنم، لای خواوە بۆ دێ. دەسم لێ بەر نەدەی، تا، بە تیشکی خۆشەویستی خوا، کە تۆی، لەو جێیەدا، بە کوێریی چاوی، ئەو ئەهریمەنە کلکبڕاوەوە، هەنگاودەنێم، دەپەڕێمەوە و ڕزگارمدەبێ. با، ئەهریمەنی دوژمن نائومێدبێ. منیش، بە هۆی بارانی پڕ لە سۆزی خواوە، بگەمە گۆڕستان!

دووەمین تکام ئەوەیە: لەو کاتەدا، لە گۆڕەکەمدا ڕایانکێشاوم، بە تەڵەبەرد، نێو چاڵی گۆڕەکەم دادەپۆشن، گۆڕەکە، وەک دوکانی لێدێ، لەو جێ تەنگەدا، گەر مرۆیەکی خراپ یا چاک بم، فریشتەی تایبەتیی دێن و پرسیارم لێ دەکەن. ئا لەو شوێنەدا، کە یەکەمین ئێسگەی بەرینەوەیە بۆ بەهەشت یا بۆ دۆزەخ، زوو فریامکەوە. لە سایەی تۆوە، زمانم زوو بپژێ و وەڵامی پرسیارەکانیان بدەمەوە!

سێیەمین تکام ئەوەیە: دەڵێم: ئەی فریارەسی یاخییان، وا لە هاواری بگرە و بەردەی، گێرەشێوێنیی ڕۆژی لێپرسینەوەدام، خەڵک، هەموو سەریان لێ شێواوە، هەر کەسێ، خەمی خۆی دەخوا، ئەو ڕۆژەی، کە ئیدی، هیچ ڕۆژێکی دیکەی بە دوادا نایە، ڕۆژێکی ڕووترش، گرژ، ...ن، سەخت، لە سەر شان گران، وەک شێر، مرۆی لێ دەترسێ.

قوربان! دەخیلی حەلقەی، شوبباکی ڕەوضەتم
سێ ئیلتیجام هەیە، کە لەگەڵ ئەو دووەم، شەڕە
ئەووەڵ: لە ئیلتیجام ئەوەتە، ئەی غەییوری دین!

حاضرببی، له کەشمەکەش و شۆری غەرغەرە
گۆچانی غیرەتت، له ملمدا موعەوزە بێ
تا موژدە دێ، کە نووری یەقینم موظەفەرە
فائیض دەبێ، بە نووری نەجاتی حەبیبی حەق
لەو جێگەدا بە کوێریی، ئەو خەصمە ئەبتەرە
ڕووزەرد و وشک و خائیب و خاسیر ببێ عەدوو
واصیلببم، بە ڕەحمەتی بارانی، مەقبەرە
دوومینە: ئیلتیجام ئەمەتە، ئەو دەمەی دەبێ
ئەلواحی ئەڵحەدم، بە زەنابیلی مەعطەرە
تەنگە، ئەوا دەبێ، کە لە ئەو جێگە تەنگەدا
سائیل نەکیر و عاریف و مەعرووف و مونکەرە
ئیمدادی فەتحی بابی زوبانم، بە فەضڵی تۆ
زووبێ، کە ئەووەڵین گوزەری پرد و مەعبەرە
سێمینە: ئیلتیجام، دەڵێم: ئەی غەوثی عاصییان !
هاواری، بگرە بەردەی ئاشووبی مەحشەرە
ئەو ڕۆژی ئاخیرەی، کە چ ڕۆژی لە دوو نییە
ڕووترش و قەمطەریر و عەبووس و غەضەنفەرە «437-433،63»

پاشان، بە ئەندێشەیەکی ناسک و وردی، هۆنەرانە و هونەرمەندانەی خۆی، باسێکی جوانی، ڕۆژی لێپرسینەوەی کردووە، لە خراپە و چاکەی خەڵک، لە سزا و پاداشتی خوا دواوە. ئیدی، هەر وا، لە سەر باسکردن، پاڕانەوەی خۆی بەردەوامبووە و لە کۆتاییشدا گوتوویەتی: هەر لەو هەراوبەزمەدایە، کە مووی ڕەشی لاویی، تێدا سپی دەبێ، ڕۆژی سوور و گەش، لە ترساندا، زەردهەڵەگەڕێ و خوێنی تێدا نامێنێ. هەموو کردەوەکانمان، « چاک و خراپ »، لە بەر دەستدا دادەنرێ. هەرچی لە نامەی کردارەکانماندا نووسراوە و کۆکراوەتەوە، دەنکدەنک، لە تەرازووی کرداردا دیارە. مسی، مسە، وەک چۆن، زێڕی زێڕە، چاکە و خراپەی، هەمووی ئاشکرایە! هێندەی تۆزقاڵێ، لە کردەوەی چاکە و خراپە، لە بەر چاوی بۆتەی زێڕناسی، تای تەرازووی ڕۆژی هەستانەوە، ون نابێ. هەمووی، وەک ڕۆژی نیوەڕۆ دیارە.

دووکەڵی هەناسەی مەینەتیی خەڵک، ئاسمان و زەوی داگیرکردووە، لەبەرئەوەی، خەڵک دەگرین، لەبری فرمێسک، ڕەشاو لە چاویان دێ. بۆیە، کاتێ، فرمێسک بوو بە مەرەکەب، برژانگەکان دەبن بە پێنووس و چاویش دەبێ، بە شووشەی مەرەکەب!
ئەم دەشتی لێپرسینەوەیە، کە پۆلی سوارانی، ڕیزڕیز لێ وەستاون، کۆگای بەروبوومی دەغڵودانی تۆیە، دەشتی پڕ خەرمانی تۆیە و تەنیا هەر، تکای تۆ دەخوا. لە ڕۆژی سزادانی تاوانباران و پاداشتدانەوەی پیاوچاکاندا، تکا بۆ « نالیی » دەربەدەر بکە، بەڵکوو، خوا لە گوناهەکانی خۆشبێ. چونکە، لە ژیانی خۆیدا، گوناهی زۆر کردووە، پێویستی بە تکای تۆ و سۆزی خودا هەیە!

لەو کێشەکێشەدایە، کەوا ڕەش، سپیی دەبێ
لەو کێشەکێشەدایە، کەوا ئەحمەر، ئەصفەرە
ئەعمالمان، لەگەڵ هەموو ئەوضاعی حاڵمان
مەغشووش و جەمعی، حاضرە، گەر خەیر، ئەگەر شەڕە
مەخزوونی ڕوقعە، حەببەبەحەببە، لە کەففەدا
خالیص دیارە، مس کە مسە، عەینی زەڕ، زەڕە
ذەڕڕێک لە چاوی بۆ تەیی صەڕڕافی کەففەدا
مەخفیی نییە، دیارە، وەکوو ڕۆژی نیمەڕۆ
گریان هەموو ڕەشاوە، لە بەر ئاهی دوودڕەنگ
موژگان بووە بە خامە و دیدە بە مەحبەرە
میضماری شەهسواریی تۆیە، کە صەفصەفە
کۆگای حاصیلاتتە، بەیدایی، بەیدەرە
ڕۆژی جەزا، ڕجابکە بۆ « نالیی » دەربەدەر
چون لەم جیهان، گوناهی گەلێ زۆر و ئەکثەرە «447-445،63»

جگە لەوەی، کاتێ « نالیی »، لە بەردەم بارەگەی پەروەردگاری گەورەدا، بە ملکەچیی و ماتومەلوولیی وەستاوە، لە ئاستی یەزدان و پەیامبەری ئیسلامدا، ئەوپەڕی ساکاریی و ملکەچیی خۆی پیشانداوە. دەسی تکا و پاڕانەوەی بەرزکردۆتەوە، بێ کەسیی، بێ دەسەڵاتیی

خۆی دەربڕیوە و داوای لێبووردنی کردووە. لە سەرچاوەی باوەڕێکی بە تینەوە، لە گیانێکی خاوێنی بێ گەردەوە، نووکی پێنووسەکەی تیژ کردۆتەوە، چامەیەکی دیکەی حەفتاوچوار دێڕ هۆنراوەی هۆنیوەتەوە، باسێکی جوان و ڕێکوپێکی، گەشتەکەی بەرەو « مەککە و مەدینە »ی خۆی کردووە، وێنەیەکی ڕاستەقینەی، هەموو ئەو ڕێ و بانانەی گرتووە. پاشان، کاتێ گەیشتوە و گەشتەکەی تەواوبووە، بە هەموو کوڵودڵێکەوە، لە پەیامبەر پاڕاوەتەوە و گوتوویەتی:

بە قوربانی عولوومی ئەووەلین و ئاخیرینت بم
لەگەڵ ئەسراری قورئانت، کەوا ئەلطافی ڕەحمانە
مورادم ذیللەت و پاڕانەوەی حاڵە، نەوەک نەعتە
بە چەن بەیتێکی کوردانە، کە قورئانت ثەناخوانە
ئەگەر چیی، کوردی دووری « شارەزوور »ی قەسوەتم، ئەمما
وەسیلەم طەیبە و حیلمی شەفیع و فەضلی مەننانە
بە سەر هاتوومە ئەو خاکەی، کە هەر مثقالە ذەڕڕێکی
بە میزانی شەفاعەت، کێوی حیلم و بەحری غوفرانە
نەبوو ڕووم، بێمە خاکی چاکی پاکی طەیبە، تا بیستم:
بە سەگ، نابێ مولەووەث ئاوی زەرقا، بەحری ئیحسانە
چ زەرقا؟ بۆ سیاهیی دەفتەری، هەر ناصییە ماحیی
چ طەیبە؟ بۆ تەبابیی دەردی، هەر دەرماندە دەرمانە
دەری ڕەحمەت، کەوا بەحری موحیطی عاصییە « نالیی »
تیا جان و تەن، ئوفتادەی شەپۆلی سەیلی عیصیانە «63،482-520»

* * *

# « ســـــــــالم »

## « 1866 - 1800 »

هەر چەندە، « سـالم »، پتـر، لە بواری هۆنراوەی ڕۆمـانسـيـدا، ناوی دەرکـردووە. هەر چەندە، « سـالم »، بـە هۆنەرێکی بەرگـريی مـيللیی و قـارەمـانێکی نـەتەوەیی ناسـراوە. بـەڵام، لە کـايەی فـەلسـەفـەی ژيان و سـۆفـيـگەرییـشـدا، زۆر بە جـوانيی، نيـشـانی شکاندووە، وەک شارەزايەکی باڵادەستی ئەو گۆڕەپانە، زۆر بە چاکيی، ئەسپی خۆی تاو داوە! بە تايبەتيی، بە يازدە دێڕە هۆنـراوە توانيـوێتی، بە شـێـوەيەکی ڕێکوپێک، ديدوبۆچوونەکانی خۆی دەبڕێ و ڕوونکاتەوە، بە تەواوييش، مەبەست بپێکێ، کاتێ لە فەلسەفەی ژين و مردن، مان و نەمان دواوە! ئای چەن جوان بۆيچووە، کاتێ، پێی وابووە، بەهەشت، بۆيە کۆشکی پاشـايی « ئادەم »ی لـێ دامـەزراوە، تا، ئەم جيـهـانـە وێرانەيە، ئاوەدان کـرێتـەوە! چونکە، هەر دەبووايە، ئەم ژيانە پەيدابووايە، سـەر زەويی ئاوەدانبـووايەتەوە! هەڵبـەتە، ئەوەش ويست و ئـارەزووی يەزدان بووە! بەڵام، لەبەرئەوەی، خراپەکراوە، درۆکراوە، تۆوی ناکۆکيی چاندراوە، لە خـوا دوورکـەوتوونەتەوە و بە باشـيی نـەيانناسـيـوە، شـيـرازەی چاککاريی هەموو شتێکی باش و پيرۆز پچڕاوە، « ئادەم » نەيتوانيوە، ئەو ئەرکەی لە ئەستۆيدا بووە، جێبەجێيکا، کە زەوی دەبووايە، بەو شێوەيەی پێويستبوو، ئاوەدانکرايەتەوە، کەچيی، وێرانبووە!

ديارە، « ئادەم » لە بەهەشتدا، پاشايەکی بەرزبووە، بەڵام، لەبەرئەوەی، گوێڕايەڵ نەبووە، مـاوەيـەکی زۆر کـورت، لە وێ ژياوە، هەر زۆر زووش، دەرکـراوە و لەم وێرانەيەی سـەر زەوی دانراوە، کـە هەر لە سـەرەتاوە، نيازيان وا بووە، ئاوەدانيکەنەوە!

پاشان، هۆنەر، دڵ و جەستەی خۆی، بە بەهەشت و زەوی چواندووە. پێی وابووە، جەستەی وەک وێرانەیەک وا بووە، چونکە، یاری تێدا نەبووە. لە بەر ئاوەدانکردنەوەی جەستە وێرانەکەی بووە، یارە خۆشەویستەکەی، وەک « ئادەم »، لە بەهەشتی دڵیدا دایکوتاوە و کردوویەتی بە موڵکی خۆی. دڵیشی، بۆیە، بە بەهەشت داناوە، چونکە توانیوێتی، بە ئەندێشەی، وێنەی یار وەرگرێ. هێندە خۆشیی پێ گەیشتووە، وەک بەهەشتی لێهاتووە!

جا، هەر بە ڕاستیی، یار، لە بەهەشتی دڵدا توانیوێتی، پاشایەتیی و فرمانڕەوایی خۆی بکا. بەڵام، بە داخەوە، ماوەی ئەو فرمانڕەواییە، زۆر نەبووە. چونکە، خۆی نەیویستووە، زۆری تێدا بمێنێتەوە! تا، بە هۆی مانەوە و فرمانڕەوایی ئەوەوە، نە دڵم ببێ بە بەهەشت و نە جەستەشم ئاوەدانبێتەوە!

هەڵبەتە، هەر لە سەرەتاوە، کاتێ، یەزدانی گەورە ویستوویەتی، باوە « ئادەم » دروستکا، لە ئاسمانەوە، « جوبرێل »ی دابەزاندووە. ئەویش، لە هەموو قوژبنێکی زەوی، مشتێ خۆڵی هەڵگرتووە و لە جێیە کۆی کردۆتەوە. پاشان، خوا فرمانی بە زەریاکانی « تاڵ و شیرین، سوێر و خۆش » داوە، هەڵمیان بەرزبۆتەوە، پەڵەهەورێکیان ئەفراندووە. چینەکانی هەواش، پەڵەهەورەکەیان گوشیوە. ئەویش، لە تاواندا گریاوە، چەن دڵۆپە فرمێسکێکی، لەو ئاوە خۆش و ناخۆشانە ڕشتووە و باریوە. هەر ئەو بارانی فرمێسکەش بووە، بەر گڵەکەی « ئادەم » کەوتووە و بووە بە قووڕ. ئیدی، « ئادەم » دروستبووە!

ئاخر، چونکە منیش، لە نەوەی « ئادەم »م، منیش، هەر لەو خۆڵ و قووڕە دروستبووم و سروشتیشم، هەر لەوە پەیدابووە! جا، هەر سەردەمێکی منداڵیی، جوانیی، هەرزەکاریی و پیریی بگری، هەر بە ناخۆشیی و خەم ئاودراوە و بەسەربراوە.

ئیدی، هۆنەر، هەر وا، فەلسەفەی ئایین و ناخۆشی ژیانی خۆی تێکەڵاوکردووە، دروستبوونی « ئادەم » و زەوی، بە جەستەی خۆی چواندووە! ئەمەشی، بە شێوەیەکی نایاب گونجاندووە، مەگەر هەر، خۆشی توانیبێتی، بە بیری ورد و سەلیقەی هونەرمەندانەی، ئەو تابلۆ سەیرە، پڕ لە ئەندێشەیەمان بۆ بڕازێنێتەوە و بڵێ:

له بەر تەعمیری ئەم وێرانە، جەننەت موڵكی « ئادەم » بوو
حەقیقەت، پادشاهیی كرد و لاكین، موددەتی كەم بوو
خۆشە ئەیامی گریانم، لە خاكی كەعبەی مەقصەد
هەموو قەطرەی سرووشكم بۆ شەرەف، وەك ئاوی زەمزەم بوو
خەمیری خاكی من، ئەووەڵ، بە بارانی فەرەح نەكرا
جوانیی و پیریی و طفلیم، سەراسەر جوملەگی غەم بوو
بە دوو شانا، پەرێشانی، بە تاتای زوڵفی مشكینت
نە هەر بۆ بەختی تەنهایی سیەهـ، رووزیی عالەم بوو *
لە سەر سەبزی چەمەن، سەهی قەددم كە جیلوەی كرد 1*
لە سەجدەی خاڵی لالێوی بنەوشە، گەردنی خەم بوو
بە قوریی خەڵوەتی دولبەر، نەنازی، ئەی سەبا زینهار!
لە جێی تۆ پێشتر، « سالم »، دەمی هەمرازی مەحرەم بوو «113،30»

* * *

* ئەم دێرە، لە « مێژووی ئەدەبی كوردیی ـ سەجادیی »دا نییە.
1* لای « سەجادیی » نووسراوە:
لە سەر سەبزی چەمەن، یاری سوها قەدم كە جیلوەی كرد

# « مـــــــــــــــــــەولەویی »

« 1882 - 1806 »

کوردێکی خواناس و موسولمان بووە. لەبەرئەوە، لە دید و بۆچوونێکی تایبەتیی ئایینیی و سۆفیگەریی خۆیەوە، سەرنجی قووڵی، لە « دیاردە، ڕووداو و کەس »ەکانی دەوروبەری خۆی داوە.
هەروەها، پێوەندییەکی باش و توندوتۆڵی، لەگەڵ شێخەکانی، هەر دوو ڕێبازی ئایینیی « نەقشیی » و « قادریی »دا هەبووە، بە تایبەتیی، لەگەڵ بنەماڵەی شێخانی « نەقشبەندیی ـ بیارە »، پێوەندییەکە، زۆر تۆختربووە. بۆیە، گەلێ هۆنراوەی، بۆ هەر سێ شێخ « سیراجەددین، بەهائەددین و تاجەددین » هۆنیوەتەوە.
« مەولەویی »، لە هۆنراوەیەکی ئایینیی بەرز و نایابدا، ڕووی لە خوای میهرەبان و مەزن کردووە و گوتوویەتی:
ئەی خوایە! هەرچی هەیە، تۆ ئەفراندووتن. ئەوەی هەیە، هەر تۆی و جگە لەوەش، هەرچی دیکە هەیە، وەک سێبەر وایە. تۆ خۆت، هەر تەنیا بوویت، یەکێتیی و تەنیاییشت، شەپۆلی داوەتەوە و خۆری دەرخستووە، تا، لەم جیهانە کاتییەی مرۆدا بناسرێی. ئەی خوای بێ چەن و چوون! گەر، بەم هەموو دەرکەوتنەی پێشینتەوە نەتناسم، سەد جاری دیکەش دەرکەوی، تازە ناتناسم!
من، بە باسکردنی جوانیی تۆوە مەستم. دیسانەوە، بە دەرکەوتنی تاکوتەنیایی و دێرینیی تۆوە مەستم. کاتێ، خۆتم بۆ دەردەخەی، بە نیشانەکانی خەسڵەتی جوانییت، لە خۆشیدا مەستدەبم. جا گەر، لە سەر ئەو خۆدەرخستنە بەردەوامبی، زۆرم پێ خۆشە. بەڵام، گەر بە

خووورەوشتی، یارانی بێ باک و جوانە چاکە سەرمەستەکانم، لەگەڵ بکەی و گوێم نەدەیتێ، منیش، وەک ئەوان، بۆ لەنێوچوونی یەکجاریی، دڵدارە دڵ پڕ لە دڕکەکان، خۆیان دەشارنەوە و ناچارن، خۆیان دەرخەن، تۆش، بەو چەشنەم لەگەڵ بکەی و خۆتم لێ بشاریتەوە، هەڵبەتە، دەتەوێ، بمکوژی! جا، کەواتە فەرموو: بە ناوی خواوە، ئەوە تیغی تۆ و ئەوەش، گەردنی لە موو باریکتری من، چی دەکەی، بیکە! چونکە، من جێیەکی دیکەم نییە، هاوار و دادی خۆمی بۆ بەرم! ئاخر، لە دەس تۆ، هانا بۆ کێ بەرم؟ ئاهو وا وەیلام، گریانم، لە ئەندازە بەدەرە! بۆیە، هەر لای خۆت هاواردەکەم!
ئیدی، هۆنەر، تەنیا هەر، پەنای بۆ خوای خۆی بردووە و لێی پاڕاوەتەوە، تا، لە هەڵەکانی خۆشبێ و بە نۆ دێڕەهۆنراوە گوتوویەتی:

ئەی گرد مەوجوودێ، جە تۆ گرت مایە!
مەوجوود هەر تۆنی، ما سیوا سایە
پەنهان بی تەنها، وەحدەتت مەوج وەرد
پەی شناسایی، ظهووریوەت کەرد
بە وێت، جەی عالەم بێ بەقای ناسووت
ئەر وەی گرد، جیلوەی وەرین نەشناسووت
بە صەد جیلوەی تەر، بێ چوون و چەنی
شناسایی تۆم نمەبۆ، هەنی
سەروەشم بەی وەصف جەمالیتەوە
باز هەم بەی، جیلوەی جەلالیتەوە
ئەر هەر بەو عادەت، سەروەش نیگاران
پەی فەنای یەکسەر، خاطر پڕ خاران
چار نییەن، جە دەس جیلوە نەکەردەن
بیسمیللا ئەو تێغ، ئێد کەچیی گەردەن
یاگێوتەر نییەن، داد وێم کەروون
جە دەس تۆ بێداد، وە لای کێ بەروون؟
واوەیلام بێ حەد، زاریم بێ شۆمەن
جە لای تۆ فەریاد، جە دەس تۆمەن «53-51،56»

هەروەها، لە هۆنراوەیەکی ئایینی بەرزی دیکەشدا، سەرەتا، ستاییشێکی جوانی، پەروەردگاری کردووە. پێی وابووە، هەر چی لە ئاسمان و لە ژێر زەوییدا هەیە، هەمووی، هەر دەسکردی خوای گەورەیە. سەرچاوەی ڕووناکیی، نێو بیلبیلەی چاوەکانیشی، هەر خوایە. هەر ئەویش، بنچینەی ژیان و باوەڕێتی. خواش، باشی زانیوە، کاری خراپە و هەڵەی کردووە، ملکەچی فەرمانەکانی یەزدان نەبووە. سەراپای ژیانی، لە بێ هۆشییدا نقومبووە، تێشووی ڕۆژی لێپرسینەوەشی، باری شەرمەزاریی نەبێ، هیچی دیکە نییە. بۆیە، پەنای بۆ بەر یەزدان بردووە، چونکە، هیچ جێیەکی دیکەی نەبووە، تا ڕووی دەمی تێکا، دەسی پاڕانەوە و لالانەوەی بۆ هەڵبڕێ، دەنگی هاوار و دادی خۆی بەرزکاتەوە، شکاتی لا بکا! لەبەرئەوە گوتوویەتی:

خوای گەورە! هەر لەو مانگەی بە ئاسمانەوەیە، تا، ئەو ماسییەی، لە نێو زەریا دایە، هەموویان، هەر خۆت ئەفراندووتن. ئەمانەش هەموویان، بەڵگەی بوونی خۆت دەسەلمێنن. تۆ، بنچینەی ژیان و ئایینمی، هەر بە هۆی تۆوە، ڕووناکایی لە چاوەکانمدا پەیدابووە. دەزانم، لە هێڵی خواپەرستیی دەرچووم و لامداوە، گوێڕایەڵی فرمانەکانی تۆ نەبووم و جێبەجێم نەکردوون. بۆیە، سەرتاپای تەمەن و ژیانم، لە کەمتەرخەمیی و بێ ئاگاییدا نقوومبووە، توێشووی ڕۆژی زیندووبوونەوە و لێپرسینەوەم، باری شەرمەزاریی نەبێ، هیچی دیکە نییە. بەڵام دەبێ، بە گەورەیی خۆتم لەگەڵ بکەی، کردەوە خراپەکانم، بە بەهانە بۆ نەبژێری، چاوپۆشیی، لە هەموو ڕووڕەشیی و کردەوە خراپەکانم بکەی. ئیدی، ئەم هەموو هەڵچوون و شەرمەزارییەم بەسە!

تۆ، بە بەزەیی خۆت، پێ بە سەریاندا بنێ، لە کردەوەکانی ڕابردووم مەڕوانە، بەڵکوو، لە زەردیی و شەرمەزاریی ڕووم بڕوانە و لە گوناهەکانم خۆشبە.

هەر چەن، شایستەی لێبووردنی تۆ نیم، بەڵام، ڕووی شەرمەزارییم، لە دەرگەی بە سۆزی تۆ دەکەم، لە زەریای بەخشندەیی خۆت، بێ بەشم مەکە، لە شەڕ و خراپەی، سەر ڕێی دەروونم، بە دوورمکە و بە چاکەی خۆت بەسەرمکەرەوە، تا، لە دەس ئارەزووی دەروون ڕزگارمبێ، بەڵکوو، لە کۆتایی ئەم تەمەنە خراپەمدا، بیری لە باری ژیانی خۆم

بکەمەوە، خۆم بۆ « تەسبیحات » و ناوی خوا هێنان ئامادەکەم. بەڵام، بەو مەرجەی، لێم قەبووڵکەی و بەو هۆیەشەوە، لێم ببووری. خوایە! تۆش دەبێ، بە گەورەیی خۆت، لێم خۆشبی، ئەو هەموو خراپە و گوناهانەم، بە بیانوو بۆ نەژمێری و سۆزم بەرانبەر نەنوێنی!
ئیدی، تا توانیویتی، بە زمانێکی تەڕ و پاراو، لە یەزدانی مەزن پاڕاوەتەوە، بە بیستوحەوت دێڕە هۆنراوە و لە سەرەتادا گوتوویەتی:

باعث وجوود، جە ماه تا ماهی
دەلیل ئیثبات، صنع ئیلاهی
ضیای بینایم، نوور چەمانم
سەرمایەی حەیات، دین و ئیمانم!
من وێم مزانوو، بی ئەمریم کەردەن
ئیطاعەی فەرمان، عەبدیم نەبەردەن
عومرم سەراپا، غەرق غەفڵەتەن
زاد ئاخرم، بار خەجڵەتەن
بەڵام، مشیۆ تۆ، وە فەضڵەکەی وێت
کردەی من، نەبۆ بەهانە پەرێت
ئیغماض کەی جە گرد، نا بە کاریی من
جە ڕووسیایی و بەدکردارییی من
پەی من کافییەن، ئەی گرد ئەنفعال
بۆ بە ڕەحم وێت، بکەرەم پامال
مەدیە، وە تۆمار کردەی و یەردەم
بدیە وە زەردیی، ڕوخسار ئاوەردەم
هەر چەند، شایستەی عەفوت نەداروون
ڕووی شەرمندەگی، وە دەرگات ماروون
جە بەحر کەرەم، بێ بەشم مەکەر
شەڕ نەفسانی، جە ڕاگەم لابەر
تا، بە فەضڵ وێت بوانیمەوە
جە دەس هەوای نەفس، بسانیمەوە
بەڵکم، جەی ئاخر، پەی وێم فکرێ کەم

تەدارەک، پەی چەند تەزبێح ذکرێ کەم
بەڵام، بەو شەرتە، چەنیم قبووڵکەی
بەهانەی ئەسباب، عەفووم وصوولکەی

پاشان، کەمێ بە خۆیدا هاتۆتەوە، ڕووی وەرگێڕاوە، لەگەڵ دەروونی کەیلی خۆیدا، کەمێ دواوە، لۆمەیەکی زۆری کردووە و گوتوویەتی:
ئەی دەروونی خراپ ! بێ ئایین، بێ چانس، نەگریس، سەرگەردان، ئەندێشە قوورس، بەرانبەر بە ڕێوشوێنی خوا گوناهکار، ژاری بێ بەشیی بەزەیی خوات خواردۆتەوە. ڕێی ڕاستییت بیرچۆتەوە، بیرت لە خۆشەویستیی ڕاستەقینە نەکردۆتەوە. بۆچی، نیشتمانی ڕاستەقینەت بیرچۆتەوە، کە جیهانی گیانیی بەرز و پیرۆزە؟ مێخی خۆشەویستیت، لەم خاکە کاتییەی مرۆدا داکوتاوە، هەمیشە، گرفتاری ئارەزوویەکی کاڵوکرچی. چاکە و خراپە، بۆ تۆ وەک یەک وان. تاوێ، خەریکی دەردی دڵدارییت. تاوێ، سەرقاڵی کار و لووتبەرزییت. تاوێکی دیکە، گیرۆدەی پێگەیشتنی نازداری. تاوێکی دیکەش، سەرسووڕماوی بینینی، ڕوخسای یاری. هیچ هۆشت بە خۆت نییە، سبەی، ڕۆژی لێپرسینەوەیە و تەرازووی دادپەروەریی خوا کاردەکا. بیرێ لەم ژیانە بکەرەوە، ئەوا، کاتی مردنتە، کاتی تێکچوونی لاوێتیی و جوانیتە. وەرە، با تێشوویەک، بۆ ئەم کۆچە بێ کۆتاییە دەسخەی، تا، لە بەر دەرگەی بەزەیی خوادا، ڕووی پەشیمانیت هەبێ و پۆزش، بۆ کردەوە خراپەکانت بێنیتەوە. بەڵکوو، یەزدانی گەورە، بەرگی لێبووردن پێ ببەخشێ، لە کاتی مردندا، ڕزگارتکا، بێ باوەڕ نەبی و « ئەهریمەن »، گاڵتەو پێ نەکا! لە ڕۆژی زیندووبوونەوە و لێپرسینەوەشدا، بەخۆشیی بسووڕێیتەوە، کۆت و زنجیری یاخیبوونت نەمێنێ و دڵت ئازادبێ!

نەفس بەدکردار، بێ دین، بەدبەخت
شووم، سەرگەردان، خەیاڵان سەخت !
پەی چێش عادەتت، وە گوناە کەردەن
ژار مەحروومیی، ڕەحمەتت وەردەن
ڕاگەی حەقیقەت، جە ویرت شییەن

یادت پەی مەحبووب، حەقیقیی نییەن
مەوطن ئەصلیت، نە خاتر لوان
مەوطن ئەصلّیت، نە خاتر لوان
مێخ مۆبەتت، نە ڕووی خاک کوان؟
دایم گورفتار، ئارەزووی خامی
یەکسانەن پەرێت، نێکی و بەدنامی
گا خەریک دەرد، هەوای مەجازی
گا مەشغووڵ کەسب، کبر و نیازی
گا غەرق هەوای، وەصڵ نازاری
گا حیرەت زەدەی، ڕوخسار یاری
هیچ هۆشت نییەن، حەق خەبەردارەن
فەردا ڕۆی حیساب، میزان کارەن
فکرێ کەرەوە، وادەی لواتەن
وەخت شێویای، شەوق سەوداتەن
باوەرە وە دەس، زادێ پەی سەفەر
وێت نەو سەفەردا، بێ تۆشە مەکەر
وە دەرگای حەق، بەر ڕووی پەشیمانیی
عوزر ئاوەری کەر، کردەی نادانیی
بەڵ لیباس عەفو، بکەرۆت خەڵات
جە وەخت مەردەن، بدەرۆت نەجات
وە نصیوت بۆ، سەرمایەی ئیمان
نەوی وە ڕیش خەند، سوخریەی شەیتان
وە ڕۆی مەحشەردا، بگێڵی دڵشاد
جە قەید عصیان، دڵت بۆ ئازاد * «85-81،56»

* * *

* ئەم دێرەی دوایی، لە چاپی سالّی « 1961 »دا نییە!

# « كوردیــــــــــــــی »

## « 1849 - 1809 »

دەربارەی بەرهەمـــەكـــانی « كـــوردیی »، زۆرم هـەوڵدا، دیوانەكـــەیم دەسكەوێ، تا، بە كامی دڵی خۆم، چەن هۆنراوەیەكی ئایینیی جوانی، لێ هەڵبژێرم و پێشەكەش، بە خوێنەری هێژای كوردی بكەم. بەڵام، بە داخەوە، لەبەرئەوەی، دیوانەكەیم دەس نەكەوت، بە پێویستم زانی، بەم دوو پێنجـخـشـتـەكـیـیـەی، لە سـەر هۆنراوەكـانی هـۆنەر دانراوە، باسەكەمی پێ بڕازینمەوە و لێرەدا، تۆماریانكەم.
هەر چەندە، نازانم، پێنجخشتەكیی یەكەم، كێ نووسیوێتی، چونكە، ناوی لە سـەر نەبوو. بەڵام، بە شـێـوەیەكی جـوان ڕازاوەتەوە و لەگـەڵ هۆنراوەكەی « كوردیی »دا، بە شێوەیەكی ڕێكوپێك ڕێكخراوە.

دافیعی دەرد و عەنامی، مەرحەمەتكە، ڕەحمەتێ
قابیلی حەمد و ثەنای، مەرحەمەتكە، ڕەحمەتێ
ڕۆشنیی نوور و ثەنای، مەرحەمەتكە، ڕەحمەتێ
« ڕەببی ! تۆ پشت و پەنامی، مەرحەمەتكە، ڕەحمەتێ
بەندە عەبدم، تۆ خوامی، مەرحەمەتكە، ڕەحمەتێ »
بێ كەسم، ڕیسوا، خۆ هاتم، ڕووم نییە، سەر هەڵبڕم
موفلیسم، تەنها تەماتم، ڕووم نییە، سەر هەڵبڕم
خاوەنی دەرد و نەجاتم، ڕووم نییە، سەر هەڵبڕم
« شەرمەساری بارەگاتم، ڕووم نییە، سەر هەڵبڕم
خۆت، كە بەخشندەی گۆنامی، مەرحەمەتكە، ڕەحمەتێ »

بەند و قەیدی هەر دوو دنیام، هەر بە لوطفت حەلدەبێ
داوەکانی نەفسی ڕیسوام، هەر بە لوطفت حەلدەبێ
ئارەزووەکەی ڕۆحی شەیدام، هەر بە لوطفت حەلدەبێ
« موشکلاتی دین و دونیام، هەر بە لوطفت حەلدەبێ
صاحێب و موشکل گوشامی، مەرحەمەتکە، ڕەحمەتێ »
تۆ طەبیب و کردگاری، دەرد و ئازاری منی
ڕۆشنایی گیانی، زار و قەلبی بیماری منی
چاوەڕێتم، تۆ، کلیدی ڕەمزی ئەسراری منی
« خۆت حەکیمی، ئاگاداری ئێش و ئازاری منی
دارویی دەردمی، شفامی، مەرحەمەتکە، ڕەحمەتێ »
عیلم و عیرفان و مەقام و گەورەیی و حیشمەت هەموو
پاکیی و تەقوا و نیشانی سەروەریی و قودەرت هەموو
ئابڕوو و وەقر و موروووەت، ڕاستیی و حورمەت هەموو
« ماڵ و ڕیزق و عومر و دەوڵەت، عیززەت و ذیللەت هەموو
هەر، بە دەستی خۆتە ئەزمی، مەرحەمەتکە، ڕەحمەتێ »
کوا کەسێ تر، تا لە لای ئەو، من تەقەلای خۆم بکەم
تا، مەتالەی کارەکان و جینس و کالای خۆم بکەم
ذیکری دۆسی میهرەبان و یاری ئالای خۆم بکەم؟
« گەر دەرمکەن، بچمە کوێ؟ لای کێ، سکالای خۆم بکەم؟
مەرجەعی لاڵە و تکامی، مەرحەمەتکە، ڕەحمەتێ » «50،75-76»

هەروەها، « مەلا موحەممەدی رەبیعیی »، پێنجشتەکییەکی، لە سەر هۆنراوەیەکی ئایینیی « کوردیی » داناوە، باسی جێژنی لەدایکبوونی پەیامبەری کردووە، گەلێ بە سەریدا هەڵداوە و گوتوویەتی:

ئەی سەرۆکی گشت بەشەر! لە تۆیە، تیژیی مانگ و خوەر
بڕبوو لە عەشقت قەلب و سەر، ڕۆشن لە نوورت، دەشت و دەر
ئەما خراپە، موختەصەر
ئەی رەسوولی مونتەظەر! سەد سەلامت لێ بێ لەسەر
مەرحەبا، خەیر ئەلبەشەر! باغی ژینت هاتەبەر

عالەمی هێنایە فەڕ
موئمین بە گشت بڕواتەوە، بە هۆی نووری نەجاتەوە
بۆ فەخری تۆ بە ذاتەوە، لە سای تینی هیواتەوە
بە ڕۆژ و سات و کاتەوە
مانگی « مەولوود » هاتەوە، بە خۆشیی و ئاواتەوە
شادییە ڕۆژ و شەوی، بە دەقیقە و کاتەوە
هاتەوە، با هاتەوە
مانگی صەفا و بەهجەتە، مانگی فەضا و ویسعەتە
مانگی قیام و غیرەتە، مانگی وەفا و هیممەتە
باسی دین و فیطرەتە
مانگی شەوق و زینەتە، مانگی شوکری نیعمەتە
مانگی ڕێز و حورمەتە، جەژنە بۆ ئەم ئومەتە
لە ئومەتی خۆ عەفا، دیارە، نەماوە جەفا
دڵ هاتە خۆشیی و شیفا، « نیلنا بیهاذا شەرەفەن »
سەلەفەن و خەلەفەن
هاتە دونیا « موصطەفا »، سەروەری ئەهلی وەفا
مەنبەعی صیدق و صەفا، لابەری جەور و جەفا
« شەهیدە ڵڵاهو وە کەفا »
قاوی شەیتان کاس و کڕ، مرد و فەتا فیل و فڕ
کراوە بەندی و دڕ، نەما فەرقی بەندە و حوڕ
داوی بێ دین، قت و بڕ
ئاگری « فارس » ساردوسڕ، ئاوی « ساوە » وشک و زڕ
تاقی « کیسرا » شنگ و شڕ، گاوور و جوو، گێچ و وڕ
بتپەرستیی، نیوەبڕ
پڕبوو لە شادیی وولات، عالەم خەڵاتی بۆ هات
موئمین وەرگرە بەرات، نەخۆش، بکە موداوات
زۆربوو، خۆشیی و سەعادەت
سەلام، چرای نەشئەتەین! لاچوو ستەم، لە مابەین
بە هاتنت، فەخرئەکەین، سەر و گیان، دڵ دەدەین
جورم و گوناه، لادەبەین

سەد سەلام، ئەی نووری عەین، هێزی قەلب و بیر و زەین !
ئەی ئیمامی قیبلەتەین، فارسی « بەدر » و « حونەین » !
« یا ضیائە ئەلخافقین » !
پێشەواکەی ڕاهی دین، تۆی شەفیعی موذنیبین
ئەی هیواکەی موجرمین، نووری چاوی عارفین !
دەسگیڕی دەسی عاجزین
ئەی ئیمامی موورسەلین !« صادق ئەلوەعد ئەلئەمین »
ڕێبەری ئایین و دین، « ڕەحمەتەن لیلعالەمین »
ڕێنموونی دین و ژین
هاوار، هاتوومە پەنات، لە سای بەخشش و عەطات
چاوەڕێی دەست و دەوات، بۆم بنێرە تۆ لە لات
ڕۆح و گیانم بە فیدات، ڕێنمای ڕێگەی نەجات
گەر خوا، ئیزنم پێ بدات، سەر ئەنێمە خاکی پات
بە سەلام و بە صەلات
بپاڕێمۆ بە دڵ، تا خوا، کارێکی و ابکا
لە ڕووی تەمامی ئەرضا، لە لای هەموو ئەنبیا
کۆڕی جەمعی ئەولیا
ئەی موبارەک بێ خوا! هەموو جەژنێکی وەها
جەژنی گەورەی وا، کە وا یەکیەتی بێ لە دوا
ئەی خوا! هەر بەم زوا
ئەی سەعید فیکرت نە ڕوا! وا کەسێ بمرێ و برۆ
گیانی خۆی داشوستوش و پاک
و شیرین، تانوپۆ
ئەی « ڕەبیعیی » ! خەم مەخۆ، سەبتی ناوت کردووە تۆ
بە شفاعەت لە هەموو، ئەجداد و ئەولادی تۆ «99-96،50»

* * *

# « حاجـــــــــی قادری کۆیی »

# « 1892 - 1815 »

هـۆنـەر، چـەن هـۆنـراوەیـەکـی نـایـابـی ئـایـیـنـیـی، لـە بـاسـکـردن و ستاییشکردنی خوا و پەیامبەردا گوتووە. بۆ نموونـــــــە: لە هۆنراوەی « ئەوە شـاهـەنشـەهـە »دا، سـتاییشـێکی بەرزی یەزدانی کردووە و بە نۆ دێڕە هۆنراوە گوتوویەتی:

ئەوە شاهەنشەهە، بۆ عەبد و پاشا
موعەللەق، خەیمەی ئەفلاکی هەڵدا
ئەتۆ مەصنووعی، چیت داوە لە صانیع
لە زانینی ئەوە، نادانە دانا
موعەممایە جیهان، ئیسمی موعەمما
مەکانی ئیسمە، نەک جێگەی موسەمما
بە بێ دینیی، جەمالی بێ قەرینی
خەلاییق سەربەسەر، ئیمانی هێنا !
بە با زوڵفی کە لەرزی، تا بە تا بوو
لەگەڵ لەرز و لەگەڵ تا، بوونە هەمتا
موتالای دەوری، زولفەینی موسەلسەل
ئەوەندەم کردووە، لێم بۆ بە سەودا
لە دەوری دوڕڕی، دندانی بە قیمەت
ددانی کەندووە، لوولوویی لالا
لە لای من پشەمە، ئەم زەخمە هەتا کەی؟
بە ضایع ناچێ، ئەم صەبرە لە لای خوا
زەمانی حاڵە « حاجی »، حاصڵی تۆ
دەبێتە دوێنێ، ئەمڕۆ میثلی فەردا «43-42،44»

لە هۆنراوەی « ئەی بێ نەظیر و هەمتا »شدا، بە نۆ دێڕ، ستایشێکی گەلێ جوان و بەرزی، پەروەردگاری مەزنی کردووە و گوتوویەتی:

ئەی بێ نەزظیر و هەمتا! هەر تۆی کە بەرقەراری
بێ دار و بێ دیاری، بێدار و پایەداری
بۆ باغی مەردیی، باغی دەسمایەکەی خەزانی
بۆ مەزرەعەی فەقیران، بارانەکەی بەهاری
بۆ پادشا نیشانی، بۆ هەر سەوادی ئەعظەم
بێ صەدر و شانشینی، بێ پەردە، پەردەداری
خەللاقی بێ فوتووری، سولتانی بێ قوصووری
ڕەززاقی مار و مووری، ئاودێری دێمەکاری
فەیرووزە تەختی گەردوون، مەصنووعی نەقشی تۆیە
یاقووت و لەعل ڕۆژە، ئەستێرەکان دەراری
جێ و مەکانی تۆیە، بێ جێ و بێ مەکانی
لەیل و نەهاری تۆیە، بێ لەیل و بێ نەهاری
هەر ئەمری تۆ مەدارە، بۆ کار و باری عالەم
هەر چەندە، بێ وەزیر و بێ صەدر و کار و باری
صەحرانەوەردی، شەوقت خورشید و ماهی تابان
دوو جاریەن، شەو و ڕۆژ، بێ مەحمەل و عەماری

لە دوا دێریشدا، زۆر بە ڕاشکاویی، مەبەستی ستایشەکەی خۆی، بە زمانی کوردیی دەربڕیوە و گوتوویەتی:

مەعلوومە، بۆچی « حاجی »، مەدحتدەکا بە کوردیی
تا، کەس نەڵێ: بە کوردیی، نەکراوە مەدحی باری «144-143،44»

« قانع »، لە هۆنراوەی « وەسفی وەهاب »دا، بە حەوت دێڕە هۆنراوە، باسی خوای گەورەی کردووە. لە کۆتاییدا، چاوی لە « حاجی قادری کۆیی » کردووە و بە دێڕێ هۆنراوە گوتوویەتی:

« قانع » بە زمانی کوردیی، مەدحی خوای ئەنووسێ
تا کەس نەڵێ، بە کوردیی نەکراوە، وەسفی وەهاب «38،45»

* * *

# « مـــــــــــەحوی »

## « 1904 - 1830 »

وا بزانم، کـــەم کــورد هەیە، بە پلەی ســـەرەکـیـی، بە هۆی هـۆنراوە و کەسێتیی بەهێزی خۆی، بە پلەی دووەمیش، بە هۆی وەچەکانییەوە، کـە نازناوی هۆنـەریان، بە خـۆیانەوە لکاندووە! ناوی « مـەحـویی »یان نەبیستبێ! لەبەرئەوە، هۆنەر، هیچ پێویستی بەوە نییە، بە خوێنەرانی کوردی بناسێنم!

بەڵام، هەر وەک، چەن جارێکی دیکەش گوتوومە، لێرەشدا، دووبارەی دەکـەمـەوە و هـەر هێنـدە دەڵێم: (« مـــەحــویـی »، بە یەکێ لە هـۆنەرە کلاسیکییە گەورەکانی کورد دادەنرێ. گەلێ هۆنراوەی بەرز و جوانی داناوە. زۆربەی هۆنراوەکانی، بە زمانێکی تەڕ و پاراو، بە کوردییەکی بێ گرێوگۆڵ و شیرین گوتووە. لە سەرچاوەی خواناسییەکی ڕاست، سۆفیگەرییەکی قووڵ و فەلسەفەی ژیانەوە هەڵقوڵاون.)« 16،20 »

جگە لـەوەی، هۆنەر، زۆربەی زۆری ژیانی خـۆی، بۆ خــواپەرســتـیی و ڕاژەکردنی، ئایینی پیرۆزی ئیسلام تەرخانکردووە، هەروەها، زۆربەی زۆری هۆنـراوەکـــانیـــشی، لە خـــولگەی « ئایین، خـــواپەرســـتـــیی، ســۆفـیگەریی و فـــەلســـەفــە »دا دەخـولێنـەوە! لەبەرئەوە، کـارێکی زۆر ئاساییە، گەر هۆنەر، چەندین هۆنراوەی لەو بابەتانەی هۆنیێتەوە.

بۆ نموونە: « مەحویی »، لە چامەی « بەحری نوور »ەکەیدا، بە « 124 » دێڕە هۆنراوە گوتوویەتی:

« وه صهلهڵلاهو عهلی »، ئهو بهحری نووری عیلم و عیرفانه
که دهرکی غهوری ناکا، « غهیرو عیلم ڵلاهی سوبحانههو »
« و صهلهڵلاهو عهلی »، ئهو ذاتی پاکی قودسی ئایاته
که ئهخلاقی، پهسهندیدهی جهنابی حهییی مهننانه
« و صهلهڵلاهو عهلی »، ئهو حهضرهتهی صاحێب کهمالاته
که ئهعلا موعجیزهی، قوربانیبم من، نووری قورئانه
له تاریکیی شهوی کوفرا، به یهکدهم، لهمعهیێکی دا
ههزار و سێسهدوبیستودووه، دنیا چراخانه
چرایهک، نووری بێچوونی مومیددی بێ، دهبێ، وابێ
چاریهک، دهستی قودهرت خۆشیکا، بۆ تا ئهبهدمانه
« تهعالا ئهلاهو » به دوو دهه بوو، که ههر دوو عالهمی داگرت
بنازم، بهم کهماڵی عهزم و حهزم و شهوکهت و شانه
لهگهڵ ئهم ئیحتشامه، زوهدی دیانیی تهماشاکه
که یهک لهت نانی جۆ بۆ قووتی، یا خورما دوو سێ دانه
فهلهک جاهێ، سهری خهرمانی تا عهرش، ئهڵبهته نابێ
تهنهزوولکا، عولووی هیممهتی بۆ دهنکه ڕێزانه
موهیممێ، غهیری ذاتی حهی، له هیممهتیا نییه، ئیللا
له بهر ئهم ئوممهته بێ هیممهته، دائیم به ئهحزانه
چ مهدحێکت بکهم لائیق به تۆ، « یا خهیرو خهلق ڵلا »
سنی بێ خێری نالائیق، که « جیبریل »ت ثهناخوانه
بهیانی گهورهیی خولقی کهسێ، ئایهت له شهئنی بێ
نه مهقدووری من و تۆیه، نه ئیشی « قس » و « سوبحان »ه
«419،55»

مهگهر، ههر « مهحویی » هۆنهر و خواناس، به تهواویی توانیبێتی، له ژیان، جیهان و گهورهیی یهزدان بگا! چونکه، له لایهکهوه، کهم خواناسی کورد توانیوێتی، لهگهڵ باوهڕهکهی خۆیدا، بهو شێوهیه ڕاسگۆبێ! له لایهکی دیکهشهوه، هیچ هۆنهرێکی دیکهی کوردیش نهیتوانیوه، بهو شێوه بهرزه، ههستی دڵ و دهروونی خۆی دهربڕێ، به چهن هۆنراوهیهک، ههموو دهردهکانی ژیان و بێ کهڵکێکانیمان، بۆ باسکا. ئهگینا، گهر وا نییه، ئایا، کێ توانیوێتی بڵێ:

من، خەڵکی وولاتی ئەڤین و خۆشەویستیم، گەر ئاگریشم تێچێ، دەس لەوێ هەڵ ناگرم! من، بە هۆی دەردی دڵدارییەوە، هێندە، لەڕ و لاواز بووم، بووم بە مشتێ چڵوچێو، کەڵکی هیچم پێوە نەماوە، ئیدی، بۆچی بمێنم؟ با، لەوێ بۆ خۆم بسووتێم!

هەر چەندم کرد، لە گۆشەگیریدا، دەسی پاڕانەوەم، بە داوێنی یار نەگەیی. بۆیە، لەمەولا، خۆم دەکەم بە خاک، تا، یار بە سەرمدا ڕابورێ و گەردەکەم داوێنی بگرێ. بۆ ئەم مەبەستەش، واز لە گۆشەگیریی دێنم، دێمە دەرەوە، ڕێ دەگرمەبەر و دەبم بە « ڕێگر ».

لەم ڕۆژی « عارفە »یەدا، دادی نائومێدیی خۆمم، بردە لای یار، گوتم: بۆچی، من هێشتۆتەوە و نامکوژی؟ یار، لێم توڕەبوو، وتی: هیچ نائومێد مەبە، سبەینێ، جێژنی « قوربان »ە، سەرتدەبڕم، دەتکەم بە قوربانیی، خوێنەکەت لە جیاتی خەنە، لە پێ دەگرم و بەوەش، بە ئاواتی خۆت دەگەی.

لە سەربەرزیی و ڕووسووریی خواپەرستیی، کە لام و ڕووزەردیی و شەرمەزارییم بۆ ماوەتەوە. خوای باخەوانم، بە ناوی سێوەوە ناشتمی، کەچیی، من، بەهێ دەگرم. ئەو، ڕووسووریی و خواپەرستیی، لە من دەوێ، کەچیی، من بەهێی شەرمەزاریی و ڕووزەردیی، بۆ وەبەردێنم. دڵداریی، تا دڵدار بە کوشتدەدا، گەلێ دەرد و مەینەتیی تووشدەکا. منیش، بڕیارمداوە، ئەو هەموو دەرد و مەینەتانە قەبووڵکەم، ڕێزیان لێ بگرم و یەک لە دوای یەک، تووشیانبم!

یار، هێندە عەیار و زۆرزانە، ئاگریشم تێ بەردەدا و بە شێخی خۆشیم بانگدەکا! وەک ئەوەی، بڵێسەی ئاگر، لە چیلکە و پووش بەربووبێ، دەیسووتان و دایدەمرکانەوە، کەچیی، دەیوت: بۆیە، دەسی بۆ دەبەم، چونکە، وەک عەسا وایە و دەسی پێ دەگرم.

یار، کە سینەی زامارمی، بە تیری خۆشەویستیی، بە تیغی ناز ئەنجن ئەنجن کرد، وتی: گوڵزاری سینەی خوێناویت سیسبووە، بۆیە، بە تیغی ناز، لەتلەتیدەکەم، تا خوێنی تێبزێ، ئاوبخواتەوە و بگەشێتەوە.

لە تۆڵەی قسەی سارد و ناخۆشی، وەک بەردی ڕەقی یارانی بێ بەزەیی، منیش، ئاخ دەخۆم و هەناسەی گەرم هەڵدەکێشم، کە وەک هەورەبرووسکەی ئاسمان سووتێنەرە. ئەم جیهانە، وەک مەیخانە وایە

و خـــەڵکیـش، وەک ســـەرخـــۆش وان، بۆیـە، هـەرچـی بکـەن، منـێ کـــە هوشیار و ئاگادارم، لێیان ناگرم. کەواتە:

دیارم دەیری عیشقە، جێ بە سووتن بێ، لەوێ دەگرم
کە من مشتێ چڵ و چێوم، بە چیی بم، کەڵکی کێ دەگرم!
نەگەییە دامەنی دەستی دوعا، جا دەبمە خاکی ڕێی
طەریقەی گۆشەگیریی بەردەدەم، ئەم جارە ڕێ دەگرم
کە دادی یەئسی خۆمم بردە لا، ئەم عارفە توند بوو
وتی ئاخر سبەینێ جەژنە، خوێنی تۆ لە پێ دەگرم
لە ڕووسووریی عیبادەت، لام و ڕووزەردی خەجاڵەت مام
بە ناوی سێوی ناوم باغەوان و من بەهێ دەگرم
لەسەرخۆچوونە، شەیدابوونە، قووڕپێوانە، سووتانە
هەتا مردن، مەحەببەت ئێشی زۆرە، ڕیزی لێ دەگرم
چ شۆخە، ئاگرم تێ بەردەدات و پێم دەڵێ: یا شێخ!
بە خاشاکی دەوت: شوعلە، عەصامە دەستی پێ دەگرم
کە سینەی ڕێشمی، بەو تیغی نازە ئەنجنئەنجنکرد
وتی: پەژموردەیە ئەم لالەزارە، ئاوی تێدەگرم
لە پاداشی قسەی سەردا، هەمە ئاه و هەناسەی گەرم
کەسێ شێتانە بەردم تێگرێ، من بەرقی تێدەگرم
شوکر هوشیارە « مەحویی »، تێدەگا، دنیا خەراباتە
کە بەدمەستیی بکا ئەهلی خراپەی بۆچی لێ دەگرم! «55،217-220»

یا، گـــەر وا نـەبووایە، لـە هۆنراوەیەکی دیکەدا، نەیدەگـــووت: هەمـــوو ژیانم، بە خۆڕایی و بە شتی هیچوپووچ ڕۆی، بە شێوەیە، کاتی ئەوەم نەماوە، تەنانەت، تێیدا بمرم. بۆیە دەبێ، داوای کەمێ کات، لە یەزدان بکەم، تا تێیدا بمرم! مـەرگ دەورەی داوم، پێم دەڵێ: ئامـادەبـە، کاتی مردنت هاتووە و گیان بە دەسەوە بدە. کەچیی، تازە منی بێ ئاگا، وا دەزانم، سەرەتای ژیانمە و وەک فەقێ، خەریکم دەوردەکەمەوە!
جگە لـەو کـاتەی، تێیـدا دەژیم، توانای بیـرکـردنەوەی، هیچ شـتـێکم نەمـاوە. لە بەر پیـریی و نـەخـۆشـیی، پەکـمکەوتـووە و لە پێکەوتووم.

کەچیی، سەرم بۆ ڕاناگیرێ. بەڵام، لە ڕووی ئارەزووەوە، دەڵێی، تازە پێ دەگرم و سەرەتای ژیانمە.
هێندە گوناهبارم، گۆڕەکەم، تا ئەو ڕۆژەی زیندوودەبمەوە، لە دەس گۆڕهەڵکەن، هەر شکاتدەکا. چونکە، کردی بە جێی سزادانی من و منی تێخست!
سبەینێ، ڕۆژی زیندووکردنەوەی مردووانە، هەر کەس، لەگەڵ دۆست و برادەری خۆی دەبرێ و لێی دەپرسنەوە. سبەی، ڕۆژی لێپرسینەوەیە. وەک پێغەمبەر فەرموویەتی: هەر کەس، لەگەڵ دۆستی خۆی حەشری دەکرێ. جا، ئەی برادەرەکانم! لەبەرئەوە، کە من زۆر تاوانبارم، بۆئەوەی، کەس بە تاوانی من گرفتارنەبێ، تا هەلتان لە کیس نەچووە، پاکانەم لێ بکەن و لێم جیاببنەوە. بۆیە دەڵێم:

لە ناکەس کارییا، خاکم بە سەر، ڕۆیی بە با عومرم
خودا! تۆ بمژێنە، تا لە بەر قاپیی کەسێ دەمرم
بە ضایع چوو، لە « ما لا یعنی »یا وەقتم هەموو، یەعنی
دەبێ وەقتێ، لە « بوالوقت »ێ بخوازم، تا تیا بمرم
ئەجەل دەورم دەدا: حاضر بە، وادەی دەور و تەسلیمە
منی غەفڵەتزەدە، هێشتا خەریکی مەسئەلەی دەورم
خەیاڵی پوچی دنیا، وا دەماغ و دڵمی پێچاوە
قیامەت، هەر مەگەر ڕۆژی قیامەت بێتەوە فکرم
لە پێ کەوتووم و نەفسم بۆ هەوا دەشنێ وەکوو منداڵ
لە بەر پیریی سەرم خۆی ناگرێت و تازە پێدەگرم
چیە سووچ و گوناهی؟ بۆچی دەیکاتە جەزاخانە؟
لە قەبرهەڵکەن، هەتا ڕۆژی جەزا دەعواچییە قەبرم
سبەینێ « یحشر المرء »ە، براگەل، فرسەتە ئەمرۆ
تەبەڕڕا بن لە من، با کەس نەبێ، حەشری لەگەڵ حەشرم!
لە من نازانم، ئیتر نەفسی بەدخوو چی دەوێ « مەحویی »
کە بەد کردار و بەد ڕەفتار و بەد ئەفکار و بەد طەورم
مەگەر، بەر مەوجی بەحری ڕەحمەتم خا، وەصفی سەتتاریی
وە گەرنا، زەحمەتە پابوونەوەم، نامومکینە سەترم! «222-220،55»

هەروەها، لە هۆنراوەیەکی دیکەشدا، بە جوانترین شێوە، دەردی دڵی خۆی، بۆ هەڵڕشتووین، هاواریکردووە و گوتوویەتی:
چارم چییە، گەر، بە تیشکی شەرابی ئەڤینی ڕاستەقینە، تاریکایی وشکەسۆفێتیی، لە دڵ دەرنەکەم؟!! لە بەر ڕووناکیی مۆمی ئەو ئەڤینە، شەوی بەندەگیی نادڵسۆزانە ڕۆشن نەکەمەوە؟
گەنجینەی دڵم، تەنیا هەر، جێی داخی خۆی ئەڤینی پێوەیە و گەر، بە نەختێنەی ئەم داخە خۆرانە، هێندەی دیکە، دەردی ئەڤین بۆ خۆم نەکڕم. چی بکەم؟ گەر تەنیا هەر، خەریکی دڵداریی نەبم، چی بکەم؟
زوڵفی یار، وەک زوننارێ فەلەکان وایە، بە دەسی مەلای موسوڵماندا ناپێچرێ. لەبەرئەوە، ناچارم، وەک « شێخی سەنعان »، پێڕەوی ڕێوشوێنی فەلەکان بکەم، تا، ئەو زوڵفەم دەسگیربێ. چونکە، من ئەڤینداریش، شێتە و شێتیش، هەرچی بکا، گللەیی لێ ناکرێ. هێندە گریام، چاوم تەڕایی تێدا نەما، تا، بە دەم گریانەوە بێتە خوار، لەبەرئەوە دەبێ، لە بەر دەرگەی یاردا، کڕنووشبەرم، تا، دڵی پێم بسووتێ و بەزەیی پێمدا بێتەوە. وەک چۆن، لە ووشکەسالاندا، باران نەبارێ، خەڵکی دەبێ، نوێژەبارانە بۆ خوا بکەن، تا بەزەیی پێیاندا بێتەوە و بارانیان بۆ ببارێنێ.
لە سەر تۆ، هەموو خەڵک، دوژمنایەتییم دەکەن. کێشەی دۆستیی من و تۆ و ئەو خەڵکە، هەمووی بە هۆی یەکنەگرتنمانەوەیە. چونکە ناتوانم، دۆستی تۆش و دۆستی، هەموو ئەو خەڵکەش بم، مادام، من دەسم لە تۆ هەڵگرتووە، ئیدی، کەسی دیکەم بۆ چییە؟ کێ بێ، لای من، لە تۆ نازدارتربێ؟ چۆن دەبێ، دەسبەرداری ئەوانیش نەبم؟ ئەمە ڕاست نییە. یارانم، هەموو کۆچیانکرد، تەنیا هەر من، بە ناشایانیی، لە شوێنی ناشایاندا ماومەتەوە. دەسا، ئەی مەرگ ! زووکە، وەرە، گیانم بکێشە، من ناچارم، دەس لەم کردەوە نابەجێیە هەڵگرم، کە لە ناتەواویی ژیاندا، یا، لە کۆشک و باڵەخانەی ژیندا ماومەتەوە.
کەچیی، یار دەڵێ: لەو ژیانەی دیکەدا، دێمە لات و پێتدەگەم. سا خوا! مادەم، ئەو وادەی وا دووری بۆ داناوم، من، لەوە زیاتر چارم نییە، کە هەر لە ئێستەوە، تا، ڕۆژی زیندووبوونەوە، هەر شین و واوەیلابکەم و هەناسە هەڵکێشم.

به نووری باده، کەشفی ظوڵمەتی تەقوا نەکەم، چ بکەم!
بە شەمعێکی وەها، چاری شەوێکی وا نەکەم، چ بکەم!
لە خەزنەی دڵمدا هەرچیی هەیە، هەر داغی سەودایە
دەسا ئەم نەقدە، دەردی عیشقی پێ سەودا نەکەم، چ بکەم!
لەگەڵ دەستی مەلا رێ ناکەوێ، زونناری زوڵفی یار
وەکوو « شێخ »، ئیختیاری مەذهەبی « تەرسا » نەکەم، چ بکەم!
لە رێی ئەو شۆخەدا، خۆم کردە خاک و پێی نەنا پێما
دەسا خاکی هەموو عالەم، بە سەر خۆما نەکەم، چ بکەم!
دەمێکە، شاری پڕ شۆری مەحەببەت، مات و خامۆشە
بە قانوونی تەجەننون، شۆڕشێ ئینشا نەکەم، چ بکەم!
لە چاوا نم نەما بۆ گریە، نۆبەی سەجدە بەردەریە
سیاساڵم نەبارە، نوێژی ئیستیسقا نەکەم، چ بکەم!
لە سەر تۆم دوشمنە دنیا، قەضییەم « مانع الجمع »ە
کە تەرکی تۆ نەکەم، تەرکی هەموو دنیا نەکەم، چ بکەم!
بەجێماوم لە یاران، نابەجێ ماوم، ئەجەل ! زووبە
بە مردن، لەم قوصووری ژینە ئیستیعفا نەکەم، چ بکەم!
ئەوا لەیلا، بە رۆژی حەشر ئەدا، وادەی لیقا « مەحویی »!
هەتا قامی قیامەت، ئاه و واوەیلا نەکەم، چ بکەم! «233-230،55»

* * *

# « شێخ ڕەزای تـــــــاڵەبانیی »

## « 1910 - 1835 »

وەک هۆنەرێ، ئەندێشـەیەکی زۆر ناسک و سروشتێکی ڕوونی هەبووە. بە زمـانـەکـانی « کـوردیی، فـارسـیی، عـەرەبیی و توورکـیی »، گـەلێ هۆنراوەی تـەڕ و پاراوی هۆنیـوەتەوە. لە هۆنراوەهـۆنینەوەدا، خـاوەنی ڕێبـازێکی وێژەیی تایبـەتیی خـۆی بووە و دەمی بۆ هـەمـوو، بوارە جـیـاجـیـاکـانی هۆنـراوەی « داشـۆرین و جنێـودان، سـتـایـیش و پێداهەڵدان، مێژوو و کۆمەڵایەتیی، ئەڤین و دڵداریی » بردووە.

« شـێخ ڕەزا »، بە یەکێ لە هۆنەرە بەرز و گەورەکانی، وێژەی کوردیی دادەنرێ. تەنانـەت، گـەر بهاتایە، « شـێخ ڕەزا »، لە وێژەی کـوردییـدا، دەسـڕەنگینیی خـۆی نەنواندایە، ئەوا، لوتکەیە لە لوتکە هـەرە بەرزەکـانی وێژەی کـوردیی، بە چۆڵیی دەمـایەوە. هـەر بۆیە، لە نێـو کورددا، « شێخ ڕەزا » و لە نێو عەرەبیشدا « جەریر »، لە زمانتیژییدا، وەک دوو لەتی گوێزانێ وابوون، هێرشیـان بۆ سەر هـەر کەسێ کردبێ، بە تیغی تیژی هۆنراوەیان، دوو لەتیانکردووە! لە لایەکی دیکەشەوە، لە ڕەوانبێـژییـدا، ئاسـمـانی وێژەی « کـوردیی » و « عـەرەبیی »یان، بە هۆنراوەی ناسک و شیرین ڕازاندۆتەوە.

هۆنەرە کلاسیکییەکانی کورد بە گشتیی، تەنیا هەر، ستاییشی خوا و پەیامبـەریان نەکردووە، بەڵکوو هـێندێکیشـیـان، سـتـاییشی، هێندێ خواناس و پیـاوچاکانی گەلانی مـوسـوڵمـان و ڕۆڵەکانی کوردی وەک: شێخانی « بیارە، بەرزنجە، نەهریی .. »یشیان کردووە.

لەبەرئەوەی، « شێخ ڕەزا »، لە بنەماڵەیەکی ئایینیی گەورەی ناودار بووە، (باو و باپیری، پێشەوای ڕێبازی « قادریی »یان کردووە. « شێخ عەبدولڕەحمان »ی باوکی، لە شاری « کەرکووک »، بناغەی خواپەرستیی و دەروێشیی بڵاوکردۆتەوە و « شێخ ڕەزا »ش، ژیانی منداڵیی و هەرزەکاریی، لە ژێر چاودێریی باوکی، لە ناو دەروێشان و تەکیە و زیکر ڕابیوواردووە)«54،161-162»
بۆیە، شتێکی زۆر سەیر نییە، گەر چیی، لە پاڵ ئەوەی، یەخەی زۆر کەسی گرتووە، زماندرێژییەکی زۆری کردووە و جنێوێکی باشی داوە، جگە لەوەی، هێندێ هۆنراوەی، بۆ نەوەکانی پەیامبەر گوتووە و پێیدا هەڵداون، لە هەمان کاتیشدا، خۆی بە موسوڵمانێکی ڕاست زانیبێ، بێ ئەوەی، گوێی بە ڕێبازە جیاوازەکانی ئیسلام دابێ، هۆنراوەی بۆ شێخەکانی هەر دوو ڕێبازی « قادریی » و « نەقشیی » دانابێ. بۆیە دەبینین: گەلێ هۆنراوەی ئایینیی بەرز و نایابی، لە ستاییشی، پیاوچاکانی ئایینیی کوردی وەک: « شێخ عەبدولقادری گەیلانیی، شێخ عومەری بیارە، شێخ نوورەددینی بریفکانیی، مەلای گچکە، کاک ئەحمەدی شێخ ... »دا هۆنیوەتەوە!
لە هۆنراوەیەکدا، بە شێوازێکی زۆر جوان و بەرز، پڕ لە ڕەوانبێژییەکی تەواو و نایاب، بە زمانێکی ڕەوان و ئاسان، ستاییشێکی جوانی، « کاک ئەحمەدی شێخ »ی کردووە.
با بزانین، بە چ شێوەیە، ژیانی خۆی، بە شاری « سولەیمانیی » و خاکەکەیەوە گرێداوە؟! چۆن، لە خۆشەویستیی « کاک ئەحمەد »، ئاواتی بە سەگی بەر دەرگەکەی خواستووە؟! چۆن، وێنەی فریشتەکانی ئاسمانی کێشاوە، کاتێ، لە سەر سەردانی مەزارە پاکەکەی « کاک ئەحمەد » شەڕدەکەن، ئەو مەزارەی، هەمیشە چواردەوری پەنجەرەکانی، بە خەڵک تەنراوە؟! چۆن، هۆنەر، داخی بۆ دەسە ناسک و گۆچانەکەی خواستووە، خۆی بە قوربانی گۆچان، پێڵاو و سیواکی بەر پشتێنەکەی کردووە؟
پاشان، بە داخ و پەژارەیەکی زۆرەوە، دەردی دڵی خۆی بۆ بەباداوین، فرمێسکی گەرمی، بۆ نەمانی « کاک ئەحمەد » هەڵڕشتووە. چونکە، لای ئەو، کە « شێخ » نەماوە، مەڵبەندەکەی چۆڵبووە، ئیدی، با هەموو

جیهان، وەک « تاجی کەی، جامی جەم و بەختی زوحاک » ژێروژووربێ و نەمێنێ! کەچیی، لەگەڵ ئەوەشدا، خۆشەویستییەکەی، هێندە خاوێنبووە، پێی وابووە و دەبێ، ڕێز لە وەچەکانی بگیرێ. بۆیە، خۆی لە دەوری سەری وەچەکانی، دایک و باوکیان گێڕاوە و گوتوویەتی:

مەربووطە حەیاتم، بە « سولەیمانیی » و خاکی
خۆزگەم، بە سەگی قاپییەکەی « ئەحمەدی کاکیی »
ئەو قیدوەتی ساداتە، کە سوککانی سەماوات
شەڕیانە لە سەر، سوجدە ئەبەر، مەرقەدی پاکی
ئەو، مەرقەدی والآیە، کە وەک عەرشی موعەللا
مەحفووفە بە زوواری مەلەک، دەوری شوباکی
بۆ دەست و عەسا نازکەکەی، داخە دەروونم
قوربانی عەسای دەستی دەبم، سۆل و سیواکی
دونیا، لە دوای حەزرەتی « شێخ »، زێر و زەبەربێ
وەک: « تاجی کەیی و جامی جەم و بەختی ضوحاکی »
دەرحەق بە حەفیدانی، ئەدەب لازمە زینهار
قوربانی حەفیدانی دەبم، بابی و داکی
بەم حاڵە پەرێشانەوە، باز « ئەشهەدو بیللا »
شیعرت تەرەبەنگێزە، « ڕەزا » شاعیری چاکی «41-40،26»

* * *

# « مـــــــــــــــوخليص »

## « 1927 - 1835 »

هەر چەندە، هۆنەر، هێندێ جار، لە هۆنراوەکانیدا هەڵچووە، تووشی دەمارگیریی ئایینیی بووە، دژی ئاییندارەکانی دیکە وەستاوە، قسەی ناشیرن و خراپی پێ گوتوون، هێندێ جاریش، سووکایەتییەکی تەواویی پێ کردوون. هەر بۆ نموونە: کاتێ، باسی « گاوور »ی کردووە، بە چەن دێڕێ، پەلاماریداون، جنێوی پێ داون و لە دوا دێڕیشدا گوتوویەتی:

تۆ، کەر و بێ دین و پیسی، حیز و ئەڵچاخ و نەفام

تۆ، موحەققەق موستەحەققی، ئێستە بێم و لێت بەرم «23،57»

هەروەها، لە چوارینەی « پەند »دا، دەربارەی هەر دوو ئایین « فەلە » و « جوو »، زۆر بە ڕاشکاویی گوتوویەتی:

دنیا، بە قەدەری یەک سەرەموو، قەدەری گەر ئەبوو

قەت نەیئەدا بە گاوور و قەت نەیئەدا بە جوو

دنیا ژنێکە فاحیشە، شەیتانە واریسی

ئانێک لە عیدەدا، بە هەزاری ئەدا بە شوو * «43،57»

---

* ووشەی « گاوور »، واتای « کافر »ی عەرەبیی دەگەیەنێ و بەرانبەر، بە ووشەی « مەسیحیی » نایە. هەر زۆر لە کۆنەوە، تا ئەوڕۆش، لە نێو کورددا، بە هەڵە بەکارهێنراوە! بە کوردیی، « مەسیحیی »، بە واتای « فەلە »، یا « دیان » دێ!

بەلام، لەگەڵ ئەوەشدا، « موخلیص »، مەلایەکی زانا، حاجییەکی خواناس، کوردێکی مەرد، نیشتمانپەروەرێکی ڕەند، کەڵەپیاوێکی بێ گەرد و هۆنەرێکی دانابووە. لە زۆربەی زۆری هۆنراوەکانیدا، باسێکی جوانی خواپەرستیی، ستاییشی پەیامبەر، پیر و پیاوچاکانی کوردی وەک: « شێخ عەبدولقادری گەیلانیی، کاک ئەحمەدی شێخ، شێخ ڕەزای دێلێژە، شێخ حەسەنی قەرەچێوار » و شێخانی، ڕێبازە جیاجیاکانی ئیسلامی کردووە. بۆیە، زۆر بە ڕاشکاویی گوتوویەتی:

خادیمی شەرع و حەدیسی، حەزرەتی پێغەمبەرم
من لە لام ئەم نەمرە، تاجێکە لە سەر تەوقی سەرم
عالمێ، نەفعی نەبێت و وەعزی ئیسلامی نەبێ
با، بلێ دائیم بە حەسرەت، من درەختی بێ بەرم «23،57»

« بەحری نوور »، بە یەکێ لە هۆنراوە بە ناوبانگەکانی دادەنرێ. ئەم چامەیە، لە شەستوسێ دێڕ هۆنراوە پێکهاتووە. هۆنەر، لەم چامەیەدا، ستاییشێکی جوانی، پەیامبەری ئیسلامی کردووە، خۆشەویستیی خۆی، بۆ پەیامبەر و هەر چوار جێنشینەکە دەربڕیوە.

سەرەتا، زۆر بە لەخۆبووردنەوە، باسێکی جوانی « گوناهباریی، پەرێشانیی و کەنەفتەباریی » خۆی کردووە. پاشان، لە گوناهەکانی خۆی پەشیمانبۆتەوە، داوای لێبووردنی لە یەزدانی مەزن کردووە و گوتوویەتی:

هەموو زەڕڕاتی جیسم، غەرقی لوجەی بەحری عصیانە
لە دەست ئەم نەفسە ئەممارە، عەجەب حالم پەرێشانە
هەوا و حیرسی دنیا، نەفسی بەد، ئەخلاقی بێ دینیی
لە مندا، جەمعی مەوجوودە، کەوا مەطلووبی شەیتانە
ددان کەل، موو سپی، ڕوو ڕەش، بەبێ یەک زەڕڕەیی تەقوا
ئەوەندە زۆرە عیصیانم، ئەڵێی دەریای « عوممان »ە
هەزاران تەوبەبێ یا ڕەب! دەسا، ڕەحمێ بە حالم کە
لە کرداری بەدی، ئەم ڕووڕەشە، بێ حەد پەشیمانە
لە دونیا و ئاخیرەت، داوێنی لوتفی شافیعێ ئەگرم
فەرەحبەخشی دڵی « ئادەم »، بینای چاوانی ڕیضوانە

که دونیا و ئاخیرەت، ئیجادیکردن حەزرەتی باری
لە بەر تەعظیمی ئەو بوو، شاهیدم ئایاتی قورئانە
لە « ئادەم »، تا « مەسیحا »، چی نەبی بێت و چی موردەسل بێ
لە بەحری موعجیزەی ئەو، قەترەیەک بۆ ئەو نومایانە «35-33،57»

پاشان، بە شێوەیەکی زۆر جوان و زانایانە، باسی « گەردوون، ئاین و بڵاوبوونەوەی ئیسلام »ی کردووە، بە شێوەیەکی ڕێکوپێک، لە مێژووی ئیسلام دواوە. ئەم باسەشی، لەگەڵ ستاییشی پەیامبەردا، تێهەڵکێش کردووە و گوتوویەتی:

لە عەرشا، فەرشی شادیی بەسطە، نەصبە کوورسیی ئیکرام
لە سەر سەطحی « سەما »، ڕەقصە و سەمایە و بەزم و سەیرانە
لە لەوحا، هەر خەتێ مەحفووظە، ئێستە، حەرفی تەبشیرە
لەوێدا، مەحووە، غەیری دینی ئەم، چی شەرعی ئەدیانە
جەمالێ بوو، جەلالێ بوو، ویصالێ بوو، کەمالێ بوو
نەجاتێ بوو، سەباتێ بوو، کەوا مەخصووصە بەم دووانە
بەقایێ بوو، لیقایێ بوو، خەلاتێ بوو، بەراتێ بوو
ئیشارەت بوو، بەشارەت بوو، هەزاران سیرڕی پەنهانە
کە « جیبریل »ی ئەمین، مەحرەم بە ئەسراری ئیلاهێ بوو
لە گفتوگۆی خودا و حەزرەت، کەچیی، ئەو بوو بە بێگانە
لە ڕوتبەی دین و دنیا، چی مراد و خواهیشی ئەو بوو
خودا تەخصیصی فەرموو پێی، عەطایکرد بەو دەم و ئانە
هەچی، خەزنەی خودایی بێ، چ ناسووتیی، چ لاهوتیی
کلیلی ئیختیاری، دایە دەست ئەو بەحری عیرفانە «37-36،57»

دواتریش، هەر لە سەر ستاییشە نایابەکەی خۆی بەردەوامبووە، تا، لە بیستوچوارەمین دێڕدا گوتوویەتی:

لە سایەی مەقدەمی ئەو، وورده بەرد و ڕەمڵ و خاک و خۆڵ
عەبیرە، موشکە، ئەڵماسە، دووڕە، یاقووتە، مەرجانە
بەبێ تەعلیمی مەکتەب، ئوممیێ تەنها حەدیثێکی
لە بۆ هەرچی علوومە، ئەو حەدیثە مەعدەنە و کانە

له سایەی کتێبە، عیلمی بوو « حەنیفە و شافیعی و ئەحمەد »؟
له فەضڵی کتێبە، « مالیک »، موجتەهید لەم دینە ئاسانە؟
له بۆ تەسکینیی دڵمە، موعجیزاتی عەددی بەعضێکی
وە ئیللا، ڕۆژ کە هەڵهات، خۆی لە بۆ خۆی عەینی بورهانە
له طیفلی تازەبووی پرسی، ئەزانی کێم؟ ووتی: قوربان
بەڵێ، پێغەممەرێکی ناصیحی، بۆ هەرچی ئەدیانە
خەجاڵەتمەندی دنیا و دین، کەسێکە، تۆی نەوێ جانا
سەعادەت بۆ کەسێکە، دەرهەقت صاحێبی ئیذعانە «57،37-38»

له کـۆتایی چامـەکـەشـدا، دەسی پـاڕانەوەی، بەرەو بارەگـای بڵندی یەزدان بەرزکردۆتەوە، پەشـیمانیی خۆی پیشـانداوە، بە دڵێکی غەمگین و بە قوڕگێکی پڕ لە گریانەوە، داوای لێبوردنی کردووە و گوتوویەتی:

له بەحری قودرەتت، یاڕەب ! شەپۆلی ڕەحمەتت بابێ
بە سەر ئەرواحی پاکی، حەزرەت و ئەو صەحب و یارانە
صەلاتێ بێ نیهایەت بێ، سەلامێ موتتەصیل بێ بەو
بە وەصفێ وەک تەسەلسول بێ، له سەر ئەو شاهی عەدنانە
کە « موخلیس » ئوممەتی تۆیە و موریدی خاصی « کاک ئەحمەد »
له کەشتیی موعجیزەی تۆدا، چ باکی بەحری عیصیانە «57،42»

* * *

# « خـــــــــــاكيى »

## « 1904 - 1845 »

بەپێی بۆچوونی « عەلادین سەجادیی » بێ، (« خاكیی » هۆنەر، لە نێوان ساڵەكانی « 1841 - 1912 »ی زایینیدا ژیاوە.)«544،38»
بەڵام، لە هەمان كاتدا، « رەفیق حیلمیی »ش نووسیویتی: (لە نێوان ساڵەكانی «1261 - 1322 » كۆچییدا ژیاوە.)«137،27»
ئەم مێژووەش، بەپێی كەلەنـــــدەری « فریمان جرنفیل » بێ، دەكاتە: « 1845 - 1904 »ز. لەبەرئەوەی، دیوانەكەیم دەس نەكەوت، ئەز ئەو مێژووەی سەرەوەم، بە ڕاستر زانی.
« خاكیی »، زانایەكی ئایینیی و نووسەرێكی ناسراو بووە. گەلێ هۆنراوەی جۆراوجۆری هۆنیوەتەوە. لە سەر ڕێبازی « نەقشبەندیی » بووە. گەلێ هۆنراوەی ئایینیی داناوە، ستایێشێكی زۆری، یەزدانی گەورە و پەیامبەری كردووە. ڕەنگە، گرنگترین و بە ناوبانگترین، ستاییشێكی پەیامبەری كردبێ، چامەی « بەحری نوور »ەكەی بێ، كە لە « 158 » دێڕە هۆنراوە پێكهاتووە.
لێرەدا، چەن نموونەیەك، لە هۆنراوە ئایینییەكانی تۆماردەكەم.
هۆنەر، ستاییشێكی گەلێ جوانی پەیامبەری كردووە و گوتوویەتی:

ببارێنی خوا، بارانی، هەرچی فەیض و ئیحسانە
بە سەر ئەو باعیثی خەلق و گوزیدەی جەمعی ئەكوانە
دەمی صوبحی ئەزەل داكا، هەتا شامی ئەبەد برژێ
بە یەك تاو بێ، نەكوو تاوتاو، وەكوو تاوی بەهارانە
بە سەوزەی نەونەسیمی، گوڵ شەمیمی لوطفەوە داكا
نەسیمی نسبەتی حەق، دانەیەكی كا بە صەد دانە

پاشان گوتوویەتی:

کەلامیان ڕاستە، هەر دوو بوون لەگەڵ حەق، « ئەحمەد » و « موسا »
تەفاوتیان، وەلێ ئاخر زەمین، تا، عەرشی ڕەحمانە
لە کۆتاییشدا گوتوویەتی:

ئەرێ « خاکیی » ! ئەتۆ خۆت چی و دیاری تۆ ئەبێ، چی بێ؟
لە بۆ شاهی عەرەب، هەر کەس نەبەی، ئەم شیعرە کوردانە
مەگەر شاهی ڕوسل، هادی سوبل، سەر خێڵی جوملە و کول
بە ئیحسانی بکا تەحسین، بڵێ: وەک شیعری « حەسان »ە
«141،27»

هەروەها، لە چامەی « میعراجی نەبیی »دا، بە سیوهەشت دێڕە هۆنراوە گوتوویەتی:

چییە ئەم شەو، شەوی سوور و سروور و سەیر و سەیرانە
شەوی « ئەسرا »یە، یا، صوبحی وصالی جانی جانانە
لە خەڵوەتخانە دەرکەوتوو، لە حەوخانەی فەلەک سەرکەوت
لە دەوڵەتخانە چوو، بەک ئان بە دەوڵەت هاتەوە خانە
نەسیمی فەیض حەق ئەنگوت و غونچەی کامی پێ پشکوت
وصالی جان و جانانە، چە خۆشە، ڕەبی چەن جوانە
لە « ئەحمەد » تا « ئەحەد » میمێ بوو، فەرقی غەرقی وەحدەت بوو
بزانە، عاشق و مەعشووق، لە ناو ئەم دووانە کێیانە
جیهان سایەنشینە، تۆ مەگەر ڕوحی کە بێ سایەی
بەڵێ سایە، وەظیفەی جیسمە، جیسمی تۆ هەمووی جانە
حەدم کوا، من بەیانی، حەدی ئیعجازی « موحەممەد » کەم
کە تیعدادی نجوومی ئاسمان، خاریج لە ئیمکانە «142،27»

* * *

# « سـەیید ئەحمەدی نەقیب »

## « 1909 - 1863 »

گەلێ هۆنراوەی « ئایینیی، دڵداریی، کۆمەڵایەتیی و ڕامیاریی » داناوە. زۆربەی زۆری هۆنراوەکانی، لە هۆنراوەی ئایینیی پێکهاتوون. لە چەن هۆنراوەیەکدا، ستاییشی یەزدانی گەورە و پەیامبەری نازداری کردووە. بە زمانێکی ساکار دواوە، ووشەی ئاسان و ڕەوانی بەکار هێناوە. چامەی « بەحری نوور »، بە یەکێ لە هۆنراوە بە ناوبانگەکانی دەژمێررێ. هۆنەر، بە پەنجاوچوار دێڕە هۆنراوە، باسێکی جوانی پەیامبەری کردووە، پێیدا هەڵداوە و لە سەرەتادا گوتوویەتی:

« وە صەلەڵلاهو عەلا » ذاتێ، کە قورئانی ثەناخوانە
لە جوملەی موعجیزاتی ئەووەڵی، ئایاتی سوبحانە
شەهەنشاهی سەریری « لی مەع ئەڵلا »، واسیطەی ئیمکان
ڕەسوولی ئینس و جانە، ئونسی جانە، بەحری ئیحسانە
بە بەدری، چۆن بکەم تەشبیه، کە نووری « مەه »، لە خۆر دەسکەوت
فەقەط « فەخر ئەلڕسل »، فەیضی لە نووری « حەی مەنان »ە
سوموومی قەهری ماڵوێران، کونندەی میللەتی کوفرە
نەسیمی میهیری زینەتبەخشی، گوڵزاری موسوڵمانانە
بە نووری ڕۆژی ڕوخساری، شەوی کوفری جەهل گومبوو
شەهی تەختی « لەعومەرەک »، مەسنەدئارای، موڵکی عیرفانە
شەوی « میعراج »ی، وەک سوبحی هیدایەت، پاک و نوورانیی
شەوێ بوو، تا قیامەت، سەد هەزار ڕۆژی قوربانە «53-52،2»

دوایی، بە قوربانی ناوی بووە، گەلێ ستاییشی دیکەی کردووە، هەر کەسێ، لای ئەو پەسەندبووبێ، ئەوا، لە هەر دوو ژیانەکەدا، بە سەرکەوتووی داناوە! بەڵام، هەر کەسێکیشی نەویستبێ، ئەوا، ورچ، بەراز، یا ئەهریمەن بووە، لە سۆزی یەزدان دووربووە و گوتوویەتی:

به قوربانی، موبارەک ناوی، چاکی فەخری عالەم بم
کە ڕەوحی ڕوحە، قووت و قووەتی دڵ، نووری چاوانە
بە تەشریفی، کە تاقی کیسرەوی شەق، جێشی پێ شەق بوو
ووشک بوو، بەحری « ساوە »، مولکی « فارس »، بوو بە وێرانە
سەر ئەنگوشتێکی ئیعجازی، یەدی بەیضای، تیا دەرجە
بە تەحقیق، ذیکری فەضلی ئەو، لە « وە ئینشەق ئەل » نومایانە
کەسێ، مەقبوولی دەرگاهی ئەوە، ماقوولی دارەینە
یەکێ، مەطروودی ئەو بێ، خرسە، خووگە، بەڵکی شەیتانە «57-56،2»
پاشان، پەنای بۆ پەیامبەر بردووە و گوتوویەتی:
دەخیلەک یا « ڕەسوولەڵلا !»، عیلاجی حاڵی « ئەحمەد » کە
کە سەرگەردان و ماڵوێران و غەرقی بەحری عیصیانە
بە ڕوو، وەک مەڕ هەژارە، باطینی وەک گوورگی هارە
وەکوو ماری خەتاکارە، نزارە، زارە، حەیرانە
« مولەوەث » بوو، بە تۆزی « مەعصییەت »، دامێنی تەمکینی
لە فکری ئاخیرەت غافڵ، بە دنیا مەست و خەندانە
لەگەڵ ئەم بێ حەیایی خۆمەدا، عەرز و نیازی من
صەلاحی نەفسە، ئیمانە، مەزیدی عیلم و عیرفانە «61،2»
لە کۆتاییشدا، سڵاوێکی زۆری بۆ ناردووە و گوتوویەتی:
صەڵات و هەم سەلامی بێ حیساب، بێ حەدد و پایان
لە سەر ئەو فەخری ئەرز و ئاسمان، ئەو بەدری تابانە
لە سەر ئال و سەحابی و تابیعینا، تا دەکەن ئینشاد
و « صەلەڵلاهو عەلی » ذاتێ، کە قورئانی ئەناخوانە
گوڵی گوڵزاری ئیحسانە، حەبیبی شاهی یەزدانە
دووڕی تیجانی شاهانە، « خەلیل ئەلحەق » سوبحانە «66،2»

بە پازدەدێڕ هۆنراوەی دی، ستاییشی پەیامبەری کردووەو گوتوویەتی:
یا فەخری ئەووەلین، شەهی دین، شەمعی موورسەلین !
لەو وەقتەوە، ڕەسوولی، نە « ئادەم » بوو، نە ماء و طین
سەرداری ئەنبیای و هەم سالاری ئەولیا
سیرڕی خوادی و نووری دڵ و چاوی موتتەقین

پاشان، بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ، ستایشیکردۆتەوە و گوتوویەتی:
شاهێکە، فەخری فەقرە، کەمینە غوڵامی ئەو
سەد لەک زیاترە، لە شەهی « ڕۆم » و « هیند » و « چین »
مەولا بە شەققی بەدر، موکافاتی دایەوە
چونکە، شەققی صەدری، ئەوی کردبوو ئەمین
تۆزێ، لە تۆزی ڕێگەی ئەو، دەسکەوێ ئەگەر
زیاتر لە کوحلی جەوهەرە، بۆ چاوی عەقڵ و دین
لە کۆتاییشدا گوتوویەتی:
قوربان! ئەمن سەگێکم، هاتوومە بەر دەرت
فەرتووت و ڕووت و قووت و کەڕ و لەڕم و هەم مەهین
نۆ حاجەتم هەیە، کە لە لای « بەندە »، زۆر گران
ئاسانە لای شەفاعەتی، سەرداری موورسەلین
ئیمان و عیلم و صیحەت و طاعەت و غینا و فەقر
دەفعی ڕەزائیلی دڵم، ئەمڕۆ نەهی دین
جێی شین و گریەم و هەموو دەم، فەهمم ئەگەر ببێ
شەیتانی بەد، بە حاڵی دڵم، دێتە پێکەنین
عەنقایە ئەو ڕەفیقە، کەوقا « ئەحمەد »ی بوێ
بۆ حاڵ و باڵ و ماڵی ئەوەی، بێتە سەر کڕین «40-37،2»

لە هۆنراوەیەکی دیکەشدا، ستایشکی بەرزی یەزدانی گەورەی کردووە و بە پەنجا دێڕ هۆنراوە گوتوویەتی:
حەمد، هەر بۆ خوداوەندی جیهانە
کە خالق، بۆ زمین و ئاسمانە
صەلات و هەم، سەلامی با تەوالی
لە سەر پێغەمبەر و ئەصحاب و ئالی
دوایی، باسی خەسڵەتەکانی پەروەردگاری کردووە و گوتوویەتی:
وەرە، عامی بزانە، خودا قەدیمە
صیفاتی سەبعە، بۆ ئەو موستەدیمە
حەیاتە، سەمعە، عیلمە، هەم کەلامە
بەصەر، قودەرت، ئیرادە، بەو تەمامە

له کەس نەبووە، کەسی لێ نابێ مەولا
له خۆراک و له خەو، دایم موبەڕڕا
خودا ذاتێکه، بێ ئەجداد و فەرزەند
شەریکی قەت نییه، بێ چون و بێ چەند
عەلیمە، یەعنی ئاگادار و دانا
بەصیرە، یەعنی ذاتی پاکی بینا
سەمیعە و بشنەوە، ئەو ذاتی بێ چون
نییه چەشنی، له عیلمی سەمعی بیرون
کەلامی ئەو، قەدیمە، بێ صەدا و دەنگ
وەکوو ذاتی، که بێ کەیفییەت و ڕەنگ
پاشان، باسی ژمارەی پەیامبەرانی کردووە، هێندێکیان پەرتووکیان هەبووە، هێندێکی دیکەشیان نەیانبووە و گوتوویەتی:
« موحەممەد » و « نوح » و « ئیبراهیم » و « موسا »
له پاشا، ئیبنو « مریەم »، یەعنی « عیسا »
که سێزده و سێ سەدن، پێنجیان « ئولوئەلعەزم »
که زۆر ئەزێتدراون، صاحبی جەزم
بەنیئادەم، له « ئادەم » بوون و « حەووا »
که « ئادەم » باوکه، « حەووا » دایکه، ئەمما
« موحەممەد »، سەروەری دین، فەخری عالەم
له بۆ پێغەمبەران، ئەو بوو به خاتەم
له کۆتاییشدا گوتوویەتی:
« موحەممەد »، خاتەمی پێغەمبەرانه
« موحەممەد »، فەخری ئەرز و ئاسمانه
به دینی پاکی، شاهی موڵک و عیرفان
هەموو دینێ، بەتاڵبوو، چوو به تاڵان «118-107،2»

* * *

# « وەفایـــــــــــــــــــی »

## « 1902 - 1844 »

شوێنپەنجەی « وەفایی »، لە مێژووی وێژەی کوردیدا، زۆر بە ڕوونیی دیارە. « وەفایی »، لە نێو باخچە ڕازاوەکەی هونەری کوردیی و دەستە برا هۆنەرەکانیدا، بە هۆنەرێکی « ئەویندار، هەست ناسک و ئەندێشەی قووڵ » ناسراوە. لە سەرەتای لاوێتیدا، پتر هۆنراوەی ڕۆمانسیی گوتووە. بۆیە، هۆنراوە ڕۆمانسییەکانی، بەشی هەرە زۆری، بەرهەمە وێژەییەکانی پێکدێنن. لە هەمان کاتیشدا، هێندێ هۆنراوەی، بۆ « باسی سروشت، لاواندنەوە، پێداهەڵدان ... تاد » داناوە. بەڵام، پاشان وردەوردە، لەگەڵ فراوانبوونی هەست و هۆشیدا، لەگەڵ هەڵکشانی تەمەنیدا، ڕووی لەو ڕووگەیە وەرچەرخاندووە، بایداتەوە و ڕووی، لە دەروازەی پڕ لە میهرەبانیی یەزدانی گەورە کردووە. تەنانەت، خۆشی دانی بەو ڕاستییەدا ناوە و بە بیستوشەش دێڕە هۆنراوە گوتوویەتی:

« وەفایی » ! ئیدی بەسە، عیشق و هەوای مەدرەسە
بینووسە ئەم هیندووسە، بێتە خەط و خاڵی یار
بچۆ بە لای دڵڕوبای، بە سەر بە یادی بەقای
هەتا ئەتۆ بێ وەفای، بە خۆت مەکە ئیعتیبار
دەمێک نەفەس بگرەوە، وە دووی دڵی خۆت کەوە
بزانە، ڕۆژ یا شەوە، خەوت نەیە، هەستە کار!
هەزار صەوم و صەلات بێ، چاوت لە دووی زەکات بێ
خودات نییە، حەیات بێ، قەط وا نییە تۆبەکار!
تف لە ڕەنگ و ڕەوانت، دەگەڵ فیعل و ژیانت
چی تێدا نییە دووکانت، چت بکڕی خڕیدار

مومکینی سیڕڕ و نیهان، هەم صوحوفن، هەم بەیان
هەم کیتابن، هەم زوبان، بە وەصفی پەروەردگار
قسە بیستوچوارە، هەر یەکێکیان بە کارە
ڕێگای خودای دیارە، بمرە، ببە ڕستگار
لە خەو، لە خۆوە هەستە، حەیات بێ! هێندە بەستە
« وەفایی » گێژ و مەستە، دەنگە لە شار و بازاڕ «40-39،67»

لەبەرئەوە، کاتێ « وەفایی »، هۆشی بە بەر خۆیدا هاتۆتەوە، ڕێی ڕاستی خواناسیی گرتووە. ئیدی، چەندین هۆنراوەی ئایینیی، لە ستاییشی « پەیامبەر و شێخانی نەهریی »دا داناوە، پێیدا هەڵداون، زۆر بە کوڵ گریاوە و شینی بۆ « شێخ عوبێدوڵلای نەهریی » کردووە. بە هۆنراوەیەکی شەستویەک دێڕیی، سەرەتا، باسی تەمەنی خۆی کردووە و گوتوویەتی:
دریغا! بای خەزان، دایە بەهاری شۆخ و ڕەعناکەم
لە ئیظهاری عەمەل کەوت، ئافتابی عالەم ئاراکەم
وەرەق ڕێزان، خەزان کەوتە ڕەزان، وەضعی چەمەن گۆڕا
بەسەرچوو، فەصلی گوڵگەشت و تەماشای، باغ و صەحراکەم
خەزان هات و چەمەن چۆڵبوو، لە نەغمەی بولبول و قومری
دریغا! حەسرەتا! بۆ گوڵعوزاری سەر و بالاکەم «73،67»

پاشان، باسێکی باری، ژیانی تایبەتیی خۆی کردووە. ئینجا، بازێکی داوە و بە سەر شێخی « نەهریی »دا هەڵداوە. هەر بەو شێوەیە، پێیدا هاتووە، ئەوینێکی زۆری، بەرانبەر دەربڕیوە. ئینجا، ڕووی لە یەزدان کردووە، ناوی پەیامبەر و یارانی هێناوە، هەموویانی هێناوەتە تکا، پاڕاوەتەوە، لاڵاوەتەوە، تا، خوا بیبەخشێ و لە « 54 »ەمین دێڕدا گوتویەتی:
خوداوەندا! ڕەحیما! قادرا! ئاموزگاری خۆم!
کەریم و حەیی و غەففار و قەدیم و فەردی یەکتاکەم
بە حەققی نووری وەجهی پاک و بێ مامەند و بێ میثلت
بە ئیسمی ئەظعەمی خۆت، ئەی خودای سەتتار و داناکەم!

به سەرمەستانی، بادەی ساغیری، عەهدی ئەلەستت کەی
بە قەطرێکی نەجاتمدەی، لە دەست خۆم، ڕوو لە دەریاکەم
« وەفایی »، بێ کەس و داماوە، پابەندی طەلیسمێکە
مەدەد، یا ڕووحی غەوثی ئەعظەم و شاهی بوخاراکەم!
بە حەققی نووری موطلەق، جەددی ئەمجەد، شاهی لەولاتان
ئیمامی « یەثریب » و قیبلەی مەلایک، ماهی بەطحاکەم
بە حەققی چار یار و ئال و ئەولادی « نەبیوڵلا »
بە ئەنصار و موهاجیر، قایدانی قیبلە گومڕاکەم
بە ڕووحی خواجەگانی « نەقشبەند » و قیبلەگاهی خۆم
غەریب و جانسپاردی « کەعبە »، قوطبی دین و دونیاکەم
بە قووەی جاذیبەی دڵتان، « وەفایی » دەست و دامانە
چ نابێ، لە سایەی ئێوە، قەطعی « ما سوا ئەڵڵا »کەم «67،73-81»

لە هۆنراوەیەکی سیازدە دێڕیی دیکەدا، ستایشی پەیامبەری کردووە.
سەرەتاکەی بەم شێوەیە دەسپێکردووە و گوتوویەتی:
ئەی « ئیمام ئەلمورسەلین، شەمس ئەلهودا، بەحر ئەلهمەم » !
ئەی « شەفیع ئەلمذنبین، خەیر ئەلوەرا، مەولا ئەلنیعەم » !
ئەی نەسیمێکی گوڵی زار و شوعاعێکی ڕوخت !
شەوقی ڕۆژ و بەدری تابان، عەطری گوڵزاری ئیرەم
ئەی لە شەوقی جەننەتی ڕووت، ئەنبیا و ئەولیا!
ڕووح لە سەر لێون، وەکوو پەروانە، بۆ دیداری شەم
ئەی دەم و خەندەت، دەلیلی دەعوەی بوون و نەبوون !
ئەی برۆ و باڵات، بەیانی مەعنیی نوون و قەڵەم !
ئاسمان پیربوو، لە داغی خەطی ڕووی تۆ، شەو لە ڕۆژ
صەد چرای هەڵکرد و نەیبۆوە، سەودای یەک ڕەقەم
تۆ بیی و تەشریفی « لەولا »، سیرڕی « ما زاغە ئەلبەصەر »
تۆ و مەقامی « لی مەع ئەڵلا »، تۆ بیی و نووری قیدەم
بێ نەوام، هیچم نییە، هاتووم و مەحرووم مەکە
قەت لە دەرگای خۆی، گەدای ناکاتە دەر صاحیبکەرەم
هیچ طەبیبێ، ڕێی نییە، دەردی دەروونم کادەوا

ئەمڕۆ، گەر چارەم نەکەی، « وا حەسرەتا یەوم ئەلنەدەم » !
هاتمە بەر ئەبڕۆت و ناسووتێم، لە سایەی خەططی ڕووت
ئایەتە: « چی داخلی کەعبەی بوو، نایبێ، ترس و غەم »
دەست و دامانی، خەمی کێسووی تۆم بەو عاریضە
نائومێد نابم، کە من، دەستم لە حەلقەی « کەعبە » دەم
من، چلۆن مەحرووم ببم، ئەی « ڕەحمەتەن لیلعالەمین »
دێ صەدای « لا تەقنطوا مین ڕەحمەتەڵلاهی »، دەم بە دەم
پاشان، لە کۆتاییشیدا گوتوویەتی:
« یا ڕەسوولەئەڵلا »! دەزانی تۆ، کە شەیطانە عەدووت؟
هەم، لە تۆ مەعلوومە، ئەمنیش، ئوممەتی تۆم، هەرچی هەم؟
کەی ڕەوایە و غیرەتە بۆ تۆ، کە « فەخر ئەلئەنبیا »ی
دوشمنی خۆت، شاد بفەرمووی، ئوممەتی خۆت، دڵ بە غەم؟؟
داغی تۆم پێوەیە، صەد جار دەرمکەی، دێمەوە
من سەگێکی تۆم، « وەفایی » ! ڕوو لە دەرگای کێ دەکەم؟
«85-82،67»

هەروەها، بە دوازدە دێڕە هۆنراوە، باسێکی پەیامبەری کردووە، لێی پاڕاوەتەوە و گوتوویەتی:

ڕووحم بە فیدات، ئەی گوڵی گوڵزاری « مەدینە » !
لوطفت هەبێ، ڕوو وا بکە، مەقصوودی مە، دینە
بەو جێگە « بویتە !» شەرەف و قورب و مەقامت
لوطفت ببێ، بمبەخشە، وەرە، جورمی مەبینە
دەرمانمەکە، هاتوومە، حەکیمی هەموو دەردان !
دەرمانبکە، جەرگم، کە هەموو کۆنەبرینە
عومرێکە دەناڵم، بە ئومێدی گوڵی زارت
جارێکی بفەرموو: کە چ هاوارە؟ چ شینە؟

پاشان، هەموو سەروەتی جیهان و تەمەنی « خدر »ی بە لاوە هیچ بووە و ڕەتیکردۆتەوە، گەر، بەهەشتی ڕووی پەیامبەری نەبێ و گوتوویەتی:

فەرضەن، هەموو دونیا من و عومری خضرم بوو
بێ جەننەتی ڕووی تۆ، چ حەیاتێکە؟ چ ژینە؟ «148،67»

لە کۆتـایـیشـدا، داوای لە پـەیامبەر کـردووە، سـۆزی بـەرانبـەر بنوێنـێ، لە ژەنگ و خەسڵەتە خراپەکانی دەروونی خاوێنیکاتەوە و گوتوویەتی:

مەوقووفی نیگاهێکە، بفەرموو، بە تەڕەححوم
ژەنگاوییە، ئاوی نییە، ئاوێنەی سینە
پابەندی ئیشارێکە، دەریکە لە دەروونم
خودبینیی و بوخل و حەسەد و نەخوەت و کینە
بەو خاڵ و خەط و صورەتی گێسووی هەتە، حەقیە
« مانیی »، کە پەرێشانی صەنەمخانەی چینە
نایدەم، بە هەموو دەوڵەتی دونیا و قیامەت
جارێ، بە « وەفایی » کە بڵێ: کەلبی ئەمینە «149-148،67»

لە هۆنراوەیەکی دیکەی بیـسـتـودوو دێڕییـدا، ڕووی لە پەیامـبـەری ئیسلام کردووە و گوتوویەتی:

یا ڕەسوولەڵڵا ! دەخیلەک، ڕووم نییە، بێمە حوضوور
وەک دزان، گەردەنکەچ و شەرمەندە، وێستاوم لە دوور
گەر چیی، سەرمایەم نییە، خۆ موستەحەققی ڕەحمەتە:
ڕەنگی زەرد و ڕووی ڕەش، مووی سپیی و فرمێسکی سوور
وەک لە گۆشەی بیشە ... تووشی دام و داو
تووشی نەفس و تووشی شەیطان بووم، غەریب و بێ شوعوور
موستەحەققی ڕەحمەتم، ئەی مەستی حەق! ئەی دەستی حەق!
دەستی من بگرە لە نار و بمخە، نێو دەریای نوور
ڕووح لە سەر لێوم، نەفەس گیرە، لە نێو خەوف و ڕەجا
چاوەڕێی فەرمانی تۆیە: بچێتە دەر، یا بێتە ژوور!

لە کۆتاییشدا گوتوویەتی:

توبیی و ذاتی خودا ـ قوربان ! ـ وە هاوارم وەرە
ئەو دەمەی، بێ کەس دەمێنم، دەبمە، لووقمەی مار و موور
دەم بە خەندە، یەکدەم، ئەی کەششافی سیرڕی لا مەکان!
کافییە، جارێک بفەرمووی: بۆ « وەفایی » یا غەفوور «205-204،67»

* * *

# « ســـــــــــالمی سنه »

## « 1909 - 1845 »

هۆنەر، لە زۆربەی هۆنراوەکانیدا، لە بابەتی « فەلسەفەی ژیان و سۆفیگەریی » دواوە. لە بواری خواناسییدا، زۆر بە شێوەیەکی قووڵ، پێی داگرتووە و ڕۆچووە، وردەکارییەکی جوان و چاکی بەکارهێناوە. ئەمەش، کاتێ دەرکەوتووە، کە بە تەواویی، سەوداسەری شێخانی ڕێبازی « نەقشبەندیی » بووە. کارێکی زۆریان، لە دید و بۆچوونەکانی کردووە، بە تایبەتیی، زۆر بە « شێخ عومەر ضیائەددینی ـ تەوێڵە »وە سەرسامبووە. بە شێوەیە، پرشنگی گڕی ڕووناکیی خواپەرستیی و سۆفیگەریی، لە نێو دڵ و دەروونیدا، کڵپەی سەندووە. ئیدی، وردە وردە، تا هاتووە، گڕی ئەو ئاگرە، پتر گڕیگرتووە، تا، بڵێسەی گڕی ئاگری، ئەو ئەڤینە خواییە، کاری لە هەموو گیانی کردووە، لە نێو بیر و هۆشیدا، ڕەگی قووڵی داکوتاوە. بۆیە، لە ڕێی ئەوەوە، هەموو بیر و باوەڕە « لاهوتیی »یەکانی خۆی، لە چوارچێوەی هۆنراوەدا دەربڕیوە و پێی وابووە: ژیانی سەر زەوی، چونکە، نەمر نییە و مرۆ دەمرێ، وەک ژاری مار وایە. بەڵام، ئەو کەسانەی چاکەکارن، دوای ئایدیای بەرز و پیرۆز کەوتوون، کەس نازانێ، بە باوەڕەوە، یا، بێ باوەڕ دەمرن. چونکە، کاتێ مرۆ دەمرێ، گیانی دەردەچێ، تووشی ئازار و سەختیی دەبێ، لەبەرئەوە، خەم و پەژارە دایاندەگرێ!

هەموو شتێکیش لەم گەردوونەدا، ناوێکی تایبەتیی هەیە، کە ناویشی هەبوو، واتە: تارمایی‌شی هەیە و شەش لاشی هەیە: « پێش، پاش، ڕاست، چەپ، سەر و ژێر ».

دیارە، لەشی مرۆش، لەم یاسایە بەدەر نییە، شتێکە و جێیەکی لە هەوادا، بۆ خۆی داگیرکردووە! ئەم لەشەش، لە بەر ناتەوایی دەورویەرەکەی، لەو ڕۆژەوە دروستبووە، لەم کاروانە دووروودرێژەی لەدایکبوون و مردندا، وەک ناوەندی دەرد و بەڵای لێهاتووە.

گیانی مرۆ، لە پریشکێ لە تیشکی ڕووناکیی پاکیی خوا پێکهاتووە. گەر، ئەم پریشکە، بەو خاوێنییەی خۆی بپارێزرێ، تێکەڵاوی کردەوەی خراپ نەکرێ، وەک چۆن، تیشکی پاکی خوا، ئاگای لە هەموو ژیان و بوونەوەرێ هەیە، ئەو گیانەش، هەر بەو شێوەیە، لە هەموو شتێ ئاگاداردەبێ!

ئەم گیانەش، لە زیندانی لەشدا گیردەخوا، چونکە، لە بنچینەدا، دژ بە یەک بوون، وەک مەلێ وایە، لە قەفەزێکدا گیرابێ و ئازادیی لێ زەوت کرابێ! بۆیە، هەر پەلەیەتی، تا، لەم قەفەزە دەرچێ، بفڕێ، ڕزگاریبێ و لە کۆڵ، هەموو شتێکی خراپە بێتەوە.

ئیدی، هۆنەری فەیلەسووف، هەر وا بە کاوەخۆ، بەو شێوە جوان و پڕ لە فەلسەفەیە، لەو هۆنراوە کورتەدا، باسێکی ڕازاوەی، پێوەندیی نێوان، مەلی گیان و لانەی لەش، « ئایدیا و مەتیریا »ی کردووە، مەگەر، هەر لە دەس خۆی هاتبێ، بەو شێوە جوانە، ڕێکوپێکە، بە یەکدی چوواندبن و گوتبێتی:

زەهری مارە عەیشی دونیا، چون، لە ڕێ دایە مەمات  
ئەهلی دڵ بۆ خاتیمە، دایم، هەیە مەبهووت و مات  
تەن لە نوقصانی جهاتا، وەقتی ئیمکان و مەکان  
مەرکەزی دەردە، لە بەینی شەشدەری هات و نەهات  
ڕۆحی لاهوتیی، کە زیندانی تەنی ناسووتییە  
لەم قەفەزخانەی هیولایە، دەکا عەزمی نەجات  
چون حەیظرەی قودس و تەجریدە، مەقام و مەنشەئی  
ئارەزووی پەروازەیە، بۆ ئەوجی ما فەوقی جیهات «368-367،38»

هۆنەر، لە هۆنراوەیەکی دیکەدا، بە شێوازێکی دیکە و لە ڕێی شێخەکەیەوە، لە ژیان و خواپەرستیی دواوە. هەر چەندە، لە سەرەتای هۆنراوەکەوە ویستوویەتی، خەسڵەت و ڕەوشتی بەرز، ناو و نازناوی، هەر چوار جێنشینەکەی « ڕاشدین »، لە شێخی « ضیائەددین »دا کۆکاتەوە، گوایە:
لە ڕاسگۆیی و سەرراستییدا، وەک « ئەبو بەکری سدیق »، بە ناو و نازناو، وەک « عومەری کوڕی خەتاب »، بە میراتگریی باپیرانی، وەک « عوسمانی کوڕی عەفان » و لە خۆڕاگریی و ئازایەتییشدا، وەک « عەلی کوڕی ئەبو تالیب » وابووە!
کەچیی، لەگەڵ ئەو هەموو بەراوردکردنە سەیرانەشدا، هۆنەر، باسی خاڵی « هیندیی »، زوڵفی « چینیی » و ڕوومەتی « ڕۆمیی »، لەگەڵ ئەو خەسڵەت و نازناوانەدا تێکەڵاوکردووە و شێوەیەکی، ڕۆمانسیی پێ بەخشیوە! گوایە:
ئەوانە هەموویان، لە نێو دەسکی شمشێری، وێنەی بڕۆی دایە و بۆ جەنگ ئامادەیە! ئیدی، هەر وا، بە جوانیی « چاوی مەست، نیگای تیژی، باڵای جوان، گوفتاری شیرین و کردەوەی چاک »ی شێخەکەی خۆیدا هەڵداوە!
هۆنەر، وەک ڕووناکبیرێکی سەردەمەکەی خۆی ویستوویەتی، لە ڕێی ئەو باسکردنانەوە، بە شێخەکەی بڵێ: هەموو ئەو جوانیی و پایەیەی هەتە، با، ئەهریمەنی ئارەزوو تەفرەت نەدا و لە خشتەت نەبا. هەولبدە، خەڵکەکی دەوروبەر، لەو گوناح و تاوانکارییانە ڕزگارکەیت، تا، ڕوو لە دەروازەی پڕ سۆزی یەزدان بکەن. بۆیە، بە یازدە دێڕە هۆنراوە گوتوویەتی:

پیری صدیقی طەریق و تاجی فارووقی لە سەر
وارثی عوثمانی ذائەلنورین و کەڕڕاری ئەبات
ڕۆحی شیرینم، لە دەوری قەدی شمشادت گەڕێ
تا تەصەدوق بێ، لە بۆ ڕەدی هەموو دەرد و بەلات
خاڵی « هیند » و زوڵفی « چین » و « ڕۆمیی » ڕووی ڕوومەتت
وان لە قەبزەی قەهری شمشێری بڕۆی جەنگ ئازمات

چاوی مەستت، چۆن لە هەر لا مەردمی دڵ بردووە
بێ دلان بۆ دڵ، لە هەر لا بێتە حاشا، دێنە لات
هەر نگاهێ، سەیقەلێکە بۆ مسی پڕ ژەنگی دڵ
بەل، طەلای خاڵص دەبێتن، مس بە ئەکسیری نگات
گیانفیدای گوفتاری شیرینت، کە عەینی حکمەتە
کەشفی ئەسراری طەریقەت، حەللی کونهی موشکلات
دڵ بە قوربانی، نیگای قەلب ئەلعیانی کاری تۆ
وا دەکاتن قاعدەی حیکمەت، بە تاڵی واثەبات
قامەتی زێبای قیامەت، خیزی تۆ بێ، ببڕێ: ڕێی
مەحشەرێ بەرپادەکا، بۆ سەرخۆشیی جەور و جەفات
کارنامەی خاس، ئادابی طەریقی بەندەگیت
مونتجی حەق ئەلیەقین، قەطعی عەلاقەی مومکینات
فیصلی حەق ئەلیەقین، فەصل ئەلخطابی عارفان
تەرجومانی سڕی ئایاتی، دەلالەت موعجیزات
بێنە مەیدانی صەداقەت « سالما »، قەلبی « سەلیم »
تا موشەڕەف بێ، بە یومنی دەوڵەتی بیری خودات «370-369،38»

* * *

# « حـــــــــــــەریق »

## « 1907 - 1851 »

وەک هۆنەرێکی کـارامــە و پایەبڵند، لە زۆربەی بوارەکـانی، هـونەری هۆنراوەهۆنینەوەدا، دەسـرەنگینیی خۆی نواندووە. پێنووسـە بە پیت و پڕ برشـتـەکەی خۆی، لێ تیژکردۆتەوە و هۆنراوەی، زۆر بە سـۆزی، لە بوارەکانی « ئاین، خوانـاسیی و سـتاییش، سۆفـیگەریی، فـەلسـەفیی، کۆمـەڵایەتـیی، دڵداریی و ئەڤین، سروشت و جـوانیی، شـین و لاوانەوە، گلـلەیی و داشــۆرین، نـامــە و نامــەکــاریی »دا گــوتووە. لە زۆربەی بوارەکـاندا، وەک هۆنەرێکی بە توانا و سـەرنجـڕاکێش، بوونی خـۆی سەلماندووە و سەرکەوتووبووە.

بەڵام، گەر سـەرنجێکی سـەرپێیی، لە سـەرجـەمی هۆنراوەکانی هۆنەر بدەین، زۆر بە ڕوونیی، بۆمـان دەردەکــەوێ: هۆنـراوەی سـتـاییش و پێـداهـەڵدانی ئاییـنیی، خـواپەرسـتـیی و سـۆفـیگەریی، زۆربەی هەرە زۆری، هۆنـراوەکـانـی پێکدێنن. چونکە، لـە لایەکــەوە، (فــەلســەفــەی تەسـەوفـی " مەحویی " و هۆنـەرانی سۆفیی، کاریانتێکردووە و لە سـەر ئەوەشـرا، بیـر و خـەیاڵی نـاسکی " نالیی " ، شـۆڕشـێکیـان لە دڵدا کردۆتەوە.)«7،14»

لە لایەکی دیکەشـەوە، « شـێـخـی بورهـان »، کـارێکی زۆری، لـە بیـر و هۆشـی کردووە، بە شێوەیە، هـەموو دید و بۆچوونەکانی، ئاراستەی ئەو کڵاوڕۆژنە پیرۆزە کردووە!

بۆیە ، بە ئاشـکرا دەبینـین: گــەلێ هـۆنراوەی نـاسک و نـایاب، تـەڕ و پاراوی وەک: « خەوف و ڕجـا، نووری موحەممەد، دڵی غافڵ، خـەرمانی ئەمەل، عەسری خەزەف، مەدینەی ئەمـەل، غونچەی مەقصوود، فەرشی غــەزەل ... »ی هـۆنیــوەتـەوە. لە هـەمـــوو ئەو هـۆنراوانەشــدا، وەک هۆنەرێکی پایەبەرز و دەسـرەنگین، بە زمانێکی شـیرین و ڕەوان دواوە، وردەکاریی و ڕەوانبێژییەکی، گەلێ بەرزی نواندووە، هـەسـتی خاوێنی

خۆی، بەرانبەر « یەزدانی پاک، پەیامبەری ئیسلام، شێخی بورهان و پیاوچاکان » دەربڕیوە و گەلێ ستایشی کردوون.
ئەوەی ئاشکرایە، ئەوەیە: « حەریق »، وەک « سۆفیی »یەک، لە زۆربەی هۆنراوەکانیدا، ناوی « شێخ »ەکەی خۆی هێناوە و بەسەریدا هەڵداوە، یا، هۆنراوەی تایبەتیی بۆ گوتووە. بۆ نموونە:
لە هۆنراوی « ئەسراری سوبحانی »دا، بە سیازدە دێڕ گوتوویەتی:

خەطاباتی بە جەدەل، ئەمڕۆ، یەقینە صەفصەطەی مەحضە
نەتیجەی ئەووەڵی فکرم، قیاسی کەوتە " بورهانیی " «121،14»

لە هۆنراوەی « هەودایەکی خاو »دا، بە نۆزدە دێڕە هۆنراوە، باسێکی گەلێ جوانی، « شێخ »ی کردووە و بە چەن دێڕێ گوتوویەتی:

دەمێکە، چاوەڕێی، سوورمەی غوباری مەقدەمی یارم
لە کۆی « خوبان »ەوە، ئەمڕۆ نەسیم، تۆزێکی هێناوە
کتێبی عیشقی « مەجنوون »، ئایەتی ڕوخساری « لەیلا »یە
لە سورەی « یوسف »ا، دەرسی جنوونی ئێمە نووسراوە
سەرم، کاسی شەرابی، صوحبەتی کاسەی دڵی غەیرە
لە دەردی دووریی ئەم جامە، پەنام بۆ ساقیی هێناوە
کەسێ، فییرەت بڵندبێ، بۆ ڕەواجی سککەی دینی
خەراجی « میسر »ی قەلبی خۆی، بە حوسنی " یوسف "ی داوە
لە سەر سەودای، قوماری شاهی « خوبان »، " پیری بوورهانیی "
بە چەوکانی ئیرادەت، گۆی سەرم، بۆ بازیی داناوە
نمای ڕۆح و حەیاتی من، بە جیلوەی ساقییە باقی
نەوەک، وەک سپڵە، بۆ سفرە، لە دوی نان، چاوی پڕ ئاوە
بە قوربانتبم، ئەی پیری خەراباتی « جیهان ئاباد » !
بە شاهید بە، کەوا ڕۆحم، لە ڕەهنی قوربی تۆ ناوە
لە کۆتاییشدا گوتوویەتی:
هەتا، گۆی پێوەبوو، مونکیر لە زەلکاوی حەسادەتدا
هەزارێ کلکی بگرێ، کەڵکی ناگرێ، تازە خنکاوە
وەکوو پەروانە، بۆ شەمعی جەماڵی تۆ، " حەریق " ئەم شەو
چرای شەقی، بە کبریتی تەبیعەت، خۆش هەڵایساوە «146-148،14»

لە هۆنراوەی « مەدینەی ئەمەل »دا، بە نۆزدە دێڕ، دەربارەی « شێخی بورهان » گوتوویەتی:
قوربان! بە فیدای قاپی، سەگی قاپییەکەت بم
وەبزانە سەگم، ڕامگرە، بۆ حیفظ و حیمایەت
وەک تازی، لە دووی سەیدەوە، من دەبمە طوفەیلی
بەو شەرتە، کەوا بەس، نیگەریت بێ، بە عینایەت
پاشان گوتوویەتی:
" بوورهان، " وەکوو " کەنعان " و " شەرەفکەند " کە « میسر » بوو
کردت بە « مەدینە » ئەمەل و « کەعبە »ی غایەت «14، 152-153»

لە مەسنەوییەکان و « پیرەکەی بوورهان »یشدا، گەلێکی بە سەر یارە شیرینەکەیدا هەڵداوە و لە کۆتایی هۆنراوەکەشدا گوتوویەتی:
ئاوارەی وەتەن و غەریبی کۆی یارم
میحنەتزەدەی دەستی، ڕەقیب و ئەغیارم
تۆ « کەعبە »ی موردات، قیبلەی دنیا و دینم
جارێ دەرکەوە، با، بالآکەت ببینم
مەقامی عاشقان، صەدای قەد، قامەتە
بە نەوای حەزینم، ڕاستی قیامەتە
بە شێوەی شیرینت، سەد « فەرهاد » دڵ کەیلە
هەزار « مەجنوون »، سەودای زوڵفی « لەیل »ە
بۆچ، هەر من مەخمووری، بادەی دیدەی مەستم
یا، هەر من، سەرمەستی جامەکەی « ئەلەست »م؟
لە لای خۆی « حەریقیی " ! شەمعی ڕووی « خوبان »م
گیرۆدەی زنجیری، " پیرەکـــــەی بوورهان " م «14، 168-170»

« حەریق »، وەک خواناسێکی گەورە، لە لووتکەی ستاییش و پاڕانەوە، فەلسەفە و سۆفیگەریی تێپەڕاندووە. بۆیە، لە هێندێ هۆنراوەدا، گفتوگۆی لەگەڵ خوا کردووە. لە هۆنراوەی « خەوف و ڕجا »دا، بە سیازدە دێڕە هۆنراوە، بە شێوەیەکی زۆر جوان و وەستایانە، ئەسپی بیر و ئەندێشەی خۆی تاوداوە، دەربارەی دەروونی خۆی گوتوویەتی:

خۆفم لە خودا، چونکە، لە بەر غەیری خودایە
ئەمنم بە درۆ، سورەتی وەک خەوف و ڕجایە
پالّی ڕەحەتی داوەتەوە، نەفسی خەسیسم
یا، ئەمنی غەنا، یا، ئەسەری یەئس و هەوایە «107،14»

هەروەها، لە هۆنراوەی « دلّی غـــافلّ »دا، بە دوازدە دێڕە هۆنراوە گوتوویەتی:
خەیالّت، مونحەصیربوو، ئەی دلّەی غافلّ لە دنیایە!
نەدامەتبوو، نەتیجەی ئاخریی، ئەم شۆڕ و غەوغایە
ئەوا لازمبوو سەرخۆشیی، لە تۆ ئەی دلّ! کە سەرخۆشی
بە بادەی غافلّیی بێ هۆشیی، دەردت قەت شفای نایە
عەجەب !بۆت بۆتە زستان، زەمهەریری باری عصیانت
کە شک نابەی چ سەرمایە، دەلّێی: وەیوەی، چ سەرمایە!
پاشان گوتوویەتی:
هەتا، شەیتان مودەببیربێ، موئەددیب نەفسی زالّم بێ
عەجەب ! کەوتۆتە دەست زالّم، ئومموورت عەینی ظولّمایە
خودا! ڕەببی نەجاتمدەی، لە دەس ئەم دێوی بێ ڕەحمە
کەوا، وەک دوژمنی خوێنی، بە داییم، لێم بە داوایە «117،14»

لە هۆنراوەی « خەرمانی ئەمەل »یشدا، بە ئاشکرا، سۆز و ئەوینی سۆفیگەریی و خواپەرستیی، تێدا دەردەکەوێ، وەک مانگی چواردە، لە ئاسۆی بیر و هۆشیدا دەدرەوشێتەوە. بە سۆزێکی ئەوێندارانەی ڕاستەقینەوە، بە کولّودلّێکی « سۆفیی »یانی جەرگ هەلّپڕوکاوەوە، بە حەوت دێڕە هۆنراوە گوتوویەتی:
لە خەرمانی ئەمەل، مێرووی عەمەل، جەذبی نەکرد دانێ
لە ذەیقەتخانەدا، ترسم هەیە، ئاخر سەری دانێ
دەلّێن: جەردەی ئەجەل، ڕێگا بە کاروانی نەفس دەگرێ
شەقامی سینە دەبڕێ، بۆ مەتاعی دیدە دەڕوانێ
طەریدەی نەفس و شەیتان، قافلّەی طاعاتی غارەت کرد
ئەگەر، جاسووسی ئیمانی نەبێ، دەر ناچێ ئینسانێ

تەرازووی طاعەتت لەنگە، هەتا کەی ئەم سەر و ئەو سەرتە؟
بە پارسەنگی حەیا، دەسهەڵبڕە، بنوارە میزانێ
بەسی بێ طاعەتی ڕووکەش، مەلەک، صەڕڕافی ئەعماله
موحەصیل نەقدی قەڵب و نارەوا، ناباتە دیوانێ
ئەوا، بەردی ئەجەل هات و لە شووشەی عومری دا، ساقی!
بە قوربانی، پیاڵەی چاوەکەت بم، تێکە فنجانێ
حەیات، خۆ چوو، لە نێو جامەی حەیاتی عارییەت، بێ عار
ئەوە داوایدەکەن، چ بکەم؟ " حەریق " ! ڕێگەی ڕجا کوانێ؟ «127،14»

لە هۆنراوەی " نوری موحەممەد " یشدا، زۆر بە شێوەیەکی جوان، بە شازدە دێڕ، باسی گەورەیی و خۆشەویستیی، پەیامبەری ئیسلامی کردووە و گوتوویەتی:

بەو نوورە، کە ظاهیربوو، لە سەر ڕووی موحەممەد
عالەم هەموو، ئاشوفتەبوو، وەک مووی موحەممەد
مەخجوول و سەرەئەفکەندەیە، نەسرین و وەنەوشە
بۆ مووی سەمەن، بۆی دوو گێسوی موحەممەد
مەجزووبە، هەموو کەس، بە ڕەمووز و بە ئیشارە
مەجبوورە، لە دەس ساعید و بازووی موحەممەد
سەرووی چەمەنیش، پێی لە گڵ و خاری غەمایە
لەرزانە، لە حەسرەت،-قەدی دڵجویی موحەممەد
لالەش، وەکوو من، سینەی پڕ حەسرەت و داخە
تا دیویەتی، ڕوخسارەیی گوڵ، بوێی موحەممەد
عالەم، وەکوو من، جەرگی بڕاوە بە نیگاهـ و
ڕەمکردن و ئیستادەنی، ئاهوویی محەممەد
ڕۆح و دڵ و دینت هەیە، هەر سێکی " حەریقیی "
سەرفیکە، لە ڕێی وەسف و سەناجۆیی موحەممەد «108،14»

* * *

# « خەلیل منـــــــــــەوەر »

## « 1923 - 1863 »

« منەوەر »، یەکێ لە ڕووناکبیر و هۆنەرە کوردە دیار و ناودارەکانی، نێوچەی « گەرمیان »ی « باشووری کوردستان » بووە. بە هۆنەرێکی میللیی، سەردەمەکەی خۆی ناسراوە. گەلێ هۆنراوەی کورت و درێژی، « ئایینیی، دڵداریی، کۆمەڵایەتیی و داستانەهۆنراوە »ی گوتووە.
هەر چەندە، گومان لەوەدا نییە، « خەلیل منەوەر »، هۆنەرێکی کورد بووە، بەڵام، گەلێ هۆنراوەشی، بە زمانەکانی « عەرەبیی، فارسیی و توورکمانیی » داناوە. دوور نییە، هۆنەر، بەرهەمی بەو زمانانە، لە زمانە نەتەوەیییەکەی خۆی پتربێ!
« خەلیل منەوەر »، لەگەڵ ئەوەشدا، موسوڵمان نەبووە، لە سەر ئایینی « کاکەیی » بووە، بەڵام، زۆر باوەڕی بە یەزدان و پەیامبەرەکەی هەبووە. چەن هۆنراوەیەکی ئایینیی، بۆ هۆنیونەتەوە.
لە هۆنراوەکانیدا، لە یەزدان پاڕاوەتەوە، لە گوناهەکانی خۆشبێ. ستاییشی پەیامبەر و یارانی، پیروپیاوچاکانی ئیسلامی کردووە. باوەڕ ناکەم، هیچ ناموسوڵمانێ، بەو شێوەیە، هۆنراوەی بە سەر یەکێکی وەک پەیامبەری ئیسلام و یارانیدا هەڵدابێ! هۆنراوەی تایبەتیی، بۆ ئیمامی « عەلی » گوتبێ!
هەر چەندە، زمانی نووسینی هۆنراوەکانی، زۆر پوخت و پاراو نەبووە، بە کوردییەکی تێکەڵاو بە عەرەبیی، هۆنراوەی هۆنیوەتەوە. بەڵام، لەگەڵ ئەوەشدا، چەن هۆنراوەیەکی ئایینیی جوان و بەرزی هەیە.
با بزانین، هۆنەر، بە چ شێوەیە، ستاییشی پەیامبەری کردووە؟ بە چ زمانێ، لێی پاڕاوەتەوە؟ هۆنەر، بە چامەیەکی حەفتاوپێنج نیوە دێڕیی، « موناجات بەر دەگاهی قازی ئەلحاجات »، زۆر بە کوڵودڵەوە، پاڕاوەتەوە و گوتوویەتی:

ڕەحمان ئەلڕەحیم، ڕەحمان ئەلڕەحیم
بە نام یەزدان، ڕەحمان ئەلڕەحیم
قادر و قەهـهار، وەهـهاب و عەلیم
واجید و ماجید، حەکیم و سەلیم
صەبوور، سەتتار، عالم غەیبەن
خەڵقندەی ذی ڕۆح، بێ شک و ڕەیبەن
« سائر ئەلعیوب »، خاص و عەوامەن
رازق دەهەندەی، کوفر و ئیسلامەن
زینەت بەخش، نوور هەفت ئاسمانەن
« حەی لا یەموت »، هەم لا مەکانەن
نیگەهدارندەی، ماهی و بەقەرەن
رەونەق نومای، ئەوج چەرخ ئەخضەرەن
خودای لامەکان، حەی خەللاقەن
ئەووەڵ و ئاخر، موعطی ڕەززاقەن
خەڵق کەرد، خەللاق، « شەدید ئەلعقاب »
« موحەمەد » چە نوور، « ئادەم » چە توراب
چە شەرافەتی، نەبیی موورسەل
سازا طەیر و جین و ئینسان و چەبەل
ئەمرکەرد وەعام، مەعبوود ئیلا
پەی « ئەشهەد ئەنە لا ئیلاهە ئیلا ڵڵا »
پەی شاهیدی، شان فەخر ئەنبیا
« موحەمەد عەبد و ڕەسولە ڵڵا »
ئیمانم هەنەن، خواوەند یەکەن
موحەمەد رەسوولی، بێ رەیب و شکەن
« خاتەم ئەلموورسەلین »، گشت پێغەمبەرەن
« شافیع ئەلئومە »، ڕۆژ مەحشەرەن
لە شەریفی نوور، ڕەسوول مەننان
ئەنگوشتەر ئاما، پەرێ « سولەیمان »

ئیدی، هەر بەو شێوەیە جوانە، لە سەر پێداهەڵدان و ستاییشی خۆی، بەردەوامبووە و پێیدا ڕۆیشتووە، تا دواتر گوتوویەتی:

خولاصه، جه نوور « ڕەسوول ئەلئەمین »
خەلق بی ذی رۆح، سەما تا زەمین
حەق بەوێش واتەن: « لەولاک لەولاک »
یا ڕەسوول لّلا، ما خەلەقت ئەلئەفلاک »
دنیا فانییەن، نەدارۆ بەقا
فائیدەش نەوی، وە « ڕەسوول لّلا »
وەفاتکەرد، رەوضەش جە ئەرضدا قەرار
ئەهل و بەیتش بی، ئەسیر کوففار

پاشان، هاواری لێ هەستاوە، پەنای بۆ پەروەردگار بردووە، کەسێ نەماوە، دامێنی نەگرێ، بە « یەزدانی گەورە، پەیامبەر و یارانی، هەموو پەیامبەران و پیاوچاکان، حەسەن و حوسێن، جەنگی ئوحود و حونەین، فاتیمە و خەدیجە، غەوسی گەیلانیی، سی جزمەی قورئان، ڕوگەی ئیسلام و قودس، ڕۆژهەلات و ڕۆژاوا، تیپی شێخان و هاوڕێیانی ئەشکەوت، ڕۆژی هەینیی و مانگی ڕەمەزان، پێنج فەرزە و خدری زیندە، هەر چوار ئایینزاکەی شافعیی، نەعمان، مالکیی، ئەحمەد » و گەلێ ناو و شتی دیکە سوێندیداوە، کەسێ، یا شتێکی پیرۆز نەماوە، دەس بە دامێنیانەوە نەگرێ، لە گۆڕی پڕ لە هێمنیی خۆیاندا، گیانیان ڕا نەچڵەکێنێ، هەموویانی، بە گژ خوادا کردووە، تا تکای بۆ بکەن و ئەویش، لە گوناهەکانی خۆشبێ، ڕووی لەو دەروازە گەورەیە ناوە و گوتوویەتی:

یا ڕەب ! بە حاجەت، چار یار نەبی
« عومەر و عوثمان و بووبەکر و عەلی »
یا رەببی ! بە حەق جەمع ئەنبیا
بە شەرافەتی سیلک ئەتقیا
بە ویرد و تەوحید، زومرەی ئەصفیا
بە صیدق ئیخلاص، گرۆی ئەولیا
بە شەرافەتی « حەسەن و حوسەین »
بە جەنگ و غەزای « ئوحود و حونەین »
بە ئەشک دیدەی، « فاطیمە »ی زەهرا
بە صادق صیدق، « خەدیجە »ی کوبرا

یا ڕەب ! بە حاجەت ئەولادەی ڕەسوول
هەفتادودوو تەن، شەهید مەقتوول
یا ڕەب ! بە حاجەت، ئەو « غەوث گەیلان »
یا ڕەب ! بە حاجەت، سی جزمەی قورئان
یا ڕەب ! بە حاجەت، قیبلەگای لەطیف
بە شەرافەتی، قودوس شەریف
پاشان، کۆتایی بە « یا ڕەب »ەکەی هێناوە و گوتوویەتی:
یا ڕەب! بە عەدەد ڕەحمەتت تەمام
دروود بەر « محەمەد »، شای « خەیر ئەلئەنام »
ببەخشە گونای، ئەی بەندەی ئەحقەر
« خەلیل » مەخدوم، « خدر منەوەر »
پاشان، پاڕانەوەکەی بە دوو دێڕ هۆنراوە کۆتاییپێهێناوە و گوتوویەتی:
هەر کەس ئی کتاب، جارێ بوانۆ
فاتیحە بە ڕوح، ڕەسوول بکیانۆ
هەزاران دروود، هەزاران سەلام
زما بەر « موحەمەد »، عەلەیهی ئەلسەلام «42-37،65»

بە هەشت دێڕیش، ستاییشی « ئیمام عەلی »ی کردووە و گوتوویەتی:
« عەلی »، کە داماد، ڕەسووڵ ئەڵڵا بوو
وەصی ڕەسووڵ و وەلی ئەڵڵا بوو
« ئیبن عەم » پاک، ذات ڕەسووڵ بوو
هەم شیر خواوەند، حەی ئەلبەتوول بوو
خەلیفەی ڕەسووڵ، هەم چوار یار بوو
وەی ڕوتبەی سابق، چە عام ئیزهار بوو
لە کۆتاییشدا گوتوویەتی:
هەر کەس وەی گوفتار، ئەر نەبۆ قانیع
ڕەحمەت جە دارین، لێش مەبۆ مانیع
مەعلووم کە مورتەد، ڕووی سەر زەمینەن
خەسەرە ئەلدونیا و ئەلئەخیرینەن «43،65»

* * *

# « پیرەمێـــــــــــــرد »

## « 1950 - 1867 »

« پیرەمێرد »یش، وەک خواناسێکی ڕاستەقینە و موسوڵمانێکی سەر ڕاست، هێندێ هۆنراوەی ئایینیی هۆنیوەتەوە. زۆربەشیانی، بە ناوی « نالەی پیری پیران »وە گوتووە. یەکێ لەو هۆنراوانەی ئەوەیە، ساڵی « 1937 »، بە نۆ نیوەدێڕ گوتوویەتی:

خوایە! هاوارم، تەنیا بە تۆیە
تۆ نەبی، عالەم، بە چڵ و چۆیە
دوو باڵم بەرێ، کە پێی بفڕم
باڵی، دوو تەیری نەحسی، پێ ببڕم
یەکەم: کۆلارەی تەماعی نەگبەت
دووهەم: سیسارکەکەچەڵەی شەهودت
ئەگەر، ئەو دوانەم توانی، باڵشکاند
نێچیری مەردیم، لە دنیا فڕاند
خۆ ئەگەر هەروا، ئەم دوانەم سواربێ
ئەبێ، ناوی من، کەری ژێر بار بێ
خوایە! وا من خۆم، تەماعم ناوێ
فەرموو، ئەو، وازم لێ بێنێ، تاوێ
ڕووبکاتە شوێنێک، کە ئەویان ئەوێ
شەو و ڕۆژ، دڵیان، بۆ ئەو نەسرەوێ
تەماع، پارەیان پێ کۆبکاتەوە
هەتا لە تۆیان، دوورئەخاتەوە
لە بەر مەرگ، حاڵی دنیا ئەگۆڕێ
خۆ دیارە، پارە ناچێتە گۆڕێ

«366-365،11»

هەروەها، لە هۆنراوەیەکی دیکەدا گوتوویەتی:

ڕەهنومای گومبووی، هەردەی هەوایی
ئەلەکتریکی تەلی بینایی
ڕێم لێ شێواوە و کردەنشینم
بینایم لێڵە و تۆی پێ نابینم
ڕێگام نیشاندە، پادشای بزوورگ
گورگی بۆزت کرد، بە دەلیل بۆ « توورک »
« یونس »ت، لە ناو زکی ماسیدا
ژیان و چرای، لیقای خۆت پێدا
ئەو « لا ئیلاهە ئیلا ئەنتە »ی ووت
بەزەییت پیاهات، ڕەحمت بۆی بزووت
من لە ئەزەلدا، ئەمەم کردەبەر
بۆیە، باوەڕم کرد بە پێغەمبەر
ناشمەوێ، ببم بە فرستادەت
تەنیا سەرخۆشبم، بە نەشئەی بادەت
هۆشێکت داومێ، کە دنیام نەوێ
خۆشەویستیی تۆم، ئەگەر بەرکەوێ
با ووجود، قەهرت پیاو دەسووتێنێ
کەڵکی خواردنی، خۆشی نامێنێ
قەیناکا، ئیتر، هیچی خۆش ناخۆم
تەنیا، مەیلێکی خۆت، بنێرە بۆم «11، 366-367»

لە هۆنراوەیەکی دیکەشدا، بە بیستویەک نیوەدێڕ گوتوویەتی:

خوایە! ئەوانەی کە بێ باوەڕن
هیچیان نەدیوە، وا هەڵەوەڕن
ئەگینا، سەیری باغێکی گوڵ کەن
تەماشایەکی بە عەقڵ و دڵ کەن
ئەو ڕەنگە جوانەی، پەڕەی « هەرجایی »
بە زەڕەبینی، تیشکی بینایی
لێی وردبینەوە، کە لەو صنعەتە

کێ دەڵێ، زادەی خووی تەبیعەتە؟
کەلای « گوڵپەسەند »، کام مەقەست بڕی؟
« پەردەعروسیی »، کێ پەردەی دڕی؟
کێ هات، لاولاوی بە دارا ئالان؟
کام دەست، گەردنی وەنەوشەی شکان؟
ئەمانە، نەیسا بڵێین: بێ گیانن
مادەیەک ڕوویدا، زۆر کەس ئەیزانن
ئاغای شیوەکەڵ، یەکێکیان تیابوو
کە ئاغال ئاغای، « قادر ئاغا »ی ناوبوو
پێی برینداربوو، لێی کرد بە خۆرە
ئەهاتنەسەری، حەکیم بە نۆرە
ڕۆژێک، « مەولەویی »، حەکیمی « بانە »
پێی ووت: ڕەحمەتبێ، بەم منالانە
ئەم دەردە پیسە، ئەتەنێتەوە
پیاو ئەبێ، لێیان دوورکەوێتەوە
ئاغا، لە دوور دێ، چووە بن دارێک
ڕاکشا و ڕوانی، بۆی کشا مارێک
ئەمیش بێزاربوو، چاوی لێ قووچان
تا هاتە سەر پێی، خۆی هیچ نەجوولان
هەر چەندە، خەڵک و خوا، لە دوور پەیدابوو
تا ئەوان هاتن، مار پێوەیدابوو
پێی چاکبووەوە، وەک دۆخی جاردی
خۆ ناڵێین: ئەمەش تەبیعەت ناردی؟
بەردە زلەکەی، ناو ئاوی « دووکان »
کە بۆ ئەندازەی، ئاو بووە بە نیشان
شارە مێرووولەی، لە ناودا ئەژی
ئەویش، تەبیعەت هێناویەتەدی؟
ئەم ئاسمانە، کە بێ ستوونە
بۆ کردەوەی تۆ، بوو بە نموونە
چەرخی ماکینەی، ئەم ڕۆژ و شەوە

بێ هەڵم و بەنزین، ئەسووڕێتەوە
چەرری پێ ناوێ، هیچ ژەنگ ناگرێ
لێک هەڵ ناوەشێ، دەستی تێ نابرێ
ئاش، بێ ئاش وەستا نانرێتەوە
گاجووت، بێ جووتیار ناگەڕێتەوە «372-370،11»

لە هۆنراوەیەکی « خواناسیی » بەرزی دیکەشدا، بە دە دێرە هۆنراوە گوتوویەتی:

ئەگەر، خوات ناسی، بپارێزەوە
بە زمانی خۆت، بلاڵێرەوە
خوای گەورە و بزوورگ، پادشای بێ نیاز
بێ هاویەش، بێ کەس، بێ شوێن، بێ هامڕاز
تێگەیشتنت دامێ، تێتبگەم
پێم لێ نا، هەر تۆی، بێ زیاد و کەم
چاوم هەڵبڕی، ئاسمانم دی
ووتم : بێ وەستا، نەهاتۆتەدی
ئەگەر، کردەوەی، بێگانە بووایە
خۆ ئەشیا، بێ ستوون، ڕا نەوەستایە
دیارە، هەر چەرخێک، پیاو دروستیکا
کاتێکت زانی، سوا و تێکشکا
چەرخی ماکینەی، ئەم ڕۆژ و شەوە
بێ هەڵم و بەنزین، ئەسووڕێتەوە
چەوریی پێ ناوێ، هیچ ژەنگ ناگرێ
لێک هەڵ ناوەشێ، دەستی تێ نابرێ
هەر لەو ڕۆژەوە، کە تێکخراوە
هێشتا جەڕێکی، لێ نەسواوە
هەر بەو پێودانە، کە بۆت داناوە
وا دێت و دەچێ، هیچ نەسواوە
بێ گوڕە و بڕە، بێ چرپە و بێ دەنگ
تێکڕا لە کاران، یەک ڕەنگ، یەک ئاهەنگ

تۆ نەبوویتایە، چۆن تێک ئەخرا
ئەمانە لە کوێ، پێکەوە ئەنرا؟؟
چۆن چەرخی گەردوون، بێ دەستی وەستا
لە کاردا ئەبوو، هەتاکوو ئێستا
ئاش، بێ ئاش وەستا، ناسووڕێتەوە
گا، بێ هۆی جووتیار، ناگەڕێتەوە
سەد هەزارهەزار، ئەستێرەناسان
ئەو دیو خێوەتیان، نەدی بە ئاسان
منیش ئەگەڕێم، کە تۆ بناسم
ناتدۆزمەوە، کوێر و کەساسم
چاوێکم بەرێ، تۆی پێ ببینم
« ئەڕانی » بێژ نیم، کردووە بیبینم
دەستم پێ گرتووە، شەرمنەدەم مەکە
بۆ بەخشین، گوناهی زۆر و کەم یەکە
« هەر کردەوەیەک، لە من ڕوویداوە
لە پێش کردندا، لای تۆ نووسراوە »
کە لەو تەختەیەی، لای تۆ نووسرابێ
کێ ڕێی دەکەوێ، بڵێ: وا نابێ! «378-376،11»

* * *

# « ناریـــــــــــی »

## « 1944 - 1874 »

هۆنەر، بەشی هەرە زۆری هۆنراوەکانی، بۆ باسی « جوانیی، ئەڤین، ستاییشی ئایینی و نیشتمانیی » تەرخانکردووە. بە پلەی یەکەمیش، پتر، خولیای ئەندێشەی ناسکی ڕۆمانسیی بووە و (گوڵدەستەی هۆنراوەی « نالیی »، ئەوەندەی تر، دەماخی چاخکردووە.) هەروەها، (فەلسەفەی تەصەوفی « مەحویی »، کاریتێکردووە.)«485،38»

لەبەرئەوە، هێندێ هۆنراوەی ناسک و نایابی، بۆ بنەماڵەی شێخانی « قادریی » و « نەقشیی » هۆنیوەتەوە و بە سەریدا هەڵداون!

هەڵبەتە، « ناریی »، زۆر بە شێخی « سیراجەددین »ەوە سەرسامبووە، بۆیە وا، چەندین هۆنراوەی وەک: « سەری بێی موو، نەرگس و ڕیحانە، کاسەی نەبات، خوار و ژوور، پووشوپەلاشی شارەزوور، ئەشکی ئاڵ و لەعلی ئەسرین، خەرمانی غەم، بولبول و گوڵ، شینی بولبول و سێوی ئاڵ »ی، بۆ هۆنیوەتەوە، پێیدا هەڵداوە، باسیکردووە و گوتوویەتی:

دەبێ، بۆچی بکەن باوەڕ، کە عالەم دوژمنی « شێخ »ە
شەککەر، ئەو وەختە مەقبوولە، کە هەمدەمبێ لەگەڵ چادا
وەکوو « من »، بۆ غولامی حەزرەتی شاهی « حیسامەددین »
ئەگەر چی، سۆزی پەروانە، شوعاعی، قەت بە شەم نادا

باشان گوتوویەتی:

عەقیدەم ثابتە و باطڵ نییە، ئێژم: هەتا ماوم
لە هەهنگامی فیراغەت، یا، لە وەختی شۆر و غەوغادا
« بەهائەددین »ە مەولامە، « حیسامەددین »ە ئاغامە
چ ئاغایێ، کە سوڵتانی بە فەڕاشانی درگادا «36-33،61»
ئەی، ئەمن قوربانی، خاکی خانەقات
قوطبی کامیل، مورشیدی شیرین صیفات !

شاهی تەختئارای، موڵکی مەعریفەت
شەمعی پڕتەوبەخشی، ئەربابی نەجات «64،61»
ئەی پادشاهی مەملەکەتی، خەڵوەتی حوضوور !
قوطبی مەدار و مەرکەز و مەقصوودی « خوار و ژوور »
دارایی تاجی، مەسنەدی ئیقلیمی مەعریفەت
دانا، بە سۆزەی دڵی عاشقانی دوور
هەر وەک، مەقامی عیززەت و ئیدراکی پاکی تۆ
حوسنت، لە چاوی مونکیری، ناپاکی بەد بە دوور
چۆن بوو، پیادەی شاهی ڕوخت، نیسبەتی نەبوو
ماوم لە ماڵی « کوڵبی » غەما، تا، بە نەفخی سوور
عاریف، کە « کاکە شێخ »ە، بە ئەوضاعی حاڵی من
شەرح و بەیانی بەختی بەدم، کەی دەبێ، ضەروور «68-67،61»
لە حەلقەی فەوجی، دەرگاهی « عەلائەددین »ی « عوسمانیی »
قبووڵی خاتری پاکی، « ضیاء ئەلحەق »قی والیدەینم
بە شەرطێ، دەوڵەتی لوطفت، حەواڵەی حاڵی « ناریی » بێ
بە دڵ بێ باک و موستەغنیی، لە موڵکی « چین و ماچین »م «86،61»
بە « مەولا »، گەر لەمەولا، دڵ بە قوربانت نەبێ، نابێ
بە دڵ، گەر دڵ موطیع و بەندەفەرمانت نەبێ، نابێ
کەسێ، مەقصوودی کەسبی دەوڵەتی، قوڕی موحیببەت بێ
غولامی، بۆ غولامانی، غولامانت نەبێ، نابێ
لە کۆتاییشدا گوتوویەتی:
سەرم: سەمتووره، سینەم: نەی، سوراحی: دیدە، ئەشکم: مەی
مەزەی مەی، یا، نەوای نەی، لە دیوانت نەبێ، نابێ
لە بۆ گوڵ، شۆری بولبول، شۆڕشی توتیی، لە بۆ شەککەر
بە شەوقی شەهدی، لێوی شەککەر ئەفشانت نەبێ، نابێ
بە لالەی مەعریفەت، تەعمیری قەطعەی « باغەکۆن »ی دڵ
هەتا، مەعمووری بەستی فەیضی، ئیحسانت نەبێ، نابێ
لە ڕۆژی کەشمەکەشەدا، « ناریا »، هەرگیز نەجاتی نابێ
« حیسامەدین »، کەفیلی یاری عیصیانت نەبێ، نابێ
«143-142،61»

هۆنەر، لە هۆنراوە ئایینییەکانیدا، سەرکەوتنێکی زۆری بەدەسهێناوە. لێرەدا دەبینین: لە ستایشێکی بەرزی ئایینیدا، چامەی « تاقی کیسارا »ی، بە حەڤدە دێڕ هۆنراوە هۆنیوەتەوە و گوتوویەتی:

سورەتی « یاسین »، کە وەصفی حەزرەتی لەولا ئەکا
ئەهلی دڵ، مایل بە جیلوەی، سورەتی « طاها » ئەکا
خاکی بەر دەرگاهی قەصری، گەر بە سەرداکا، گەدا
هەر نەفەس، نەفرەت لە تاجی « قەیصەر » و « دارا » ئەکا
ئاسمان وەک موشتەریی، هەر دەم بە میزانی وەفا
کەسپی « هەرشاهی » بە یادی، دەوڵەتی « ئەسرا » ئەکا
گەر تەصەووڕکا، « مەسیح »ی تەختی عەرشی ئەعظەمی
تا ئەبەد، تەرکی بەیانی، رەفعەتی « عیسا » ئەکا
نوری عەشقی تۆ، لە سەر « طوور »ی دڵی « موسا »، مەگەر
وا لە سەر سینەی، بە شەوقی دڵ، یەدی بەیضا ئەکا
بۆ خەلیلان، گەر نەسیمی گوڵشەنی لوطفت ببی
ناری « نەمرود »ی، بە سەحنەی « جەنەتولمەئوا » ئەکا
تاقی « کیسرا »، بۆ بە بەرقی نووری حوسنی شەق نەبێ
سەیلی حوکم و ناری « فارس »، زاییل و ڕیسوا ئەکا
ئەی حەبیبی خالقی عالەم! لە « ئادەم » تا بە تۆ
ئەنبیا یەکیەک، بەیانی حەزرەتی والا ئەکا
نەرگسی مەستی سیاهت، عەینی ما ذاغە ئەلبەصەر
شەمعی بێ سایەی وجودت، شەرحی کەرەمنا ئەکا
ئادەمی خاکی، بە سەر زوومرەی مەلەکدا بێ گومان
تۆی سەبەب نازش، بە روتبەی عیلم ئەلئەسما ئەکا
کاشفی و ئەللەیلە و تورەی بەرچەمی شەبرەنگی تۆ
ئافتابی طەلعەتت، تەفسیری و ئەلضحا ئەکا
ئایەی میعراجی، پایەی قاب قوسێنت، عەجەب
وەصفی ئیعزازت، لە تەختی نازی « ئەوادەنی » ئەکا
عەکسی ئەلفی قامەتی ئەبرۆتە، گەر « نون و ئەلقەلم »
صدقی مەضمونی کەلامت، کەشفی « ما ئەوحا » ئەکا

با وجودی پرتەوی، میهری جەمالی ئەنوەرت
کێ خەیاڵی زیبی قەصر و سایەی « طوبا » ئەکا
سەلسەبیلی لوطفی تۆ، بێ شک لە عەرصەی مەحشەرا
تیشنەلەب قانع، لە بادەی جامی « ئەعطەینا » ئەکا
چی لە دەوڵەت کا، ئەسیری بەندی عەشقی « ئەحمدیی »
عیشقی « مەحموودیی »، بە عاشق کەسبی « ئیستغنا » ئەکا
« ناریا » ! وەصفی جەلالی حەزرەتی خیرولبەشەر
کەی بە سەد دەفتەر، هەتا مەحشەر، بە شەر « ئینشا »ئەکا؟
«19-17،61»

هۆنەر، لە هۆنراوەی « ئوستادی ئەزەل »دا، بە شێوەیەکی زۆر جوان، باسێکی دەسەڵاتی یەزدانی کردووە، بە فەلسەفەیەکی بەرز و پڕ بەها، ڕازاندوویەتییەوە و بە نۆ دێڕە هۆنراوە گوتوویەتی:

ڕەفیقانم، هەموو ڕۆیین، لە دێدا
بە تەنیا، هەر ئەمن ماوم، لە جێدا
لە بەر دونیا، نەما، یادی قیامەت
خودا، چی بکەم، لە میدا، یا، لە ویدا
« قەضا »، ڕۆژێ، شکستیدا بە مەردان
کە بەیداخی جیهانگیریی، بە « میی » دا
کە مەنزل، عارییەت بێ، عارە مەیلی
خەراری، خاری خوواری لە ڕێدا
بە هەر کەس، تا نەدا، نەقدی هەموو غەم
بە کەس مشکول عەزیزم، در همی دا
کەسێ دەرچوو، لە داوی مەکری دونیا
کە مەردانە، طەڵاقی سێ بە سێ دا
بەڵێ، تەقسیمی « ئوسرادی ئەزەل » بوو
بە « دۆڵاش »ی خەلە و ئاوی بەنیی دا
سەفەر « مەولامە »، تا ماوم، لە مەولا
کە کەوش و گۆرەویی و تۆزی، بە پێ دا
بە میزانی شەریعەت، صەعبە « ناریی »
مەداراکەی، لە بەینی دوو هەویدا «32-31،61»

هۆنەر، بە یازدە پێنجخشتەکیی، هۆنراوەیەکی گەلێ شیرین و نایابی، لە سەر هۆنراوەیەکی « تایەر بەگی جاف » هۆنیوەتەوە، ستایشێکی جوانی پەیامبەری کردووە و لە سەرەتادا گوتویەتی:

ئەی شاهەنشاهی شکۆهی، عیززەتی ڕووی زەمین
گەوهەری تاجی ڕیسالەت، شەمسی بورجی موورسەلین !
زینەتی نووری نبووەت، تاجداری موڵکی دین
(مەطلەعی صوبحی سەعادەت، مەظهەری صیدق و یەقین
ئەی سوپەسالاری، فەوجی ئەنبیا و موورسەلین !)*

پاشان، لە چوار ـ شەشەمین پێنجخشتەکییدا گوتوویەتی:

من گەدا و بێ نەوا، تۆش خاوەنی گەنج و کەریم
من نەخۆشی بێ دەوا و تۆی، دەوابەخش و حەکیم
چی لە هەنگامەی « جەزا » کەم، بێ هەوا خواه و نەدیم
(ڕوو لە کێ کەم، غەیری تۆ، ئەی شافیعی زومرەی ئەثیم؟
من گوناهبار و خەجاڵەت، تۆ « شەفیع ئەلموذنبین »)
یا بکەم شێوەن، لە داغی باغی عومری بێ ثەمەر
دەستەئەژنۆ دابنیشم، وەک هەتیوی بێ پدەر
یا، بە ئەشکی دیدە، تەڕکەم خاک و خۆڵی ڕەهگوزەر
(خۆ لە قوڕ بگرم، بە جارێ، هەر لە پێ، تا تەوقی سەر
بەڵکوو، لوطفی شاهی لەولاک بێ، نەجاتمدا لە شین)

لە کۆتاییشدا گوتویەتی:

« ناریا » ! ئامادەبە، نەزدیکە، هەنگامی سەفەر
مەنزلت دوور و درێژە، چۆڵە ڕێگەت، پڕ خەتەر
تا بە کەی، غەفڵەتنۆشینی خاکی، ئەی خاکت بە سەر؟
(ڕوو لە « ڕەوە »ی « مصطەفا » کە، بێژە: « یا خەیر ئەلبەشەر » !
نیمە توێشەی ڕێگە، جوز ئیخلاصی ئالی « طاهیر »ین) *
«105-102،61»

* * *

---

* جیاوازیی لەگەڵ دێڕە هۆنراوەکانی « تایەربەگ »دا هەیە. پاشان، ئەو جیاوازییە دەردەکەوێ. بۆیە، چۆن لە دیوانەکەدا نووسرابوو، هەر بەو شێوەیەش نووسیمەوە!

# « تایەر بەگی جــــــــــاف »

## « 1917 - 1875 »

هۆنەرێکی باڵادەسبووە. لە زۆربەی هۆنراوەکانیدا، لە باسی دڵداریی و ئەڤین دواوە. لەو بوارەدا، گەلێ دەسڕەنگین و سەرکەوتووبووە. هێندێ، هۆنراوەی ئاییینیشی گوتووە.

« تایەر بەگ »، بە چوار دێڕە هۆنراوە، ڕووی دەمی لە پەیامبەری ئازیز کردووە، بێ کەسیی و بێ دەسەڵاتی خۆی، بۆ باسکردووە. پاشان، داوای لێ کردووە، لای خوا، تکای بۆ بکا، تا، لە گوناهەکانی خۆشبێ و گوتوویەتی:

مەلجەء و پشت و پەناهێ، غەیری لوطفی تۆ نییە
گەر ببەخشی، وەر نەبەخشی، جان نثار و چاکرم
طالبی دیبای شفاعەت، کەس نییە وەک من بە جان
بۆ مەتاعی ڕەحمەتی تۆ، ئیمڕۆ، من سەوداگەرم
نابێ، من تەنها لە لوطفت بێ نصیب و بەهرە بم
چونکە، فەرمووتە: شەفیع و شەهسواری مەحشەرم
نەعتی شاهی ئەنبیا، « طاهیر » کە هاتە سەر زبان
جلوەبەخشی ذەوق، ئیمڕۆ، نەظمەکەی پڕ شەکەرم «9،36»

بە دە دێڕ هۆنراوەی دیکە، لە گۆشەنیگای خواناسییەکی ڕاستەوە، بە سۆزێکی بێ وێنەوە، لە کورەی دەروونێکی خاوێن و پڕ جۆشەوە، ستاییشێکی زۆر جوانی، پەیامبەری ئیسلامی کردووە و گوتوویەتی:

مەطلەعی صوبح و سەعادەت، مەظهەر، عیلم ئەلیەقین
ئەی سوپەسالاری، فەوجی ئەنبیا و موورسەلین!
بۆ نەوازش ذاتی حەق، هەم حوجەت، هەم دەنگی تۆ
شاهیدی تەعظیمی تۆ بوو، یاوەری روح ئەلئەمین
مشکی تۆزی دامەنت، عەطری دەماغی ئەتقیا
یەعنی، بۆ تەئثیری بینش، عەین سوورمە خاکبین
ڕوو لە کێ کەم غەیری تۆ، ئەی شافعی زومرەی ئەثیم؟
من گوناهبار و خەجاڵەت، تۆ « شەفیع ئەلموذنبین »
خۆم لە قوڕ بگرم بە جارێ، هەر لە پێ تا تەوقی سەر
بەڵکوو، لوطفی شاهی لەولاک بێ، نەجاتمدا لە شین
موستەحەققی تیر و طەعنەی، ئاشنا و بێگانە خۆم
واجبی ڕوحمم بە سێ، « یا ڕەحمەتەن لیلعالەمین » !
ڕووتوقووتی مەحشەر و بێ سایە و ئاوارە خۆم
بێ بە فریادم لەوێـــــــدا، یا دەلیل ئەلموجرمین ! *
ئێستە، من قانع، بە خۆشەی ئایەتی « لا تەقنیطو »م
مەزرەعەی عەفوی خوا نابێ، ببێ، بێ خۆشە چین
حەسرەتا مەئیوسی شەهد و زیارەتی شوباکی تۆم
بۆ نەڕێژم ئەشکی ئاڵ و ئاهی گەرمی ئاتەشین؟!
ئەی حەبیبی خالقی عالەم ! تەرەححوم، تا زووە
ئەو سەگی ئەصحاب کەهف و من سەگێکی تابعین
ڕوو لە قاپی « مصطەفا » کە، بێژە: « یا خەیر ئەلبەشەر »
نیمە تۆشەی ڕێگە، جوز ئیخلاص بۆ ئالی « طاهیر »ین «10،36»

وا دیارە، « تایەر بەگ »یش، چاوی لە « شـــێخ ڕەزای تاڵەبانیی » کردووە، کاتێ، بە هۆنراوەیەکی ڕەنگین و سەنگین، ستایشی « کاک ئەحمەدی شێخ »ی کردووە. بۆیە، وا بەو چەشنە و بە چواردە دێڕ، بە سەر شێخانی ڕێبای « نەقشبەندیی »دا هەڵیداوە و گوتوویەتی:

* ئەم هۆنراوەیە، جگە لەوەی، لای « سەجادیی » و لە « گوڵزاری کوردستان »دا، لە دە دێڕە هۆنراوە پێکهاتووە. هێندێ جیاوازیشیان هەیە.

مەربوطە حەیاتم، بە یارم و بە دیاری
خۆزگەم بە سەگی، قاپییەکی قوطبی مەداری
ئەم کاولە دنیایە، لە ئەو زێر و زەبەر بێ
پاش « ئەحمەدی موختار » و « ئەبو بەکر »ی سیاری
فاررووقی زەمان، حەضرەتی نائیبی « شێخ عوثمان »
واصل بە دەرگەهی کەرەم، ڕەحمەتی باری
ئەم حوجرەیە، کە جێی طەوافگاهی حەضرەتی « شێخ »ە
یەکسەر، هەموو ئەنوارە، چە سەقف و کەنار و چە دیواری
هەر دەم بۆ طەوافی، جەمعی ملک دێن
خاڵیی نییە، یەک ئانی، نە حوجرە و نە حەصاری
ئەم حوجرە، لە حەرەمدا، طەوافی بۆ نییە هەرگیز
مەجمووعی مەلائیکە، هەموو بوەتە زەواری
حاجی ! وەرە ئەم قاپییە، گەر طالبی دینی
صەد حەج و دوو صەد عەمرە، طەوافێکی مەزاری
صەد شوکری خوا، لازمبوو، جەمعی مریدان
خاڵیی نییە جێگەی، وەک ئابادی دیاری
ئەی نەجمی هونەر، مەظهەری حەق و مە خورشید
لازم نییە وەصفت، لە هەموو لاوە دیاری
گەر طالبی یاری، سا، ڕووبکە خورشید
پەی خالیدی بێ چارە، تۆ بە دەم دەردە، دووچاری
تا، تۆزی دەری قاپییەکەی، نەیکە بە چاوت
ئەم کێوە، کانی حەسەدە، ناکرێ چاری
فکرت، کە لەڕێ باری حەسەد ری ڕم و شیرە
بێ خاوەنە، بێ ڕێگە، لە شەیطانە سواری
ئەی قافڵەی سالار ! وەی ئافەتی مە و خورشید !
تو مەرقەدی « گەیلانیی » و پیرانی « بوخارا »
ڕەحمێ بکە، بە « طاهیر »ی بێ چارەی مسکین
مــــــــەهجووری دڵی، وا لە دنیادا بێزاری «27،36»

* * *

# « زێـــــــــــوەر »

# « 1948 - 1875 »

وەک هۆنەرێکی خاوەن بەهرە، بە هەموو لایەکدا، پەلی هاویشتووە. گەلێ هۆنراوەی، ڕەنگاوڕەنگ و جۆربەجۆری گوتووە. لە هەر باخەی، گوڵێکی چنیوە، تا لە ئەنجامدا، چەپکێ هۆنراوەی جوان و بۆنخۆشی، ڕازاندۆتەوە. لە باخچەی بە هەشتی وێژەی کوردییدا، لە سەر تەختی مامۆستای، هۆنەرانی سەردەمی خۆی دانیشتووە. تاجەگوڵینەی، هۆنەرێکی « هەست ناسک، بیر تیژ، واتای بەرز، ئەندێشەیەکی پڕ لە پیت و فەڕ »ی لە سەر ناوە.

هەر چەندە، « زێوەر »، مەلا و خواناسێکی ڕاستەقینە بووە، کەچیی، لەگەڵ ئەوەشدا، هۆنراوەی ئایینیی، بە دەگمەن گوتووە. یەکێ، لەو هۆنراوە ئایینییە دەگمەنانەی هۆنیوێتییەوە، ئەوەیە، ستاییشێکی زۆر جوان و ڕێکوپێکی، یەزدانی گەورەی کردووە، هۆنراوەی « خووا »ی هۆنیوەتەوە و بە حەوت نیوەدێڕ هۆنراوە گوتوویەتی:

هەر خووایە « جەلە شەئنەهو »، خاوەن « صیفاتی باقی »یە
خووای خەڵک و عەرد و ئاسمان، خووای « بەحر و ئاوی جاری »یە
گوێی لێیە، هەرچی تۆ بڵێی، گەر ئاشکرا و پەنهانییە
مێرووولەیێک بڕوا بە شەو ، لای ئەو، وەکوو: ڕۆژ دیارییە
زۆر « نیعمەتی » وای، داوە پێت، « خاریج لە فیکری عالیی »یە
دانا و تووانایە بە « حەق »، « ذاتی لە نوقصان خاڵیی »یە
ترست ببێ لەو « خالقە »، « قەهری نصیبی عاصیی »یە! «95،29»

کەچیی، لە بواری فەلسەفەی « ژیان و مردن، مان و نەمان »دا ، هێندێ هۆنراوەی جوانی گوتووە. هەر چەندە، لە ڕووی هونەری هۆنراوە و زمانەوە، زۆر لاوازە، هێندێ، ووشەی عەرەبیی بەکارهێناوە. بەڵام، لە ڕووی ناوەڕۆک و واتاوە، قـووڵ و پڕ بایەخـە و شـایانی ئەوەیە، سەرنجی وردیان لێ بدەین و لێیان تێبگەین، بە تایبەتیی، کاتێ، بە ئاشکرا ، مەبەستی بەدەسەوەداوە و گوتوویەتی:

بێ « فائیدە »، سەودازەدەی پارە و پوولی
بێ سوودە، کە بەسراوی خەمی پەرچەمی لوولی
ڕێی ڕاستیی، قەط ناگری، هەر چەوتییە ڕێگات
لەم « عەرەصەی دنیا »یە، وەکوو هاودەمی کوولی
نووستووی لە بەرابەر، « صەمەنی عفەت و ئەخلاق »
بۆ « ذەوق و صەفا » و ڕاهی « سەفاهەت »، چە عەجوولی
« مەحرووم »ی لە دەرگاهی هەموو « ئەهلی سەعادەت »
خۆشیت چییە، لای ئەهلی هەوەس؟ ئێستە قبوولی
ئەمڕۆ، بە « فەرەح » ڕادەبوێری لە هەموو جێ
وە لڵا « سبەی »، قووڕبەسەر و مات و مەلوولی
ڕۆژ و شەوت ئەڕوا، بە « عەبەس »، دوور لە « ئیطاعەت »
شەرمندەی دەرگاهی، خوداوەند و « ڕەسوول »ی
هاو « مەجلیس » و هەم پیاڵەی « سوڵتان و خەلیفە »ی
بۆ « حیرس و طەمەع »، پێشڕەوی هۆردووی « مەغوول »ی
هەر چەندە، جگەرگۆشەی، گەورەی « شوهەدا » بی
گەر بە « عەمەلی » لە گللەیی، بەر چاوی « بەتوول »ی
« بەهلوول »ی بە دینداریی و « زەغلوول »ی بە گوفتار
حەقەن، نە ئەوی، نە ئەمی، بێ « دین و جەهلوول »ی
ئەی « غافل »ی بێ کردەوە! بێ ئاوی و بێ زاد
وریابە، « سەفەر » کردەی « سەحرای بەتوول »ی «29، 34-35»

لە هۆنراوەیەکی دیکەشدا ، دیسانەوە، کێشەکانی ژیانی، بە فەلسەفەی بوون و نەبوونەوە گـرێداوە، لە ڕوانگەیەکی ئایینیی ڕووتەوە، لێکی داوەتەوە و بە حەوت دێڕ هۆنراوە گوتوویەتی:

چاو: کزبووە، گوێ: کپبووە، قەد: خەمبووە، دان: کەل
بەم حاڵەوە، خواخوامە، کەوا، ڕاکەمە سەر کەل
سەربەستیی، لە سەر بەرزییبە، تۆیش، وای لە نشێوا
قاچت: شەلە، دەستت: پەلە، بێ سوود: ئەکوتی پەل
هەر « مەنفەعەتی شەخصیی »یە، گوفتاری بە سوودت
بۆ خواردنە، « تەئسیری »، هەموو ئاگری مەنجەڵ
هەر کردەی ڕاست، تۆ، ئەگەیەنێ بە « مەرامەت »
ناگاتە ئومێدی بە قسە، زۆر زلی تەنبەڵ
وەک مەرسییە خوان، عەشقی « عەلی » کرد بە بەهانە
دەم پڕ وەطەن و عەشقە، دڵیش جێگەی « مونحەل »
گۆڕاوە زمانم، وەکوو « تەبدیلە زەمان »م
سێوم بووە « تفاح » و بەهێشم بە « سەفەرجەل »
ئیستێ بکە، ڕاوەستە برا، موشکلە ئیشت
ڕێگات، هەموو گیراوە بە « خەندەق »، بە تەم وتەل «51-50،29»

* * *

# « سـەیف ئەلقوضات »

# « 1944 - 1876 »

هۆنەر، لە نێو کۆشی، خێزانێکی ڕووناکبیر، وێژەدۆست، دەسەڵاتدار و ناسراوی « سابڵاغ »دا لەدایکبووە، گەورەبووە و پێگەیشتووە. زمانەکانی « کوردیی، فارسیی، عەرەبیی و توورکیی »، بە باشیی زانیوە و هۆنراوەی پێ هۆنیونەتەوە. گەلێ هۆنراوەی « ڕۆمانسیی، نیشتمانیی، ئایینیی و کۆمەڵایەتیی » گوتووە. هۆنراوە ڕۆمانسییەکانی، بەشی هەرە زۆری، بەرهەمەکانی پێکدێنن. پاشان، هۆنراوە نیشتمانییەکانی دێن. هەر چەندە، هێندێ ووشەی بیانیی، لە هۆنراوەکانیدا دەبینرێ، بەڵام، لەگەڵ ئەوەشدا، بە زمانێکی ساکار و ڕەوان، بە کوردییەکی تەڕ و پاراوی نێوچەی « موکریان »، گەلێ هۆنراوەی تەڕ و پاراوی گوتووە، هەمووشیان بە ئاشکرا، مۆرکی ڕەسەنی کورییان، پێوە دیارە.

« هەژاری موکریانیی »، دەربارەی هۆنەر گوتوویەتی:(ئەگەر « سەیف » تەنیا " ساڵی قڕانی " نووسیبایە و هیچی تر نا، دەرگای هەر مان و نەمریی، وەک ئەدیبێکی گەورەی کوردی، بە ڕوودا دەکرایەوە و لە لای شاعیرە مەزنەکان، پاڵپشتی بۆ دانراوە. )«10،31»

هۆنەر، سەرەتای هۆنراوەکانی، بە « ستاییشی خوا و پێغەمبەر » دەسپێکردووە، بە چل دێڕە هۆنراوە ڕازاندوویەتییەوە و گوتوویەتی:

بۆ تۆیە، هەر بۆ تۆیە، دەتوانم بکەم ثەنا
ڕۆژ و شەوێ، تۆ دێنی، دەبەی مەغریب و عیشا
گەورە و گران و بێ کەس و بێ جێ و بێ مەکان
بۆ بێ کەسان، کەسی، بۆ بێ جێیەکان، پەنا
تەنها و بەرقەراری، هەر بوویی و هەر دەبی
بێ ئارەزوو و نیازی، بێ باب و بێ برا
بێ وێنە، صانعێکی بە ئەمرێ، دروستدەکەی
ئینسان لە ئاو و گوڵ لە گەڵا و لە گڵ، گیا
هەر چی بەری گوڵانە، لە بۆ ذیکری تۆ زمان
هەر چی گەڵای بە دارەوە، دەستن لە بۆ دوعا
ڕەززاق و ناظری، لە هەموو جێگە حاضری
خاڵی لە تۆ، لە ئەرض و سەما، جێگەیەک نەما
هەر شوکری تۆیە، دەیکەن و هەر ڕسقی تۆ دەخۆن
حەیوان لە بەڕ و بەحر و فریشتان، لە سەر سەما
هەر چاویان لە تۆیە، هەر ئومێدیان بە تۆ
هەر چی غەنیی و فەقیرە، لە هەر لا گەدا و شا
بۆ دۆست و دوژمنە کەرەمت، بێ کەم و زیاد
بێ میننەت و تەشەخووص و بێ قیمەت و بەها
موحتاجی ڕوحمی تۆیە، نەبی بێ، ئەگەر وەلیی
حەیرانی وەصفی تۆیە، ئەگەر شێخ، ئەگەر مەلا
ماسیی، لە شەوقی تۆیە، لە بەحران دەکەن شەنا
تەیران لە عیشقی تۆ، لە سەمادا دەکەن سەما
لوطفت لە بۆ مە بێ، چ شفایێکە داییمی
دوور بێ لە ئێمە، قەهرت، دەردێکە بێ دەوا
تۆ زیاتری لە هەر چی، خەیاڵاتی لێ دەکەی
نەوەک کەسی، نە کەس وەکوو تۆیە، نە کەس وەها
تەعریفی تۆ، لە تاقەتی فکری مە، چۆتە دەر
" لا ئەحصا " سەییدی مە، فەرموویە بەر مەلا *
هەر کەس بڵێندیکەی، بە کەسێ ناکرێ نەوی
هەر کەس فرێبدەی، لە هەموو جێیە دەرکرا

ذەرڕێک لە نووری تۆیە، کە دنیا پڕە لە نوور
ڕووناکیی ڕۆژ و مانگەشەو و شوعلەی سەما
هەڵکەی چرایەکی ئەتۆ، قەت ناکوژێتەوە
ڕیشی دەسووتێ، هەر کەسێ، فووکا لە ئەو چرا
ڕەدد و قەبووڵی تۆیە، یەکێ نەحسە، یەک سەعید
« ئادەم » گەڕاوە، هاتەوە، شەیتان وەدەرنرا
باکم چییە؟ گوناهم ئەگەر زۆرە، یا کەمە
چونکە هەمیشە پیشەتە، لێبووردن و عەطا
زۆرم هومێدە، ڕۆژی قیامەت بە عەفووی تۆ
مەعلوومە، هەر لە تۆیە عەطا، لێ مەوە خەتا
بە خصوص شەفیعی ئێمەیە، ئەو خۆشەویستەکەت
شابازی دەشتی مەروە، شەهی شارەکەی صەفا
هەر دەم صەڵاتی زۆر و سڵاوێکی بێ ژمار
دیارییبێ، بۆ ڕۆحی پاکی تۆ، ئەی فخری ئەنبیا!
مەقصوود لە خەلقی عالەمە، هەر ذاتی پاکی تۆ
خەڵکی هەمووی طوفەیلیی، هەر تۆی کە بانگ کرا
چونە حوضور و هاتنەوەت، لە خرێکی گرت
لەو جێگەدا مەلەک بە گەلێک، کەوتنە دوا
هات و چوو، بیستی، کوتی: زوو گەڕایەوە
ئاڵقەی دەر، هەر دەلەرزی، چرای ماڵێ، هەر گڕا
پاش خوان خۆرن، لە خوانی سەخات، هەر چی ئەنبیا
ورکەچنی دەری کەرەمت، جوملە ئەولیا
تۆ، پادشای و ئێمە، گەدایانی دەرکی تۆ
غەیری گوزەشت و بەخشیش، چ دەکرێ دەگەڵ گەدا؟
عەبدم لە بۆ سەحابە، کە یار و ڕەفیقی تۆن
قوربانی ئالی بەیتی ئیمامانی ڕێنوما
ئەو دەم، کە هەر کەسێ، بە کەسێکی دەبێ نەجات
ئێمەین و دەس، بە دامەنی ئەو پێنج بنی عەبا
کوردین و بێ کەسین و لە هەر لایە، دەرکراو
دەستێ وە دەس مەدە، کە لە ڕێت ئێمە لا نەدا

دنیا که سیجنی موئمینه، فەرمووت و دات خەبەر
هەر بۆ مەیە، لەگەڵ مەیە، هەر لێ مە ڕوودەدا
یانی: نە مولک و ماڵە لە بۆ مە، نە حاڵ و باڵ
بێ جاه و بێ جەلال و بێ حاڵ و بێ صەلا
لێ مە نە شاو نە ئەمیرە، نە سەردار و نە وەزیر
نە حاکم و نە نایب و سەرتیپ و نە سوپا
هەر یەک غولام و نۆکەری بێگانە، میللەتێک
زیز و کز و کەنفت و کەسیفن و بێ نەوا
نیمانە مەرکەزێکی کەوا، پاڵی پێوە دەین
نە مەزن و گەورەیێکی، کە بۆیان بەرین پەنا
پالەستۆدان و جواب و فرێدان لە بڵلەکان
دەست پێوەنان و پشتەملە، زللە، گێت نەیا 1*
نە مەدرەسە، نە عیلم و نە دەرس و نە صەنعەتێک
ظوڵمە لەگەڵ مە، هەر کە بە چاوێک، نەکەن نیگا
ئاخر، بە ذاتی تۆیە، ئومێدی نەجاتی مە
ڕازی مەبە، لە ئۆمەتی تۆ، میللەتێک فەنا
ئەمڕۆ « حەسەن » موئەذینی کوردانە، بانگئەدا
هستن لە خەو، وە خڕبن " حەی عەلا ئەلصەلاە "
نوێژ چاکترە، لە نوستنێ " حەی عەلا ئەلفەلاح "
سوجدە و ڕوکوع، لایقە، هەر بەرنە بەر خودا «27-24،31»

* * *

* مەبەستی لە ووشەی " سەیید " ، پەیامبەری ئیسلام بووە!
بەر مەلا: بە ئاشکرا.
1* ووشەی " گێت " بە توورکیی واتە: بڕۆ. ووشەی " نەیا " بە فارسیی، واتە: مەیە.

# « حەمـــــــــدیی »

*

« 1936 -1876 »

هۆنەرێکی گەورە و ناوداری کوردبووە. بە یەکێ لەو هۆنەرە گەورانە دادەنرێ، کە کوانووی فێرگەی، هۆنراوەی کلاسیکیی کوردیی، لە کوژاندنەوە پاراستووە. گەلێ هۆنراوەی جوان و شیرینی داناوە. دیارە، یەکێکی وەک مامۆستا « نەجمەدین مەلا »، بە خۆڕایی، ئەم چەن دێڕە هۆنراوەیەی بۆ نەگوتووە:

گوفتاری « حەمدیی »، بالآیەکی والآیە
وەک فەرشی زومەرەد، ئالَووالآیە
شیعری تالَی، وەک شەکر وایە
بۆ خۆێندەواران، بوو بە دەسمایە «30،16»

« حەمدیی »، وەک هۆنەرێ، زۆر جەسووربووە، هەرگیز، ترس لە دلَیدا نەبووە. زۆر بە ڕاشکاویی، پەنجەی ڕەخنەی، ئاراستەی « شێخ مەحموود » و دەوروبەرەکەی کردووە. گەلێ هۆنراوەی، لە بارەی کەموکوڕییەکانی، دەولَەتەکەی « خوارووی کوردستان »ەوە گوتووە.
دەربارەی « حەمدیی »، دوکتۆر « مارف خەزنەدار » نووسیوێتی: (من لام وایە، « حەمدیی » هۆنەر، وێنەیەکی تایبەتیی و کەسایەتییەکی تایبەتیی نییە، بەلَکوو، بریتییە لە چەند هۆنەرێک، لە فێرگەیەکی هۆنراوەی تایبەتیی گەلێک زل. ئەم فێرگەیە، لە « نالیی »یەوە، دەس پێ ئەکا تاکوو ئێستا. لە سەرەتای سەدەی چەرخی بیستەما، لە گێتی وێژەیی کوردییدا، گەورەترین هۆنەرێ کە گیانی ئەم فێرگە کلاسیکییەی پاراستووە و بەرزیکردۆتەوە، « حەمدیی » بووە.)

پاشـان گـوتوویەتـی: («حـەمـدیی »، بـە ڕاسـتـیـی هۆنـەربووە، تەنـیـا، هۆنەری تایبەتیی شتێک نەبووە، بەڵکوو، هۆنەری دەروونی خۆی بووە، هۆنەری « کوردستان » بووە، هۆنـەری بەهـار و ئەرز و ئاسمـان و شـەو و ڕۆژ بووە، هۆنەری هەموو ژیان بووە.)«32،16»

« حـــەمـــدیی »، هـۆنـەرێکی خـــواناس و ئـایـینداربووە. بـەڵام، وەک سـۆفـیـیـیـەک ڕەفـتـاری نەکـردووە. بەڵکوو، خـوا و خـورمـای، پێکەوە ویستووە! بۆیە نـەیتوانیوە، بە تەواویی، واز لە خۆشـیـیـیەکانی ژیان بێنێ. تەنانەت، مـەیخـۆرێکی بێ وێنەش بووە. ئەوەتە، لـە هۆنراوەیەکی بیستودوو دێڕیدا گوتوویەتی:

من و پیری خەرابات و دەری مەیخانە، تا مردن
من و ساقیی و مەیی و جام و قسەی ڕەندانە، تا مردن
بڕۆ زاهید، موبارەک هەر بە تۆ بێ، مەسجید و میحراب
من و ئەبرۆی بتان و گۆشەیی بتخانە، تا مردن «321-320،16»

ئەز، پێم وایە، هەر لە بەر ئەم هۆیەش بووە، هـۆنەر، هەمـــوو هـۆنراوە ئایینیـیـیەکانی خـۆی، بە شـێوەی پاڕانەوە و لاڵانەوە گـوتووە و گەلێ هۆنـراوەی بەرزی، لە سـتـایـیـشـی پەروەردگـار و پەیامـبـەرەکـەیدا هۆنیـوەتەوە. لێرەدا دەبینین، لە هۆنراوەی « سوورەتی فاتیحە »دا، بە چ شــێــوەیەکی ڕەوان و جـــوان، لە « مـــوحـــەممەد » پاڕاوەتەوە و گوتوویەتی:

یا ڕەسولەڵڵا ! ذەلیل و دڵ حەزینم، ڕەحمەتێ
موستەمەند و بێ قەرار و بێ قەرینم، ڕەحمەتێ
ڕاحەتی قەلب و وجوود و عیززەتی نەفسم نەما
وەختی مەرگە، حافیظی ئیمان و دینم، ڕەحمەتێ
دادخواهی مەحشەر و پشت و پەناهی موئمینان
هەمنشینی ذاتی دنیا، ئافەرینم، ڕەحمەتێ
با، بە « بیسمیللاهی ئەلڕەحمان ئەلڕەحیم »، دەسپێبکەم
چونکە، تینووی ڕەحمەتم، دڵ ئاگرینم، ڕەحمەتێ
کائینات، « ئەلحەمدولیلا »، پڕ لە نووری ڕووی تۆ
ئەی حەبیبی، یاری « ڕەب ئەلعالەمین »م ! ڕەحمەتێ

ئەی وجوودت ! مەنبەعی ئەلطافی « ڕەحمان ئەلڕەحیم »
« مالیک »ی ئیعجازی شەمسی، « یەوم ئەلدین »م، ڕەحمەتێ
قائیمی « ئییاکە نەعبود » بووم، بە تەبلیغاتی تۆ
وا « وە ئییاکە » ئەڵێم، بۆ « نەستەعین »م، ڕەحمەتێ
« ئیهدینا »، بۆ ڕێی « صیرات ئەلومستەقیم »م، تووبی خودا
بۆ ئیرائەی، ڕێی « صیرات ئەللەذین »م، ڕەحمەتێ
من لە « ئەنعەمتە عەلەیهم »، با نەبم بێ بەش، خووا
خۆ، سەگی کۆیی « ئەمیرئەلمورسەلین »م، ڕەحمەتێ
« غەیر »ی تۆ، کێ من، لە « مەغضوب عەلیهم » لا ئەدا؟
وەک « وە لا ئەلظالین » ئامین، هیچ نەبینم، ڕەحمەتێ
تو خووا، غافڵ لە « حەمدیی »، قەط مەبە ڕۆژی جەزا
ڕووسیاهم، ئەی شەفیعەل موذنیبینم، ڕەحمەتێ «61-60،16»

یا، کاتێ « حەمدیی »، لە « تەرجیعبەند لە ستایشی پێغەمبەر » و لە هۆنراوەی یەکەمدا، بە نۆزدە دێڕ هۆنراوە، ستایشێکی زۆر جوان و ڕێکوپێکی پەیامبەری کردووە و گوتوویەتی:

مسوەددەی صوبحی ئەزەلی، مووی موحەممەد
خورشیدی بەیاضی ئەبەدی، ڕووی موحەممەد
ئەو شامەیە، چەشنی سەکەنەی ئەرض و سەماوات
هەڵهات، کە هیلالی خەمی ئەبرۆی موحەممەد
کاسەی سەرم ،کاسە، خولئەدا مەجمەری گەردوون
سەر مەستە، لە نەشئەی، گوڵی بۆی موحەممەد
ئیعجازی دەم و دەستی، « مەسیحا و کەلیم »ی
هەر دوو دەمودەست، کەوتنە نازووی موحەممەد
مەیدانی جیهان تەنگە، بەبێ وادیی مەحشەر
بۆ بەرقی بۆراقی، تەکاپۆیی موحەممەد
لە کۆتاییشدا گوتوویەتی:
ئەم خەڵقە، خوا، بۆیە ئەکا سەوقی مەعاصی
تا دەربکەوێ، قەدری تەمەننایی موحەممەد
ئەنگوشت نومای خاتەمییە، فەخری ڕیسالەت

نەجمی کەتیفی، مۆری موحەششای موحەممەد
هاتیف دەڵێ: بەم شیعرە، دەکەن عالەمی باڵا
تەوصیفی جەلالی، ڕۆخی زیبای موحەممەد
مسوەددەی صوبحی ئەزەلی، مووی موحەممەد
خورشیدی بەیاضی ئەبەدی، ڕووی موحەممەد «107،16»

هەروەها، لە هۆنراوەیەکی دیکەی ئایینیدا، ڕووی لە مەزارگەکەی پەیامبەر کردووە، زۆر بە کوڵودڵ، لێی پاڕاوەتەوە و گوتوویەتی:
یا موحەممەد! ڕووڕەشی دەرگانەکەی تۆم، تۆبەبێ
هەرچی هەم، بێ شک، سەگی ئاسانەکەی تۆم، تۆبەبێ
زەڕڕەیێ شوعلەی جەمالت، کائیناتی کردە نوو
هەر وەکوو زەڕڕە، منیش پەروانەکەی تۆم، تۆبەبێ
ئەنبیا، هەر کەس بە ئوممەتیانەوە، وەک من ئەڵێن:
ئینتیظاری، هیممەتی مەردانەکەی تۆم، تۆبەبێ
ناسیخی جوملە کیتاب و جامیعی جوملەی کیتاب
کافریش بم، عاشقی قورئانەکەی تۆم، تۆبەبێ
سەیری ئەعمالم ئەکەم، دایم فوغان و ناڵەمە
گەر موفەڕڕەح بم، لە سەر پەیمانەکەی تۆم، تۆبەبێ
هەر بە ئانێ کاشیفی سیڕڕی سەماوات و مەلەک
من وەکوو ئەفلاک و مەلەک، حەیرانەکەی تۆم، تۆبەبێ
خاتیمەتکێشا، بە فەرمانی هەموو پێغەمبەران
من وەکوو « مەهدیی »، لە سەر پەیمانەکەی تۆم، تۆبەبێ
چەژنی قوربانە، قەصابیش حازرە، خۆزگەم بە خۆم
خۆم و ئەولادم، هەموو قوربانەکەی تۆم، تۆبەبێ
بێ کەس و حەیران و سەرگەردانە « حەمدیی »، وەک عەرەب
ئەلئەمان، دەستی من و دامانەکەی تۆم، تۆبەبێ «388،16»

* * *

# « بێخـــــــــــــــود »

## « 1955- 1879 »

هۆنەرێکی کلاسیکیی گەورەبووە، لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمدا، نوێنەری سەردەمی، قۆناغی هۆنراوەی کلاسیکیی کوردیی بووە، وەک تەواوکەری، سەردەمی هۆنراوەی کلاسیکیی قوتابخانەی « نالیی » وایە و لە هەر دوو هۆنەر « مەحویی » و « حەریق »ەوە، ئەو کارەی وەرگرتووە. پتر، بە هۆنراوەی « لاهووتیی » ناویدەکردووە.

دوکتۆر « مارف خەزنەدار »، لە بارەی « بێخود »ەوە نووسیویێتی: (هۆنەر، بەردەوامیی قوتابخانەی « نالیی »یە، لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەیەم، لە زۆربەی تازەکردنەوەکانیدا سەر نەکەوتووە. لە کەمیشیاندا، ئەگەر سەرکەوتبێ، لە بەکارهێنانی فەرهەنگی هۆنراوەی کلاسیکییدا سەرکەوتووە. هەرچی ووشە تازەکانە، لەگەڵ تەکنیک و هارمۆنیی گشتیی، ناوەوەی هۆنراوەکە ڕێک ناکەون، با، هۆنەر لە بەکارهێنانیشیاندا سەرکەوتووبێ.)«333،51»

بەڵام، دید و بۆچوونی شارەزایان، لە سەر هۆنراوەکانی « بێخود »، بە هەر شێوەیەبێ، نکوولیی لەوە ناکرێ، هۆنەرێکی گەورەی « لاهوتیی » کوردبووە. گەلێ هۆنراوەی خواپەرستیی و فەلسەفیی داناوە. بۆیە، هۆنەرێکی ناسراوی وەک: « کەمالیی » گوتوویەتی:(« عیسا »، بە پێغەمبەری عروجی کردبووە ئاسمان، ئەم بە شاعیریی)«52،27»

زۆربەی زۆری هۆنراوەکانی « بێخود »، خۆیان لە هۆنراوەی ئایینییدا دەبینن. جا، ئایا هەر خۆی ویستوویەتی، ئەو جۆرە هۆنراوانە بڵێ؟ یا، وەک دەڵێن: (لە ساڵی « 1900 »دا، کە لە « هەڵەبجە » حاکم بوو، کچێکی مارەکردووە، ئەو کچە، بە ڕووداوێک مردووە، لەو کاتەوە، لە هۆنراوەووتن ساردبوەتەوە، مەگەر تاکوتەرا، ئەگینا، لە هۆنراوەی ئایینیی بەو لاوە، هۆنراوەی تری نەنووسیوە.)«64،64»

لەوانەیە، لە ئەنجامی ئەو کارەساتەدا، « بێخود »، تووشی ڕەشبینیی و سستیی بووبێ. بۆیە، هۆنراوەی ڕۆمانسیی و نیشتمانیی، زۆر کەم

گـوتووه. بەڵام، گـەلێ هـۆنراوەی بـەرزی، لە « سـتـایـیـشـی یەزدان، خۆشەویستیی پەیامبەری ئیسلام، یارانیی و پیاوچاکان »دا داناوە.
هۆنـەر، شـەش پێنجـخـشـتـەکـیی، لە سـەر هـۆنراوەیەکی « مـەلا عەبدولعەزیزی مفتیی ــ فەوزیی » برا گەورەی داناوە. لەو هۆنراوەیەدا زۆر بە جـوانـیی، لە تـاکـوتەنیـایی پەروەردگـار و خـۆشـەویـسـتـیی پەیامبەرەکەی دواوە و گوتوویەتی:

ئەی خودا! ئەی ڕافیعی، نۆ سەقفی گەردوون، بێ عەمەد!
نیعمەتت بۆ ئێمە، « لا یوحصا »، صیفاتت، « لا یوعەد »
« شوکور لیلاە »، تا دەوامیبێ، لەگەڵ ڕۆحا جەسەد
پڕ زمان و دڵمە یا ڕەب ! « قول هوە ئەڵلاهو ئەحەد »
ذیکر و فیکری ظاهیر و باطینمە، « ئەڵلاهو ئەلصەمد »

بێ کەس و بێ ماڵ و جاهم، « یا ڕەسووله ڵلا » دەخیل
زۆر فەقیر و بێ پەناهـم، « یا ڕەسووله ڵلا » دەخیل
تۆی بە « وە ڵلا »، خضری ڕاهم، « یا ڕەسووله ڵلا » دەخیل
ڕێگە لێ ونبووی گوناهـم، « یا ڕەسووله ڵلا » دەخیل
وا لە دەشتی چۆڵی عیصیانا، خەریک ماوم، مەدەد

لە کۆتاییشدا گوتوویەتی:

ئەو حەکیمانەی، کە کەشافی هەموو وشک و تەڕن
مووشکافی نوقطەنوقطەی، حیکمەتی بەحر و بەڕن
عالمی دانا، گەر ئەهلی چاکە، یا ئەهلی شەڕن
مەشریق و مەغریب، لە دەرکی ذاتی تۆ، کوێر و کەڕن
« لەم یەلید »، وە ڵلاهو، ئەزەل چەشتت، « وە لەم یولەد » ئەبەد

« فەوزی »یا ! وا، ڕادیۆی لوطفی خودا، بێ باتری
هاتە سەر ئیخباری عەفووی تۆ، نیهان و ظاهیری
تۆش، لە غەزنەینی ئەنادا، لێدە تەپڵی نادری
عاقیبەت، « مەحموود »ی کردی، چونکە، « ئیخلاص » ئاخری
« لەم یەکون لەهو »، کاری پێکهێنای، لەگەڵ « کوفوەن ئەحەد »
«32-31،8»

له هۆنراوەی « لەو ڕۆژەوە ڕۆیشتووە »دا، بە یازدە چوارینە، زۆر بە شێوەیەکی جوان و ڕازاوە، وەک موسوڵمانێکی ڕاستەقینە، هەستی دڵ و دەروونی تایبەتیی خۆی، بەرانبەر خۆشەویستیی پەیامبەر دەربڕیوە و گوتوویەتی:

لەو ڕۆژەوە ڕۆیشتووە، تۆراوە دڵی من
هەر چەند ئەگەڕێم، بێ سەر و شوێن ماوە دڵی من
ئاخۆ، بە چ شاخێکەوە، گیرساوە دڵی من
یاخۆ، بە چ داخێکەوە، سووتاوە دڵی من
* * *

ئەو هەمدەمی غەمخوار و نەدیمی منە، یا ڕەب
ئەو مەحرەمی ئەسرار و قەدیمی منە، یا ڕەب
ئەو گەوهەری شەهوار و یەتیمی منە، یا ڕەب
کەوتۆتە چ بەحرێکەوە، خنکاوە دڵی من
* * *

« مەجنوون »ی دوو گێسووی، چ « لەیلا »یەکە ئاخۆ
یا، « وامیق »ی جادووی، چ « عەزرا »یەکە ئاخۆ
دێوانەی ئاهووی، چ صەحرائیکە ئاخۆ
کام چیهرە پەریی دیوە، کە ترساوە دڵی من
* * *

ئەتلێتەوە، گاهێ بە خەیاڵی خەط و خاڵی
ئەخولێتەوە، گاهێ بە چرای شەوقی جەماڵی
نازانی، ئەگەر چۆنە، بە دەس دەردەوە حاڵی
وەک پووش و پەڵاشێکە، بە دەم باوە دڵی من
* * *

لەو چۆڵ و بیابانە ئەبێ، یاوەری کێ بێ ؟
یا، بەو کەژ و کێوانەوە، سەوداسەری کێ بێ؟
یا، لەتلەت و ئەفگاری، موژەی خەنجەری کێ بێ؟
چۆن ماوە، لە صەد لاوە، کە کوژراوە دڵی من؟
* * *

بۆچی نەڕژێ، سەیلی سروشکم وەکوو باران؟
بۆچی وەکوو « یەعقووب »، نەبمە شوهرەیی شاران؟
لەو « یوسف »ە پرسیومە، لە بێگانە و یاران
هەرگیز نییە سۆراخی، لە هیچ لاوە دڵی من
* * *

بۆ خۆی بگریم، یا، نەفەسی پەردەدڕاوی
یا، بۆ جگەری کونکون و صەد پارەکراوی
چی کردووە، یا ڕەب! کە خەو و خواردن و ئاوی
دایم غەم و بێداریی و خوێناوە دڵی من؟
* * *

چ بکەم؟ چ بڵێم؟ بۆ دڵەکەم کارییە دەردم
شاهیدی منن، موویی سپیی و چیهرەیی زەردم
خۆڕایی نییە، ناڵەی گەرم و دەمی سەردم
هەڵبەت، بە بەلایێکەوە ئالاوە دڵی من
* * *

ئەو سینە، لە غەش خاڵییە، ئەو بێ ڕقوکینە
ئەو خادیمی، شەرعی نەبەویی و میللەت و دینە
مەعلووم چووە، بۆ خزمەتی سالاری « مەدینە »
وامزانی، کە فەوتاوە، نەفەوتاوە دڵی من
* * *

قوربانی کەسێ بم، کە بە قوربانی نەبی بێ
وەک بەندە، سەگی دەرگەهی، شاهی عەرەبیی بێ
شاهی عەرەبیی، یەعنی « قورەیشیی » نەسەبیی بێ
جەرگی، بە دوو ئەبرۆی ئەوە، جنراوە دڵی من
* * *

ذاتێکی وەهای گرتووە، ڕۆحم بە فیدای ئەو
شاهان، شەو و ڕۆژ، دێنە قەدەم بۆسیی گەدای ئەو
« بێخود » ! مەبە ئیتر، بە ئومێد و بە تەمای ئەو
نایێتەوە لات، گەر سەری داناوە دڵی من «68-66،8»
* * *

هەروەها، لە هۆنراوەیەکی دیکەشـــدا، بە نۆ دێڕ هۆنراوە، زۆر بە جوانیی، ستایشی پەیامبەری کردووە و گوتوویەتی:

ئەگەر شاهم، وە گەر شاهێن و بازم، « یا ڕەسوول ئەڵلا »!
وەطەن ئاوارە و هێلانەوازم، « یا ڕەسوول ئەڵلا »!
بە ڕۆژ، پەروانەیەکی دڵشکاو و بێ پەڕ و باڵم
بە شەو، شەمعێکی پڕ سۆز و گودازم، « یا ڕەسوول ئەڵلا »!
لە تیغی قەهر و ڕوتبەی، ئیلتفاتی تۆومە قوربان
ئەگەر، گەردەن کەچم، یا سەرفرازم، « یا ڕەسوول ئەڵلا »!
بە وەرچەرخاندنێکی ڕووت، هەتا، هەم کەوتووم بێ ناز
بە لوطفێکت، لە عالەم بێ نیازم، « یا ڕەسوول ئەڵلا »!
لە تێکۆشینی ڕزگاریی منی ئاوارەدا، کولبوون
هەموو باپیرەکانی دڵنەوازم، « یا ڕەسوول ئەڵلا »!
ئیتر، هەر خۆت ئەبێ، چارم بفەرمووی، چونکە، هەر خۆتی
تکاکارم، موعینم، چارەسازم، « یا ڕەسوول ئەڵلا »!
ئەزانم، خۆ خیلافی ئەمری تۆم، زۆر کردووە، ئەمما
کوڕی خۆتم، بە لوطفی تۆ ئەنازم، « یا ڕەسوول ئەڵلا »!
نەجاتم گەر بدەی زوو، بۆ طەوافت حاضرم، یەعنی
بە کەعبەی ڕووت، ڕووە و خاکی « حیجاز »م. « یا ڕەسوول ئەڵلا »!
غولامێکم، ئەوا، خۆم خستە قاپیی غیرەتی تۆوە
بە ناو « مەحموود »م، ئەمما، هەر « ئەیاز »م، « یا ڕەسوول ئەڵلا »!
«78-77،8»

* * *

# « شـــــــــــــاهۆ »

## « 1971 - 1882 »

هۆنەرێکی زرنگ و زانا، دڵتەڕ و زمانشیرین بووە. لە بواری هۆنراوەدانانداە، سوارچاکێکی چاپووک و چالاک بووە، گەلێ هۆنراوەی « تەڕ و ئاودار، بەرز و ناسک، ڕێک و ڕەوان »ی هەیە. هۆنراوەی ڕۆمانسیی، بەشی زۆری، بەرهەمەکانی دادەپۆشێ، پاشان، ئایینیی و نیشتمانیی دێ.

بێ گومان، « شاهۆ »ی هۆنەر، لە بەرەبابێکی مەلا و لە بنەماڵەیەکی موسوڵمان بووە. دایکی، کچی « شێخ عومەری بیارە » بووە. هەر چەندە، هۆنەر مەلا نەبووە، بەڵام، لە هەموو ژیانیدا، لە ڕێبازی ئیسلام و خواپەرستیی لای نەداوە. بە تایبەتیی، حەڤدەساڵی، دوایی تەمەنی خۆی، بۆ خواپەرستییەکی تەواو تەرخانکردووە. بۆیە، کارێکی سەیر نییە، گەر بە دەیان، هۆنراوەی ئایینیی وەک: « خوا بۆ تۆ نییە و نابێ، پەنام هێنایە بەر قاپیت، یا ڕەسولەڵڵا، یا خوا، ڕەبی هەر چەند، ڕووڕەشی دیوانتم، سەروەری عالەم، سەد کە من، ڕووم لە قاپی تۆیە، ئیلاهی، ڕەببی تۆ پشت و پەنامی، ڕووی دڵم، بەندە عەبدێکی زەلیلم، ئامالی بەندە، کۆیلەیەکم، ئیلاهی، غەیری قاپی ڕەحمەتت، موسوڵمانم، خوایا ... » دانابێ. بەڵێ، کارێکی سەیر نییە، گەر، زۆربەی ئەو هۆنراوانەش، لە پاڕانەوە و لاڵانەوە پێکهاتبن، خۆشی، بە ڕوویەکی ڕەش و موویەکی سپییەوە، لە بەر قاپی پڕ لە سۆزی پەروەردگار، بە ماتومەلوولیی وەستابێ، دەسی پاڕانەوەی، بەرەو ئاسمانی بەرین، بەرزکردبێتەوە، ستاییشی پەیامبەر و یارانی کردبێ و گوتبێتی:

پەنام هێنایە، بەر قاپیت، بە ناڵە و شیوەن و زاریی  
هەزاران دەفعە، یا ڕەببی! بە هیوای ڕەحم و ڕزگاریی  
ئەگەر چی، شەرمەسارم، ڕووڕەشی دیوانی تۆم، ئەمما  
بەرامبەر عەفوی تۆ، وەزنی چییە، باری گوناهباریی؟

به ڕەحمی واسیعی عامت، بەزەییت گەر نەیێ پێما
پەنا، بۆ کێ بەرم، بۆ دەردی خۆم، کێ بێ بکا چاری؟
پەنا خۆتی، خوا خۆتی، هەموو کارێ، بە دەست خۆتە
ئەگەر، من « موذنیب »م، خۆ تۆ، خوداوەندێکی غەفاری «12،32»

یا، ڕووی لە بارەگەی پیرۆزی پەیامبەر کردووە، بە « یا ڕەسولەڵڵا » هاواری لێ کردووە و گوتوویەتی:

یا ڕەسولەڵڵا ! دەخیلەک، سەروەری دونیا و دین
پێشەوا و خەتمی عومومی، ئەنبیا و موورسەلین
فەخری گشتی کائیناتی، سەییدی « جین و بەشەر »
تاقە مەحبوبی خوداوەند، ڕەحمەتی بۆ عالەمین
تۆی، ئومێدی بێ ئومێدان، ڕەهبەری ڕێگەی نەجات
ڕۆژی ڕووناکی هیدایەت، مقتەدای موتەقین «14،32»

هەروەها، هۆنراوەی « ڕووم لە قاپی تۆیە »ی، بە شەش دێڕ ڕازاندۆتەوە و گوتوویەتی:

ڕووم لە قاپی تۆیە، ڕەببی! وام لە بەر دیوانتا
کەوتوم وەک سەگ، لە سایەی سێبەری قورئانتا
تۆ پەناهی، بێ پەناهیت و بەندەی ڕووسیات
غەیری تۆ، نیمە پەناهێ، من لە ژێر ئاسمانتا
سەد کە نامەی کردەوەم، ڕەشتر لە ڕووی خۆمە، بەڵام
سەهلە شۆرینی، لە دەریای بێ پەیی ئیحسانتا
باوەڕم وایە، بە نەصی ئایەتی « لا تەقنەطو »ت
« موئمینان » نابێ، موعەذەب بن، لە ناو زیندانتا
تۆ کە فەرمووتە: ئەبەخشم گشت گوناهی « موئمنین »
بەندە، چۆن بێ بەش ئەفرموورێم، لە ناو « غوفرانتا »
گەر، ببەخشی جورمی « شاهۆ »، هیچی کەم نابێتەوە
بەحری ڕەحمی بێ پەی و ئەلطافی بێ پایانتا «50،32»

زۆربەی هۆنراوە ئایینییەکانی « شاهۆ »، لە پاڕانەوە و لاڵانەوە پێکهاتووە. بەڵام، کاتێ ستاییشی پەیامبەری کردووە، سەرەتا، پێیدا

هەڵداوە، پاشان، لێی پاڕاوەتەوە، بە چامەیەکی حەڤدە دێڕیی، ڕووی
لە « سەروەری عالەم » کردووە و گوتوویەتی:
واقیعەن، تۆ خاتەمی پێغەمبەران بوویت و وەلێ
ئەو دەمەی تۆ بووی، نە « ئادەم » بوو، نە باقی ئەنبیا
یا ڕەسولەڵڵا ! دەخیلتبم، ذەلیل و بێ کەسم
غەیری قاپی لوطفی تۆ، دەستم لە هەر لایەک بڕا
شەرمەسارە خوار و عوصیانبار و بەدکارم، وەلێ
دەست و پێم بەسراوە، وا کەوتوومە بەر داوی بەلا
نەفس و شەیتانی لەعینم، وا بە سەرما ظاڵمن
دەورەیان داوم، بە دایم میثلی شێر و ئەژدەها
موستەحەقی قەطرەیەک ڕەحمم، لە دەریای لوطفی تۆ
نابێ مەئیوسم بکەی، ئەی شاهی بە عەدل و صەفا
کەلبی دەرگای خۆتە « شایق »، مولتەجی نابێ بە کەس
سا بە هاواریۆ وەرە، قوربان! ئەتۆ و ذاتی خوا «36-35،32»

لە چامەی « بۆ پێغەمبەر »دا، بە نۆزدە دێڕ هۆنراوە، باسی گەورەیی و خۆشەویستیی پەیامبەری کردووە. پلەوپایەی پەیامبەری، لای یەزدان دەرخستووە. پاشان، دانی بە گوناهەکانی خۆیدا ناوە، لە پەیامبەر پاڕاوەتەوە، تا لای پەروەردگار، تکای لێبووردنی بۆ بکا و گوتوویەتی:
ئەم « کۆیلەیەت »، کە « توولەسەگی » ئاستانتە
موحتاجی « لوقمەیەکە »، لە خوانی بەراتی تۆ
هیوام بە لوطف و مەرحەمەتی، ذاتی تۆیە من
چونکی، پەناهی کۆمەڵی، گشت عاصیانی تۆ
هەر چەندە، « سیایە » نامەی ڕەفتار و کردەوەم
خۆ مولتەجیم بە ذاتی، « عەظیم ئەلصفات »ی تۆ
فریامکەوە، بفەرموو، بشۆڕێ بە ئاوی « عەفو »
ئەی ئەو کەسەی، کە عەینی حەیاتە مەماتی تۆ !
چاوی، لە ڕەحمی ئێوەیە « شاهۆ »، کە لای « خوا »
ڕەد ناکرێتەوە، « طەڵەب و خواهێشانی » تۆ «123-122،32»

* * *

# « فانـــــــــــــــــــیی »

## « 1983 - 1883 »

هۆنەر، ماوەی سەد ساڵی ڕێک ژیاوە و زۆربەی زۆری ژیانی خۆی، بە « مەلایەتی »یەوە بەسەربردووە. هەر چوار زمانی « کوردیی، عەرەبیی، فارسیی و توورکیی »، بە باشیی زانیوە. لە ژیانی خۆیدا، دوو بەرهەمی « ژیانی ئینسان و شەرحی ذات ئەلشفا »، بە کوردیی نووسیوە. سێ بەرهەمی ئایینیی « فەرموودەکانی پێغەمبەر، جامع ئەلصەغیر و چامەی بوردیە »، لە زمانی « عەرەبیی »یەوە، بۆ سەر زمانی « کوردیی » وەرگێڕاوە. سێ بەرهەمی « بەلاغەت، نەظمی تەهذیب ئەلمەنطق و مەنهەج ئەلحەقیقە »، بە زمانی « عەرەبیی » نووسیوە. چوار بەرهەمیشی « شەرحی لەوائح، شەرحی لەمەعات، مەنظومەی تەوحیدیەی فەریدەددینی عەطار و چوارینەکانی عومەر ئەلخیام »، لە زمانی « فارسیی »یەوە، بۆ سەر زمانی « عەرەبیی » وەرگێڕاوە. وەک ئەوەی، « کوردیی » زمان نەبووبێ! یا، ڕۆڵەکانی نەتەوەی کورد، زمانی « عەرەبیی »یان، بە باشیی زانیبێ و لێی تێگەیشتبن! یا، پێویستیان بەو بەرهەمانە نەبووبێ! هەڵبەتە، هۆنەر وەک مەلایەکی موسوڵمان، پتر، بیری لە ئایینەکەی کردۆتەوە، وەک لەوەی، بیری لە زمان و بەرژەوەندیی نەتەوەکەی خۆی کردبێتەوە! بەڵام، لەوە دەچێ، ئایین، مرۆ لە ئاستی نەتەوە و نیشتماندا، کوێرکا!
لە بواری هۆنراوەدانانیشدا، هێندێ تێکەڵەهۆنراوەی، بە زمانەکانی « کوردیی ـ فارسیی، کوردیی ـ عەرەبیی، کوردیی ـ توورکیی » داناوە. جگە لەوەی، بە زمانی دایک، چەن هۆنراوەیەکی گوتووە، گەلێ هۆنراوەشی، بە هەر سێ زمانی « عەرەبیی، فارسیی و توورکیی »ش داناوە. تەنیا هەر، بە زمانی « عەرەبیی » و لە پەرتووکی « ئەلمەنظوم فی ئەلعقود »دا، « 587 » دێرە هۆنراوەی هۆنیوەتەوە! «8،43»

هۆنەر، لە چوارینێکدا، ستایشێکی پەیامبەری کردووە و گوتوویەتی:
ئەی لە ئەندامی « مەدینە »، جیسمی تۆ، ڕۆحی ڕەوان
دینی پاکت، دایە بەر خۆی قاف، تا قافی جیهان
مەھ لە ئیعجازت، دوو لەت بوو، دینی گرتە ناوەخۆی
مەسکەنت، بوونی « مەدینە »، قابەقەوسەینت مەکان «15،43»

هەروەها، بە چوارینێکی دیکەش، پاڕاوەتەوە و گوتوویەتی:
ئەی کەرەمت، هەم نەفەسی بێ کەسان
بێ توو نییە، هیچ کەسی بێ کەسان
بێ کەسم و هەم نەفەسم، هەر ئەتووی
ڕوو لە چە کەم؟ ئەی کەسی هەر بێ کەسان! «36،43»

هەر چەندە، هۆنراوەکانی، لە ڕووی هونەرییەوە، تا ئەندازەیەکی زۆر لاوازن، زمانەکەی پوخت نییە و زمانی ئاخافتنیشی بەکارهێناوە. بەڵام، هەر چۆنێبێ، لە ڕووی مەبەست و واتاوە، ئەوەی ویستوویەتی، بە خوێنەری گەیاندووە! بۆ نموونە: بە دوو هۆنراوە، ستایشی خوای گەورەی کردووە و لە هەر یەکێکیاندا، بە سێ دێڕ گوتوویەتی:
مادامە، ترس نەما، لە غەیری ذاتی صەمەد
لە هەر زەمان، هەر دەڵێم: یا صەمەد و یا ئەحەد
مەعنای ئەحەد: ذاتی ئەو، لە هەر شتێک تەنیایە
مەعنای صەمەد: بێ فەراغ، جێی ماسوی نەمایە
هەر ئەو هەیە، بانگیکەی، بۆ هەر مەقصەدی هەبێ
دونیەوی یا ئوخرەوی، بۆ هەر کارێ کە دەتبێ «37،43»

لە هەر شتێ دیاربێ، دیارە ڕووی حەبیبم
تەماشایکە، لە هەر ڕوو، ئەی برای صاحب هیمەت !
وجودی تۆش، ئەینوکە، بۆ ڕووی ذاتی پاکی
بێ لە جەمال نابینێ، لە هیچ صاحب ذەکاوەت
گەر، تۆ صاحب نەظەربی، دەبینی صورەتی ئەو
لە سەر تا قەدەمی خۆت، دیارە بە صەراحەت «42،43»

پاشان، بە چامەیەک، ستاییشی پەیامبەری کردووە و بە حەوت دێڕە هۆنراوە گوتوویەتی:

ئەی موحەممەد! گەر دەرمکەی، ڕوو لە کێ کەم؟ بچمە کوێ؟
خۆ، گەدای دەروازەیی تۆ، بالآتری هەر پادشا
« غەوثی ئەعظەم » ! تۆ کوڕی، دڵسۆزی ئەم ذاتەی مەدەد
بۆ دەوای دەردم بپاڕێوە، لە دەرگانەی خودا
بێ قەرار و دەردەدار و دڵفگار، ئێمڕۆ منم
ئەی خوداوەندی شیفادەر! پێم کەرەمکە یەک دەوا
تاکوو ماچکەم، خاکی دەرگای، « ئەحمەد »ی موختاری توو
خاکی ئیکسیرە، لە بۆ ئەنواعی دەردی بێ شیفا
من، بە ڕووی ڕەشمەوە، دێمە لات، چی لێم بکەی
چونکی، شک نابەم، چە جێگای ت،ر حەبیبی کیبریا!
چوومە لای، ڕۆژی فیراقم، دەردی هیجرم عەرض کرد
وەصلی من یەکسانە فەرمووی، بۆ هەموو ئەهلی منا
« فانیی » ! یا دەرمانی دەردت، هەر لە یەک جێگایە بەس
تاکوو ماوی، هەر بکەی هاوار، خودا هاوار، خودا ! «43،40-41»

وەک دیدێکی فەلسەفیی و ئایینیی، لە سەر بوونی مرۆڤ و یەکێتی خوداش، لە دوو هۆنراوەی جیاوازدا گوتوویەتی:

بە بیرت دێ، کە هاتییە ڕووی دونیا
لە گریان بووی و عالەم بۆ تۆ خەندان
کە مردیشی، یەقینە پێکەنینت
لە خزم و دۆستەکانیشی، شین و گریان «43،43»
ئەشکالی عالەم، شووشەی گوناگون
وەک ڕژا سەریان، شوعلەی ڕۆژی ڕوون
لە هەر شووشەی، بێ کەم و زیاد
هەر عەینی شوعلەی، خۆی تیا نواند
بە ڕەنگی شووشە، چی زەرد بێ، چی سۆر
چی سپی، چی ڕەش، چی سەبز و چی بۆر «43،44»

* * *

# « کەمـــــــــــــالیی »

## « 1974 - 1886 »

زۆربەی هەرە زۆری هۆنراوەکانی، لە زەریای ئەڤین و دڵدارییدا نقووم بوون. چەن هۆنراوەیەکی کەمی، بۆ نەتەوە و نیشتمانەکەی گوتووە. هەروەها، چەن هۆنراوەیەکیشی، لە ستایشی یەزدان، پەیامبەر و پیاوچاکاندا داناوە. بەڵام، لەگەڵ ئەوەشدا، پیاوێکی موسوڵمان و خواپەرستبووە. تەنانەت، دانی بە هەڵە و گوناهەکانی خۆشیدا ناوە، لە سۆز و میهرەبانیی یەزدانیش، بێ هیوا نەبووە و بە دوو دێڕە هۆنراوە گوتوویەتی:

لە دەشتی مەعصیەتدا، تاکوو توانیم، ئەسپی خۆم ڕانی
بەجێمهێنا، هەموو کردار و پیشەی پیسی شەیتانیی
لەگەڵ ئەم حاڵەشا، یا ڕەب ! لە عەفوت نائومێد نابم
کە چونکە تۆم هەمیشە، هەر بە تەنیا و تاک و حەق زانی «142،49»

جگە لەوەی، بە شەش دێڕە هۆنراوەی دیکە، باسی خۆی بۆ کردووین، لە دوو دێڕی کۆتاییشدا، پتر خۆی پێ ناساندووین و گوتوویەتی:

خۆ « یەزید » نیم، تاکوو ببمە، دوژمنی ئالی « عەلی »
شێت نەبووم، تابی عەذابی ذاتی ئەڵڵاهم نییە
من سەگی قاپی، « ڕەسووڵە ڵڵا » و ئەولادی « عەلی »م
بەندەیی زارم، خەیاڵی ڕوتبە و جاهم نییە «114،49»

لە باسی پەیامبەریشدا، بە چوارینەیەک گوتوویەتی:

نەکەم، گەر مەدحی ئەو ذاتەی، کە فەخری جین و ئینسانە
مەڵێن، خەڵکە « کەمالیی »، کافر و بێ دین و ئیمانە
گونەهکارم، دەمم پیسە، ئەگەر، ناوی نەبەم حەقمە
چ مەدحێکی بکەم! خۆ مەدحی ئەو، ئایاتی قورئانە «115،49»

کاتێکیش، « کەمالیی »، ڕووی لە دەرگەی پڕ لە سۆزی یەزدان کردووە و پاڕاوەتەوە، بە دوو دێڕ هۆنراوە گوتوویەتی:

یا ڕەب! ئەزانم، کە تۆ خەبیری
خالقی هەموو، خەڵقی بەصیری
بۆ ڕجا هێنام، وا بۆ خزمەتت
کوێریی و ڕووڕەشیی و مووی سپیی و پیریی «144،49»

دەربارەی خواناسیی ڕاستەقینەش، بە چوار دێڕ هۆنراوە گوتوویەتی:

خودا ناناسرێ، بە لیباسی جاو
بە خەرقەی دڕاو، جل پینەکراو
بە شەرتێ، خودا بناسی بە حەق
لەبەرکە، بەرگی سوورمە و ئیستەبرەق
بە کڵاوی قووچی، ئاوێنەلەسەر
بە عەسا و کەوڵی، پێستی بزن و مەڕ
لەمانە هەموو، صەرفی نەظەرکە
بە دڵ خواناسبە، شەپقە لە سەرکە «178،49»

وا دیارە، « کەمالیی » هۆنەر، « شێخ عەبدولقادری گەیلانیی »، زۆر خۆشویستووە و گەلێ پێوەی سەرسامبووە! بۆیە، وا بەو شێوە بەرز و جوانە، بە دە یڕە هۆنراوە، ستاییشیکردووە و گوتوویەتی:

سەرداری ئەولیای جیهانیی، پێشەوایە غەوث
بۆ گومبووانی ڕاهی هودا، ڕەهنمایە غەوث
ئەولادی فەخری عالەمە، سەردارە، سەییدە
نووری دوو دیدەی، حوسنی مەحەببەتە غەوث
شابازی عەرشی حەضرەتی، ذاتی ئیلاهییە
یەعنی، بە جوملە سرڕی خودا، ئاشنایە غەوث
« صەنعان »، خیلافی ئەمری ئەوی کرد، بوو بە گەور
ئەمری، هەتاکوو ڕۆژی قیامەت، ڕەوایە غەوث
دەرمانی دەردی مەینەتیی، دنیا و ئاخیرەت
قوربانیبم، لە لای ئەوە، موشکیل گوشایە غەوث

بۆ تەوفی ڕەوەیی ئەوە، دائیم مەلائیکە
شەڕیانە، پادشاهی مەلائیک، سوپایە غەوث
پشت و پەناهی بێ کەس و داماوی عالەمە
پەیوەستە، دەستگێڕی هەژار و گەدایە غەوث
مردووی زیندووکردەوە، وەک حەضرەتی « مەسیح »
واقیف بە سرڕی، بارەگەهی کیبریایە غەوث
کەناسی بەردەری ئەوە، شاهانی ڕووی جیهان
بۆ ژانی دیـــــدە، خاکی دەری، تووتیایە غەوث «67،49»

هەروەها، هۆنراوەیەکی زۆر ناسک و نایابیشی، لە ستاییشی « کاک ئەحمەدی شێخ »دا هۆنیوەتەوە و بە دە دێڕ گوتوویەتی:
گوڵ و گوڵاڵەی بەهارم ناوێ، بێ تۆ، ئەی نیگاری من !
گوڵی ڕووتە عەزیزم ! خۆ گوڵ و گوڵاڵەی بەهاری من
بە ماچێکی دەمت، گەر بێت و تۆ، چارە نەکەی دەردم
لە ڕۆژی مەحشەرا، ئەگرێ بەرۆکت، گیانی زاری من
بە یەک لەحظە، لە گەردوون تێپەڕی، بۆ عەرشی ئەعلا چوو
فیداتم، شاهبازی عەرش و شیرین شاسواری من
سەگی دەرگانەکەی، « کاک ئەحمەدی شێخ »م، تەمادارم
تکای عەفووم بکە، ڕۆژی جەزا « شێخ »م ! لای کردگاری من
ڕەئیسی ئەولیایە، قوطبە، یەعنی: واریثی « عەوث »ە
پەناه و پشتیوانی کورد، مایەی ئیفتیخاری من
ئەکەم ڕۆحم فیدای ئەولادی، لاکین، پیرم و کوێرم
نییە لاییق، بە قوربانی ببێ، گیانی هەژاری من «95،49»

* * *

# « چڕوســــــــــــتانیی »

## « 1963 - 1890 »

له نێـو کـۆشی بـنـهمـاڵهیهکی مـوسـوڵمـانـدا، چاوی به ژیان هەڵێناوە. پشـتـاوشت، هـەر « مـەلا » بوون. لەبەرئەوە، شـتێکی سـەیر نییە، گـەر، هۆنراوەی ئاییـنیی گـوتبێ، لە یەزدانی مـەزن پاڕابێتـەوە، سـتاییـشی پەیامبەر و پیاوچاکانی کردبێ.

لە چامـەی « حـەوت چینی چیـمـەن »دا، بە « 131 » دێڕ هـۆنـراوە، لـە یەزدان پاڕاوەتەوە، تـا، لە گوناهەکـانی خـۆشـبێ. هانای بۆ پەیامـبـەر بردووە، تا، لای خوا تکای بۆ بکا، بەر سۆز و میهرەبانیی خۆی بخا!

بە چاولێکەریی، لە خواناس و سۆفییەکی وەک « مەحویی »، سەراپای چامەکەی، بە ستاییشی پەردەردگاری مەزن و پەیامبەری خۆشەویست ڕازاندۆتەوە، لە چینی شەشەمدا پاڕاوەتەوە و گوتوویەتی:

چ ژەنگینە، دەر و ناوم، دەڵێی، لێیداوە مۆرانە
عیلاجم، هەر لە خواپاڕانەوە و ئیقراری تاوانە
قسەم زل، هیچ لە بارمدا نییە، بمبێ ئەگەر
ڕەقیبان، ڕق، ئەگەر بگرن، بدەن لێم تانە، هەقیانە
دەمم، گەرچی تەڕە، کاسەم، گەلێ وشکە گەلێ، یەعنی
قسەم، شیرین و خۆشە، کردەوەم، زۆر تاڵ و ناجوانە
لە ئاداب و شیعارا، بێ شعور و بێ ئەدەب ماوم
دەر و ژووری وجوودم دەردە، زۆر داماوی دەرمانە
ئەگەر چیی، قەول و فیعلم ظاهیرا، تۆزێ لە ڕێی شەرعە
بەڵام، سەر تا بە پێم، نوقمی گوناه و فیسق و « عوصیان »ە
ئەگەر چی، شەرمەساری باری ئەتواری بەدم، ئەمما
بیحەمدیللا، عەقیدەم صافە، قەلبم زەرفی ئیمانە
شوکور، ئێستە لە ئیسلامم، دەمێنێ حوسنی ئەنجامم
ئەگەر، ئیمدادی هادیی بێ، حیمایەیکا چ ئاسانە «95-94،12»

پاشـــان، لە « چینی حـــەوتەم »دا، پەنای بۆ پەیامـــبـــەر بردووە و گوتوویەتی:

لە مەحشەردا، شەفاعەتکردنی طاها، ڕجامانە
کە عەزم و هیممەتی، بۆ ئوممەتی داماوی، دەرمانە
شەفیعێ « ڕەحمەتو لیلعالەمین » بێ، غیرەتی وایە
نەبێ ڕازی، ببینێ ئوممەتی، دووچاری خوسرانە
شەفاعەتیە ئومێدم، گەر چی، بێ مایەم لە پەیڕەویا
کە ئەو کانی کەرەم، دەسمایەی ڕەحمی گەدایانە
بە جاهی خۆت، لە ڕۆژی « ئومەتی »، « و ئیشفەع تەشفەع »دا
لە هاوارم وەرە، وەختێ، جەنابت صەدری دیوانە
لە دنیا، ڕیققەتت حەتتا بە کافر بوو، لەوەو دنیا
لە بەدکارانی ئوممەت مژدە، ڕەحمت مەعدەن و کانە
بە وەعدەی « سەوفە یوعطیکە » و « فەتەڕضا »، خوا کە مژدەیدا
بنازن، ئوممەتانی « مصطەفا »، خۆشی لە خۆمانە
خودایێ، ڕەحمی وا، پێغەمبەرێ، دڵسۆزی ئاوابێ
بە دووری دامەنێ، کێوی گوناه، ئەر بێ بە زیزانە «12،100-101»

لە کۆتایی، چامە دووروودرێژەکەشیدا، بە چاوێکەریی لە « مەحویی »، جارێکی دیکە، دەسی بە دامێنی پەیامبەرەوە گرتووە و گوتوویەتی:

فەرامۆشم مەکە، « یا ئەکرەم ئەلخەلق » ! لەوەو دنیا
ئەگەر، تۆ « صەدر »ی، من وەک « ذەرە »، هەر دەستم بە دامانە
ئەیا « فەخر ئەلعەرەب » ! من چاوەڕێی لوطفم، کە هاوناوم
بە ناوت، گەر چی کوردم، نیسبەتی ئەصڵم « چرۆستان »ە
لە ئادابی طەریقەت، کە تەریقم، وشکە ئیخلاصیم
بە دەرگای شای « بوخاریی »، بازی ئەشهەب « غەوثی گەیلان »ە
دوعای خێرم ڕجایە، ئەی براگەل ! بۆم بکەن خێرە
ئەگەر چی شیعرەکانم، وەک دڵم خاو و پەرێشانە «12،107»

* * *

## « فــــــــــــــــــوواد »

## « 1925 - 1892 »

گەلێ هۆنراوەی، بە « کوردیی، فارسیی و توورکیی » هۆنیوەتەوە. هۆنراوەکانی پتر، لە خولگەی ڕۆمانسیی و نیشتمانییدا دەخولێنەوە. شوێنپەنجەی « نالیی »، بە بیر و هۆنراوەکانییەوە دیارە. لەگەڵ ئەوەشدا، « فوواد »، هێندێ هۆنراوەی ئایینیی داناوە. ئەوەتە، لە هۆنراوەی « خودا کەسی بێ کەسانە »دا، زۆر بە جوانیی و تەواویی، ئامانجی پێکاوە و گوتوویەتی:

ئەو کەسەی وا بێ کەسە، مادام خودا بۆ ئەو کەسە
بۆ دەڵێن: بێ کەس بە بێ کەس، خۆ هەر ئەو صاحێب کەسە
هەر زامداران، لە دەس ئەهلی زەمان فەریادئەکەن
بێ هەرا و ئاسوودە، ڕاستی گەر کەسێ بێ، ئەخرەسە
سەد هەزار پەند و نەصیحەت، بۆ نەزان سوودی نییە
ئەو کەسەی صاحێب شعوورە، یەک ئیشارەی بۆ بەسە
حاڵی دڵ، مەکشوفی دەرکی کۆتە، هی هەر کەس نییە
گەوهەری دەریا لە کوێ، هەر مەشهودی خار و خەسە
بێ ئەمەل، بێگانەیێکی تۆی دەوێ، داینێ بە کەس
گەر برات بێگانە مەشرەب بێ، لەگەڵتا ناکەسە
گەر دەڕۆی ئەی با! بە لای خاکی مەزاری « نالیی »یا
دوای سەلام، ناو و نیشانی من بڵێ، بەم ئادرەسە
وا « فوواد » ناوێ، لە « کەرکووک »ا، وەکیلی نەظمتە
دا نەڵێی: موڵکی ئەدەب، ئێستا لە کوردا بێ کەسە «15،37»

* * *

# « ئەسیریی »

## « 1962 - 1895 »

هەر چەندە، هۆنەر، گەلێ هۆنراوەی، بە زمانەکانی « کوردیی، فارسیی، عەرەبیی و توورکیی » هۆنیوەتەوە. بەڵام، لە ڕاستییدا، هۆنراوەکانی، لە ڕووی هونەری هۆنراوەهۆنینەوەوە، زۆر لاوازن.
گەر چی « ئەسیریی »، گەلێ هۆنراوەی ئایینیی گوتووە، بۆ دۆست و ناودارەکانی کورد گریاوە، ستاییشی گەورەپیاوان و سەردارانی کوردی کردووە. بەڵام، هەموو ئەوانەی، لە دید و بۆچوونێکی نەتەوەیی و نیشتمانپەروەرییەوە گوتووە، تەنیا هەر، باسی پیاوە زانا، دانا، بلیمەت و ناودارەکانی کوردیشی کردووە.
لەگەڵ ئەوەشدا، وەک کوردێکی موسوڵمان و خواپەرست، درێغی نەکردووە، دوو هۆنراوەی ئایینیی وەک: « خوا هەبوو و مودیری جاذبیە »ی، بۆ پەروەردگاری مەزن، چوار هۆنراوەشی، لە ستاییشی پەیامبەری هێژادا هۆنیوەتەوە.
ڕەنگە، هۆنەر، یەکەمین هۆنەری کورد بووبێ، بیری لەوە کردبێتەوە، زانست و خواپەرستیی، لەگەڵ کاری هونەریی و وێژەییدا تێکەڵاوکا، هۆنراوەیەکی پڕ بایەخ، لە ستاییشی پەروەردگارا بهۆنێتەوە! بۆیە، لە هۆنراوەی « مودیری جاذبیە »دا، یەزدانی گەورەی، بە ئەندازیارێکی گەلێ کارامە و بلیمەت داناوە، کە هەموو گەردوون بەڕێوەدەبا، ئەو هەموو بوونەوەرەی دروستکردووە، ڕایگرتوون و بەڵەنسێکی تەواویی، لە نێواندا کردوون. لەبەورئەوە، ڕووی دەمی، لە خوای خۆی کردووە، بە سیوهەشت نیوە دێرە هۆنراوە و لە سەرەتدا گوتوویەتی:

ئەی مودیری جاذبیەی کوڕات و ذەڕەی کائینات !
شاهیدی بوونی تووە، سووڕانی مانگ و ڕۆژهەلات

بیری « لاپلاس »، لە « فیثاغۆرس »ی چاتر شاهیدە
گۆی بڵندانی زەوی، گەڕیدەیی چۆڵی سەرات
کـەمێ دواتر، دەربارەی دید و بۆچوونی « مـەتریالیـست »ەکـان و بەندەکانی خوا، گوتوویەتی:

فەرمەسۆنان، وا دەڵێن: بێ مادده، پەیدا نابێ هیچ
مادده نەبوو، چۆن پەیدابوو، ئەو سەحاب و ڕەوشەنات
بەندەکانت، هەندێکی ڕێگەی بە هیوا بردووە
گومبووە هەندێکیش، شێواوە، داماوە لە ڕات
هەور و باو و باران، ڕۆژ و شەو، هەمووی پێویستییە
حیکمەتی تۆیە، فەقیریی و دەوڵەمەندیی، هات و نەهات
لەم ئیدارەی تۆ کە دەیکەی، تێدەفکرم، چاترێ
بۆ بەنیئادەم نییە، بۆ ڕێکوپێکێتی وولات

دواتر، باسی بوون و گەورەیی خوای کردووە و گوتوویەتی:

تۆ هەی و نابینرێی، بەجێی، لە هەر جێ هەی
ڕۆح و نەفسی خۆم، دەلیکێکە لە دەسما، وەک بەرات
ڕێکی دەوری جیهان، تێک ناچێ، دیارە، هەر یەکی
بەم یەکیت دیارە، نییە ڕۆڵە و کەس و برات

لە کـۆتاییـشـدا، داوای لە یەزدان کـردووە، یارمـەتیی کـورد بدا، ئاواتەکانیان بەدیبێنێ. پاشان، ڕووی دەمی، لە ڕۆڵەکانی نەتەوەکەی خـۆی کـردووە، داوای لێ کردوون، کـاربکـەن، پارە پەیداکـەن و ڕوو لە قـاپی سـۆزی یەزدان بکەن. ئیـدی، بەو شـێـوەیە، هۆنراوەکـەی، بە کێشەی نەتەوەکەیەوە گرێداوە و گوتوویەتی:

ئەی خودا! ڕەحمێ، بە قەومی میللەتی کوردم بکە
مەیلی فەرمانت ببێ، ئاسانە، زوو پێکدێ ئاوات
لاوی من، تۆ، کارگەری زانین و پەیداکەی دراو
ڕوو لە دەرگای خوا، دوعاکا سەیید و شێخ و مەلات
زووبەزوو پێکدێ « ئەسیریی » ! ئەوجا، هیوای گەلت
بەخششی زۆرە، دەهەندەی نابڕێ، قەت لێت بەرات «88-87،4»

لە هۆنراوەی « دیسـان سـتاییشی پێغـەمبـەر »دا، بە شـێوەیەکی زۆر ڕوون و ڕەوان، بە یازدە دێڕ هۆنراوە گوتوویەتی:

فەخرئەکەین، سەر بە کەسێکین، لە جیهان یەکتایە
بە هەموو کردەیی چاکە و بە کتێب و ئایە
سەرفرۆی قووەی ئیعجازی کەلامن، بولەغا
شیعریان نەسرە، نەیانزانی کتێبی، ئودەبا
موتەحەییر بوون، لە تەئسیری وتەی ئەو، خوتەبا
کە موحەممەد، لە کەسێ، دەرسی نەدی، ئەلفوبا

* * *

سەرتاسەر، خاکی « جەزیرە »ی، هەموو ئیستیلاکرد
خەڵکەکەی کردە موسڵمان، لەوێ شیرکی لابرد
تەربیەی دایە بەشەر، وەحشەت و زوڵمی لابرد
نەیبوو ماڵ، نەیبوو هەواڵ، خواهشی گشت پەیداکرد

* * *

خزمەتێکی بەشەرە، دینی موبینی پاکی
پاکییە و ژینە، لەگەڵ یەکترا، کردەی چاکی
مەردیی و بەرزیی، بۆ یاریدە و هەم بێ باکیی
یا موحەممەد! لە بەشەر، ئەشهەدوبیللا تاکی

* * *

هەیە بەم جۆرە کەسێ، بێ لە حەیاتی مەنسوور
دوژمنی گشتی، پەرێشان و فەنابێ مەقهوور
دابنێ دینی وەها، لەشکر و نەزم و دەستوور
ڕەحمەتی خوا، بۆ وجودی زەوی، بەو بوو پڕ نوور

* * *

گەر بخوێنیتەوە، تەئریخی پیاوی عوزەما
هەرچەنێ پیاوی جیهانگیر، پیاوی حوکەما و نودەما
ئەنبیا و موسلیحی ڕووی ئەرز، ملووک و شورەفا
تێدەگەی، سەروەری گشتیان موحەممەدە و ما «97-96،4»

* * *

# « خـــــــــــــادیم »

## « 1971 - 1895 »

هۆنەرێکی دیکەی کلاسیکیی کوردبووە. گەلێ هۆنراوەی ناسکی، لە بوارەکانی خواپەرستیی و ئەڤیندا داناوە. لە ژیانی « خادیم »دا، ئەڤین رۆڵێکی گەلێ مەزنی وازیکردووە. بۆیە، لەگەڵ ئەڤینەکەی خۆیدا، زۆر ڕاسگۆبووە، دڵدارێکی مەزنبووە، کوشتەی ئایین و جوانیی سروشت بووە، تا بڵێی، هۆنەرێکی پاک و لە خواترسبووە.

« خادیم »، وەک خواپەرستێکی ڕاستەقینە، گەلێ هۆنراوەی، لە خۆشەویستیی یەزدان و پەیامبەرە ئازیزەکەیدا هۆنیوەتەوە. بە شێوەیە، لە بۆتەی ئەو ئەڤینە خاوێنەدا قاڵبووە و وەک سۆفییەکی لێهاتووە.

کاتێ، خوێنەری زیت و وریا، چامە دووروودرێژە شەستوهەشت دێرییەکەی « تەوحید » دەخوێنێتەوە، یەکسەر، وێنەی موسوڵمانێکی پاک و ڕاسگۆ دەبینێ. وێنەی « خادیم »ی کورد دەبینێ، لە نێو دەروازە بە سۆزەکەی پەروەردگاردا، بە ملکەچیی ڕاوەستاوە، دەسی بۆ ئاسمان بەرزکردۆتەوە، ڕووی زەرد هەڵگەڕاوە، لچ و لێوی وشکبووە، پەیتاپەیتا، هەناسەی سارد هەڵدەکێشێ، هەر دوو چاوی تەڕبووە، دڵۆپدڵۆپ، دانەی ئەشکی مرواریی، وەک بارانی بەهار، بە چاوەکانیدا، بە خوڕ دەبارێ، بە سەر ڕوومەتە چرچ و لۆچەکەیدا، بە سەر ڕیشە لوول و درێژە سپییەکەیدا، جۆگەلە دەبەستن، بە ترس و لەرزێکی بێ وێنەوە، بە داماویی و کەساسییەوە، بە دەم هەناسەی سارد و قوڵپی گریانەوە، بە دەم پاڕانەوە و لالانەوەوە، ستایشێکی جوان و بەرزی، یەزدانی کردووە و لە چوارەمین دێڕدا گوتوویەتی:

مەرهەمی داغی دڵی عاشق، لە حەرفی ناوی تۆ
گوڵشەنی عاریف، بە یادی تۆیە، پڕ نەش و نوما
وا پەرێشانم، لە مەوجی بەحری فکرت، هەر شەوێ
سەر لە جێی پێ دادەنێم، چەرخم میثالی ئاسیا
ئەنبیا، بۆ پرتەوی خورشیدی ڕووی تۆ، گێژووێژ
چۆن لە ئەوجی، نووری وەحدەت دان، هەموویان زەڕڕەسا
ئەولیا، بەو داغەوە چوون، کە تێ ناگەن لە تۆ
هەم مەلایک، گێژ و سەرسامن، لە بێچوونیی و چرا
سۆزی عاشق بوو، کە تەئثیری لە لوطفی ئەو ئەکرد
ڕشتەیی جاذیب بوو مەیلی، میثلی کا و کارەبا
جەذبی لوطفی ئەو نەبێ، ناگا بە مەقصەد قوربەسەر
عاشقی بێ چارە، پەروازی بە ئەوجی کیبریا
پاشان، درێژەی بە چامەکەی داوە و گوتوویەتی:
مورغی عەقڵی سەد « فلاتوون »، لەم مەقامە هەڵفڕی
ئاگری حیرەت، پەڕ و باڵی ئەسووتێنێ وەها
مشتە خاکێکی وەکوو من چیم و بۆچی، دەستئەدەم؟
کەڵکی چی ئەکرم لە ڕوویا، موو سپیم و ڕوو سیا؟
ئەو لە حەرفی کاف و نوونێ، هەر دوو کەونی کرد وجوود
حەرفی کاف و نوون سەبەببوو، جیلوەی خودا پەیدا
دوای ئەوەی، زۆر بە درێژیی، لە گەورەیی و دەسەڵاتی یەزدان دواوە، لە کۆتاییشدا، بە چەن دێڕێ، باسی باری ژیان و تەمەنی خۆی کردووە و گوتوویەتی:
هەر چی خۆی نەیکات و نابێ، هەر چی ئەو نەیدا، نییە
بێ ئیرادە و ئەمری ئەو، کۆتا نابێ، دەستی ڕجا
وا لە بەر پیریی، دووتابووم، لە ژێر باری گوناه
چینی ئەبرۆم، قەط نەبینراوە، لە بەر قەددی ڕووتا
موختەصەر خۆشە، نەدوێم، ئەدەب باشە، بەسە
قوڕ بە سەر مێشوولە، لە پەروازی بە ئەوجی کیبریا
لێرە فانیی بوو، تەخەللوس، مەطڵەعی تر دێتە پێش
هەر شتێ، فانیی نەبێ، ناگاتە ئەقلیمی بەقا «21،44-47»

هەروەها، لە چامەی « نوور »دا، بە سەدونۆزدە دێڕ، باسی خەسڵەتە چاکەکانی پەیامبەر، هاوەڵەکانی، کەسوکاری کردووە و گوتوویەتی:

ئەی پێشەوای مەحفەلی، سالاری ئەنبیا!
وەی ڕەهنومای جانی، عەزیزانی ئەولیا!
ئەی شەمعی جەمعی، مەجلیسی ڕەوحانیانی عەشق!
پەروانەیە بە دەوری تۆ، ئەرواحی ئەتقیا
ئەکسیری خاکی دەرگەهی، دار ئەلئەمان ـ ی تۆ
وەک سوورمەیە، بە چاوی جیهانبینی ئەسفیا
لەم ئاستانە، عالەمی کەون و مەکان هەموو
سەر دادەنێن، لە خاکی دەرت، ڕووی ئیلتیجا
نەقشی جەبینی زائیرەکانت، لە خاکی دەر
زیاتر، لە نەقشی پایە، وەکوو نەقشی بو ریا
دڵ ئارەزوویەتی، کە بنووسێ لە مەدحی تۆ
ئەشعاری پڕ سەخا و نیکاتێکی دڵ هوشا

جا تاماشاکەن! ئەم دێڕەی چەن جوانە، کاتێ، وێنەیەکی یەکسانی موسڵمانانی بۆ کێشاوین، کە نوێژی بە کۆمەڵ دەکەن. چۆن، هەموو بێ جیاوازیی، لە بەردەم پەروەردگاردا، بە مات و مەلوولیی، پێکەوە بە ڕیز وەستاون، شا و گەدا تێکەڵبوون و وەک یەکیان لێهاتووە:

لەم دەرگە عالییە، کە ئەوەستن گەدا بە صەف
هەرچی گەدایە، شایە، ئەوەی شایە، ئەو گەدا

لە کۆتایشدا گوتوویەتی:

گەر، هەوری هیممەتی تۆ، لە سەحرا گوزەربکا
مەوجی سەراب، ئەبێتە قولزووم لە بەر سەخا
بێ دەنگبە « خادیما »، بە ئەدەب لەم مەقامەدا
سەر دابنێ، لە خاکی دەری تۆ، لە جیاتی پا
تا کەی ئەدەی، بە بووکی قسەت، ناز و عیشوەی؟
لەم دەرگە، عیجز و زارییە، کارت وەکوو گەدا «21،55-60»

« خادیم »، کۆمەڵە هۆنراوەیەکی جوان و درێژی، دەربارەی « ئایدیای بەرز، دروسبوونی مرۆ، ڕێی دۆزینەوەی خواپەرستیی و هەڵسوکەوتی

ئاییـنـداران » داناوه، لـه « 234 » پارچه هۆنـراوه پێکهـاتووه، هەر پارچەیەکـیش، لە نێـوان « 5-10 » دێـڕه هـۆنـراوه دەبـێ و لـه دیوانەکەشیدا، « 183 » لاپەڕەی داگیرکردووە! وەک خۆشی گوتویەتی: چاوی لە هێندێ هـۆنەری « فـارس »ی وەک: « میـرزا عـەبدولقـادری بێ دڵ، جـامـیی، نیـزامـیی و سـەعـدیی » کردووه. ئەز لێرەدا، تەنیـا یەک پارچه هۆنراوه، بە نموونه دێنمەوه.

هۆنەر، لە پارچەی « 24 »دا و بە بیست دێڕە هۆنراوە، بە چاولێکەریی لە هۆنەری خواناس و سۆفیی کورد « مەحویی » گوتوویەتی:

لە ڕێگەی عەشقیا، دڵ شۆڕشێ نەکا، چ بکا؟
لە دووریتا، هەموو شەو، ئاهوواوەیلا نەکا،چ بکا؟
ڕەمی چاوی غەزالان، حەلقەی زنجیرە، بۆ پێی دڵ
ئەگەر دێوانە، ڕوو هەردەم، لە ڕووی سەحرا نەکا، چ بکا؟
لە نەشئەی مەی بوو، عاشیق شاهدی، عەهدی « ئەلەست »ی دی
وجوودی ئاو و خاکی خۆی، ئەگەر سەهبا نەکا، چ بکا؟
لە فەیضی صوحبەتی پیری موغان، بوو، کیمیای دەستکەوت
لە یومنی مەی، ئەگەر خۆی یەکە و تەنها نەکا، چ بکا؟
لە مەوجی مەی، لە ساغیردا، جەمالی دولبەری دیوە
ئەگەر سەر دانەنێ، هەم سرڕی خۆی، ئەفشا نەکا، چ بکا؟
لە سەحرای جنوون، دڵ، مەشقی وەحشەتییە هەموو کاتێ
لە جوستوجۆ، سۆراغی خەیمەی « لەیلا » نەکا، چ بکا؟
لە بۆ قەتلی منی میسکین، بە تەحریکی برۆی دولبەر
ئیشارەت گەر بە مەوجی، چاوەکەی شەهلا نەکا، چ بکا؟
دڵی موفلیس، خەریداری جەمالی « یوسف »ە ئەمڕۆ
لە بازاڕی محەببەت، عیشق ئەگەر سەودا نەکا، چ بکا؟
لە جامی وەحدەتا، مەخمووری ڕەحراحی ئەزەل بێ دڵ
بە مەوجی جیلوەگەڕ، دەیجووریان بەیضا نەکا، چ بکا؟
هجوومی بۆ دڵی « خادیم »، کە هێنا جیلوەی عیشقی
لە بازاڕی محەببەت، خۆی ئەگەر ڕیسوا نەکا، چ بکا؟ «21،100-101»

* * *

# « شێخ محەمەد عوسمان
# سیراجەددینی نەقشبەندیـــــــــی »

## « 1997 - 1896 »

دوای ئەوەی، « شێخ عەلائەددین »ی باوکی، ساڵی « 1954 »، گیانی پاکی، بە یەزدانی گەورە بەخشی و کۆچیدواییکرد، « شێخ عوسمان »، لە جێی دانیشت.

هۆنەر، یەکێ لەو هۆنەرە کوردانە بووە، بە هەر دوو دیالێکتەکەی زمانی کوردیی: « گۆران ـ هەورامانیی » و « کرمانجیی ـ کرمانجی خواروو »، هەروەها، بە زمانی « فارسیی »، گەلێ هۆنراوەی ئایینیی هۆنیوەتەوە. بە زمانێکی ساکار و ڕەوان، بە کوردییەکی تەڕ و پاراو، لە هۆنراوەی « پاڕانەوە لە خزمەت ڕەسوولی مەدەنیدا »، بە دوازدە دێڕە هۆنراوە، لە پەیامبەر پاڕاوەتەوە و گوتوویەتی:

یا ڕەسولەڵلا ! ذەلیلم، سا بە قوربان، هیممەتێ
شەرمەزار و دڵ بریندارم، بە قوربان، هیممەتێ
تینوی دڵ ئاورینی، قەترەیێکی ڕەحمی تۆم
ڕێزەخوار و کەلبی دەرگاتم، بە قوربان، هیممەتێ
بەحری زەخخاری « فەتەڕضا »، تۆی دووڕی یەکتایی حەق
موستەحەققی ذەڕڕەیێ لوطفم، بە قوربان، هیممەتێ
نیمە تۆشە و زادی ڕێ، بێ طاعەت و بێ تۆشە خۆم
ناسزایە تۆشە، بۆ دەرگای کەریمان، هیممەتێ
مووی سپی و ڕووی ڕەش و زەردم، ئەوا هێنا حوزوور
قۆچی قوربانم، ئەوا قوربانە، قوربان! هیممەتێ
تاجی شاهیی و گەورەییتە، ئایەتی « ن. و ئەلقەلەم »
مادیحی تۆیە سەراسەر، سیڕڕی قورئان، هیممەتێ
خۆ، لە سینەی سینەتا، سیڕڕی « ئەلەم نەشرەح لەکە
صەدرەکە »، شەرحی دڵی تۆیە، بە قوربان، هیممەتێ

« ڕەبوکە یعطی فەتەڕضا »، تۆی ڕومووزی کەنزی حەق
ئەی سوپاسالاری ڕەحمەت! تۆ و قورئان، هیممەتێ
« وە ڕەفەعنا لەکە ذیکرەکە »، بۆ بڵندیی قەدری تۆ
ذیکری تۆ، ویردی دڵی زارم، بە قوربان، هیممەتێ
ئەی شەهی « لەو لاک لەو لاک »، قابەقەوسەینت مەقام
تۆ و « سوبحانە ئەللەذی ئەسرا »، بە قوربان، هیممەتێ
من سەگی کوێم، نیمە قابیل، وەصف و مەدحی تۆ بکەم
مادیحی تۆ « جوبرەئیل »ە، پەیکی قورئان، هیممەتێ
شاسواری عەرصەیی مەیدانی حەق، ڕۆژی جەزا!
تۆ مەبە غافڵ لە « عثمان »، سا بە قوربان هیممەتێ «13-12،13»

هەروەها، لە هۆنراوەیەکی دیکەشدا « غولامی دەرگەهی تۆم »، بە حەوت دێڕ، لە سەر شێوازی « وەفایی »، بە سەر « شێخ عەلائەددین »ی باوکیدا هەڵداوە و گوتوویەتی:

غولامی دەرگەهی تۆم، قوربانی حەضرەتی تۆم
ئەسیری خاکی ڕێی تۆم، ڕۆحم لە ڕێت داناوە
غەم با بڕوا، شادیی بێ .. شادیی غەم ئازادیی بێ
گەر شەهـ لوطفی هادی بێ، تانەم لە شاهی داوە
دڵم کردە، نیثاری ئایاتی، مەصحەفی ڕووت
بە ئیعجازی دوو ئەبرووت، ساقیی، دڵم شکاوە
فوارەی چاوەکانم، جۆش و قوڵی هەڵداوە
« ساوە »ی سینەی دڵ وشکە، چاوەی چاوم خوێناوە
شاهی « عەلائەددین »ە، شەمسی سەما و زەمینە
کەنزی ئیمان و دینە، دڵم عیشقی بەو داوە
قەزاگەردانی تۆ بێ، ڕۆح و گیانی شیرینم
فیدای تۆزی ڕێگەت بم، جارێک، لاکە بەم لاوە
دائیم، مەحوی هەواتە « عثمان »، سەگی دەرگاتە
سەربەرزی گشت وڵاتە، لەم لاوە، یا لەو لاوە «17-16،13»

* * *

## « کانیـــــــــــــــی »

## « 1957 - 1897 »

هۆنەر، لە چامەی « لە ستاییشی سەییدێکدا »، بە کامی دڵی خۆی و تا توانیوێتی، بە سەر پەیامبەر و نەوەکانیدا هەڵیداوە و هۆنراوەکەی پێ ڕازاندۆتەوە. لە ڕوانگەی خەسڵەتە چاکەکانی، باوە گەورەکانی ئەو « سەیید »ەشەوە، ستاییشێکی بێ وێنەی کردووە، وەک گەورەیەکی بێ هاوتای ئەم جیهانە، لێی ڕوانیوە. پێی وابووە، هەموو ئەو خەسڵەتە چاکانەی، لەو « سەیید »ەدا کۆبوونەتەوە، پشتاوپشت و نەوە دوای نەوە، لەو پەیامبەر و پیاوچاکانەوە بۆی ماوەتەوە، کە لە نێو خەڵکدا، ناویان دەرکردووە و ناوبانگیان هەیە.

نموونەی خەسڵەتە چاکەکانی ئەو « سەیید »ەشی، لە چەن شێوەیەکدا پیشانداوین، گوایە: (لە جەربەزیی و ئازاییدا، وەک « عەلی کوڕی ئەبو طالیب »، لە دادپەروەریی و سەرڕاستییدا، وەک « عومەری کوڕی خەطاب و نەوشیروان »، لە توندیی و کەللەڕەقییدا، وەک « موسا »، لە پاکیی و بەرزیی گیاندا، وەک « عیسا »، لە ژیریی و زیرەکییدا، وەک « لوقمان »، لە جوانیی و قۆزییدا، وەک « یوسف »، لە دەسبڵاویی و دڵفراوانیشدا وەک « حاتەم ») خۆی دەنوێنێ! هەر بۆیە، کاتێ، وەک: « ئەسکەندەری ڕۆم »، ڕووی لە هەر کوێ کردبێ، سەرکەوتووبووە، بەو هونەرە جوانە بەرزانەی زانیوێتی، دوژمنەکانی تێکشکاندووە!

ئیدی، هۆنەر، هەر وا بەو شێوەیە، سەرەتای چامەکەی، بەم چەن دێڕە دەسپێکردووە و گوتوویەتی:

هەر چەند هەبێ، سوڵتان و مەلیک، شاە و حوکمدار
نابن وەکوو ئەو، لایق و دانا، لە جیهانی

سەیید حەسەنی عالی نەسەب، ئالی « موحەممەد »
مەعلوومە لە عالەم حەسەب عەینەن
وەکوو جەددی، ئەسەدوڵلا و شەجیعە
عەدلیشی، میثالی « عومەر » و « نەوشیرەوان »ی
بۆ قەومی عەنوود، وەک کەلیموڵڵایە کەلامی
بێ عیللەتە، مانەندی « مەسیح »، ڕۆحی ڕەوانی
مەنصوورە وەک « ئەسکەندەر »ی، ڕووی بێختە هەر لا
بۆ قەهری خەصم ماهیرە، زۆر فەننی دەزانی
« لوقمان » سیرەت و صوورەتی، وەک « یوسف »ی « میسر »ی
بێ غەل و غەشە، صوورەت و ئەخلاقی جوانی !
نووسراوە لە هەورازی برۆی، « ئینا فەتەحنا »
بێگانە، ئەکا حەلقە بە گۆش، قەندە زمانی
بۆ میللەتی خۆی، ماڵ و سەری « نایەتە پێش چاو »
بۆ خوێنی عەدوو خەنجەرە، جەوهەر خوڕەسانی
حەددی نییە « حاتەم »، لە سەخاوەت وەکوو ئەو بێ
بۆ موستەحەقان موکریمە، دەستی فرەوانی
هەڵ ناستێ ئەبەد، سفرە لە گۆڕێیە گوشایە
والایە هەموو وەختەکی، دەرکەی دیوەخانی
ویردم بووە بەم تەرزە، دوعام خوایە قبوڵکەی
بۆ ناحەزی بێ دەرد و بەلا، دووربێ لە جانی
بۆ خاتری جەددی نەچێ، ئەم چەترە لە سەرمان
مەحفووز بێ، هەتا، موددەکی زۆر عومر و مەکانی
بێ قوەت و قودرەت بێ، هەموو دوژمنی کوێر بێ
تاقانەیە، یا ڕەبی خودا! بیدەی ئامانی
هەند زۆرە صیفاتی حەسەنەی، نایەتە نووسین
هەر چەندی بکا مەدحی، تەواو نابێ بە « کانیی » «31-30،48»

* * *

# « قانــــــــــــع »

## « 1965 - 1898 »

له خواناسیی و ستایشی پەیامبەردا، به تەواویی تواوەتەوە. بۆیه، له هەستێکی خاوێنەوه دواوه، له کانگەی دڵێکی بێ گەردەوە، هاواری کردووه، له ناخی دەروونێکی گەرموگووڕەوه پاڕاوەتەوە، به کەف و کوڵێکی بێ هاوتای، پڕ له خۆشەویستیی و سۆزی دەروێشانەوە، دەستی بۆ ئاسمان بەرزکردۆتەوە، ئەوەی پێی ڕاستبووه، له ستایشی خوا و پەیامبەرەکەیدا گوتوویەتی!

هەر چەندە، هۆنراوە ئایینییەکانی، له ڕووی هونەرییەوه لاوازن. بەلام، هۆنەر توانیویتی، هەستی خواپەرستیی خۆی، به شێوەیەکی ساکار و ئاسان دەربڕێ. له هۆنراوەی « وەصفی وەهاب »دا، به حەوت دێڕ، باسی پەروەردگاری کردووه و گوتوویەتی:

ئەی خالقی سەماوات، سوڵتانی ڕەبی ئەرباب !
بێ ئیحتیاجی وەصفی، موستەغنی له ئەلقاب
گەر مەیلتبێ، به عاصیی، فیردەوسی پێ ئەبەخشی
یاخو، ئیرادە فەرمووی، دۆزەخ ئەدەی به ئەحباب
بێ قیمەت و بەهایە، ئەلطاف و نیعمەتانت
له قەبضەی دەستی تۆیه، ئەڕواحی جەمعی ئەحزاب
سوڵتانی بەڕ و بەحری، بێ کەشتیی و تەیارە
دێنیتەدەر، له بەردی خاراوە، ئاوی مینزاب
تاقیئەکەیتەوە دڵ، « ئەیوب »ی بەردەبارت
ڕوخسەتئەدەی، که شەیتان، بۆی بچێتە کونجی میحراب
بۆ کیمیایی وەصڵت، له کونجی میحنەت ئاباد
سەد وەک « نەسیر » و « لوقمان، بێ نەشئەبوون له سیماب
« قانع » به زمانی کوردیی، مەدحی خوای ئەنووسێ
تا کەس نەڵێ، به کوردیی نەکراوە، وەصفی وەهاب «38،45»

هەروەها، لە هۆنراوەی « درووددی پەیامبەر »دا، دانی بە تاوان و گوناهەکانی خۆیدا ناوە، پەنای بۆ پەیامبەری خۆشەویست بردووە، تا، لای خوای گەورە، تکای لێبووردنی بۆ بکا و بە هەشت دێڕە هۆنراوە گوتوویەتی:

یا ڕەسووڵەڵڵا ! غەریقی گێژی عصیانم، مەدەد
بۆ فجوور و فیسق، بێ شک، مەعدەن و کانم، مەدەد
بێ بە هانامۆ دەخیلە! ڕۆژەکەی « هەل مین مەزید »
چونکە، سوختی دۆزەخە، سەر تا بە دامانم، مەدەد
چۆن نەگریەم، بۆ خەجاڵەتباریی و شەرمەندەگیم
گوێ لە مشتی، نەفسی شووم و مەکری شەیتانم، مەدەد
گەر شەفاعەت، چاری دەردی من نەکا، مەعلوومە لام
مل بە تەوق و دەستبەستەی، قەهری ڕەحمانم، مەدەد
خۆ خوا فەرموویەتی: « لا تەقنطوا من ڕەحمەتی »
مژدە بۆ ئەهلی شەقایە و من ڕەئیسیانم، مەدەد
ئینتیظاری، هەوری لوطفی ڕەحمەتم، بۆ قەترەیێ
با سگیش بم، موستەحەقی لوقمەیێ نانم، مەدەد
چاوی ئومێدم ببێ، تۆزێ لە بۆ ڕۆژی جەزا
ڕووی هیواکەم وایە، عەبدی شاهی مەردانم، مەدەد
ئاه و ناڵەت بۆ ڕیایە « قانعا »، سوودی نییە
قوڕ بپێوم، هەر لە ئەژنۆم، تا بە سەر شانم، مەدەد «63،45»

هەروەها، لە هۆنراوەی « موناجات »یشدا، بە شێوەیەکی زۆر جوان، ستایشی پەیامبەری کردووە و بە شەش پێنجینە گوتوویەتی:

یا موحەممەد! لێو بە بار و دڵ بە بوریانم مەکە
ئەی ڕەئیسی هەر دوو دنیا! دیدە گریانم مەکە
دەستەئەژنۆ و چاوەڕێگەی، دەستی یارانم مەکە
من کە ئالی تۆم، ذەلیلی باری عصیانم مەکە
غەیری قاپی ڕەئفەتت، بۆ کەس ئەناخوانم مەکە

* * *

ئەی شوعاعی شەمس و کەوکەب ! شوعلەی ئەنواری تۆ
زینەتی « جەنات عەدەن »، شبهەیی ڕوخساری تۆ
ئەی بۆراق و تاج و ڕەفرەف ! خەلعەتی ئەتواری تۆ
ئەی « مەسیحا » ! چاوەڕێگەی نوقطەی گوفتاری تۆ
بەشبڕاو و بێ نصیبی لوطف و ئیحسانم مەکە
* * *
ئەی خولامی بارەگاهت! « قەیسەر » و « دارا » و « جەم »
ئەی لە دیوانی جەزادا! شافیعی جوملەی ئومەم
مەسنەدی ئەو ڕەنگی بەزمت، کەوتە ژوور لەوحولقەلەم
ئینتیظاری فەیضی لوطفی تۆن، هەموو عوورب و عەجەم
غەیری ئالی طاهرینت، دەستەدامانم مەکە
* * *
تۆ، کلیم و تەکیەگاهت، عەرشی ئەعظەم و میثلی طوور
قابقەوسێ لە یەیناما، بە تێکەڵ بە نوور و نوور
باعیثی تەزیینی قەصر و جەننەت و سیمای حوور
ڕۆژی مەحشەر، چۆن بە بارێ نەگبەتۆ بێن بۆ حضوور
سا، لە بەر خاطر « حسێن »ت، دڵ پەرێشانم مەکە
* * *
واسیطەی نوطقی بەعیر و موقتەدای موورسەلین
شاطری مەیدانی فەضلت، سەد وەکوو ڕوح ئەلئەمین
ڕیزە جۆیی خوانی لوطفت، سەد هەزاران عاکفین
یا ڕەسووله ڵلاّ! بە حەقی ئال و بەیتی طاهرین
سەرکز و ئاشفتە حاڵی، دەستی شەیتانم مەکە
* * *
مەخزەنی ئەسراری غەیب و ڕەهبەری ڕێگەی هودا
خاکی ڕێگەت، « کەحەل ما زاغە ئەلبەصەر »، بۆ ئەنبیا
شارقی بورجی نبووەت، شاهبازی کیبریا
ڕەحمی خێرت بێ بە « قانع »، توبیی و ذاتی خوا،
کوا خەڵاتی موستەحەقم؟ ڕوت و عوریانم مەکە «195-194،45»
* * *

# « مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس ـ نامیی »

## « - 1901 »

« مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس »، یەکێ لەو کەڵەنووسەر و پیاوە گەورانەی کوردە، کە هەموو ژیانی خۆی، بۆ ڕازەکردنی ئاین و وێژەی کوردیی تەرخانکردووە. گەلێ بەرهەمی نایابی، هۆنەرە کلاسیکییەکانی کوردی وەک: « مەحویی، نالیی، مەولەویی ... » لێکداوەتەوە، شیکردۆتەوە، چاپ و بڵاویکردۆتەوە. هەروەها، بە دەیان گوتار، نامیلکە و پەرتووکی گرنگی، لە سەر کێشەکانی ئاین و خواپەرستیی نووسیوە. لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا، چەندین هۆنراوەی ئایینی بەرز و جوانی، لە ستاییشی پەروەردگاری مەزندا هۆنیوەتەوە، بە سەر پەیامبەرە نامیلکەیدا هەڵداوە. هەروەها، چەن هۆنراوەیەکی درێژی، بۆ « مەولوودنامە و میعراجنامە »ش داناوە. بە کورتیی: هێندە ڕازەی ئایینی کردووە، تەنانەت، پیاوێکی گەورەی وەک: « شێخ موحەممەد عوسمانی سیراجەددینی نەقشبەندیی »، بە دێڕە هۆنراوەیە، ستاییشیکردووە و گوتوویەتی:

دانامەی زانای، ڕووموززی قورئان
عەللامەی دەهر و نابیغەی زەمان «22،13»

« نامـيى »، پەرتووكـێكى « 216 » لاپەڕەيى نووسـيـوە و بە سـەر سێ بەشدا دابەشيكردووە. لە بەشى يەكەم و دووەمدا، ستايشێكى گەلێ بەرز و جوانى، پەيامبەر و يارانى كردووە. لە بەشى سێيەميشدا، سكاڵاى دڵى خـۆى كـردووە. هـەر بەشـێكيـشى، چەندين بابەتى جـيـاوازى، لە خـۆى گـرتووە. بۆ نموونە: بەشى يەكـەمى، بۆ ژيانى پەيامبەر تەرخانكردووە و لەم باسانە: « مـوژدەى پێغەمبەران بە تۆ، ناودانان و پەروەردەى منالّيى، سەرەتاى پێغەمبەريى، دامەزراندنى لە مـەدينەى مـونەووەرەدا، باسـى قـورئانـى پيـرۆز، بەيانى مـەناقـيب و نوعـووتى، جـا داواى تكايە » پێكهـاتووە. لە سـەرەتاى بەشى يەكەميشدا، ئامانجى سەرەكيى، نووسينەكەى خۆى دەربڕيوە و بە بيستويەك دێڕە هۆنراوە گوتوويەتى:

بە « بيسميللاهى ئەلرەحمان ئەلرەحيم »
بە حەمد و ثەناى پڕ صيدق و تەسليم
ستايشنەكەم، بۆ خوداى عەليم
ئەپاڕێمەوە، لە خوداى كەريم
جا، درودێكى سەييدى سەرومر
كە « موحەممەد »ە و « ئەحمەد »ە و ئەنوەر
بە سروودى خۆش، بە ياساى ئيسلام
پێشكەشينەكەم، صەلات و سەلام
بۆ خۆ، بۆ براى زوومرەى ڕەهبەران
بۆ ئەهلى بەيت و بۆ ئال و ياران
بۆ پەيڕەوانى، لە ڕۆزگاران
تا، ئەڕژێتە خوار، دوڕ دانەى باران
ئەم جار براكان! نووری چاوانم
قووەتى ڕۆح و قووتى ژيانم
بۆم هۆنينەوە، بە عەونى خودا
بە دەستى ئيخلاص، بە ذەوق و سەودا
ئەوصافى ڕەهبەر، سەييدى عالەم
لە سەر بانى دڵ، بيكەن بە عەلەم

بیکەنە بەرتان، « خەیر و ئەلکەلام »ە
بیکەنە سەرتان، تاجی ئیسلامە
« ثەنای ڕەهبەر »ە، ئەخوێنرێتەوە
دوڕ و گەوهەرە، ئەهۆنرێتەوە
ڕشتەی زمڕووتە، بیکەنە گەردن
بە وێنەی قووتە، بۆ کاتی مردن
لە بۆ کوڕ شیرە، بۆ کچ قەلادە
هەر کەسێ پێی بێ، لە شەڕ ئازادە
بە جەماوەریی، بۆ موناسەبات
بیخوێننەوە، وێنەی صەلاوات
بیسێننەوە، بە دەنگێکی خۆش
تا، بە تاوی نوور، دڵتان بێتە جۆش
جا، دوعایەکیش بکەن، بۆ « نامیی »
تا بمرێ، لەسەر ڕێگەی ئیسلامیی
یادگارێکە، بمێنێ لاتان
بۆ یادی برای، نیوە مەلاتان
نوورت کەوتە سەر، سەراسەر ئافاق
تەواوبوو، دەورەی دائیرەی ئەخلاق
بووی بە هۆی تەوحید، بۆ خودای مەعبوود
تەوحیدی غایە و تەوحیدی مەقصوود
دەی، بۆ خاتری، صەفای ڕوخسارت
لە بەر وافیری، فەیضی ئەنوارت
بە دڵ بڕوانە، بۆ دڵی « نامیی »
موونەووەرببێ، بە نووری سامیی «7-5،59»

هۆنەر، گەلێ هۆنراوەی جوان و ناسکی دیکەی، بۆ پەیامبەری ئیسلام گوتووە. بەڵام، ئەز لێرەدا، تەنیا هەر، دووانیان لێ گوڵبژێردەکەم. لە هۆنراوەیەکدا، زۆر بە شێوەیەکی جوان، ستاییشی پەیامبەری کردووە و بە حەڤدە دێڕە هۆنراوە گوتوویەتی:

وه صەلەڵڵاهو عەلا نوور، بە دینی و ئیمانی
بە خەیری و ئیحسانی، بە عیلمی و عیرفانی
بباریّنە خوا! ڕەحمەت، لە هەوری فەیظی ڕەبانی
لە سەر ڕۆحی ڕەسووڵەڵڵا و جەمیعی ئال و یارانی
چە ئەصحابیّ! ئەوانەی هەوری بارانی کەرامەت بوون
چە ئالیّ! ئالی شاهی وا، کە عەزرەت بوو بە ئەرکانی
هەمو نەفسی موقەدەس، مەظهەری نووری خوای ئەقدەس
خەڵاتی خوا ئەهات بۆیان، بە ئیحسان و بە ڕضوانی
بنازم، بەو صەفا خوا دای، بە قەلبی ئال و یارانی
کە عینەن، بوون بە میصباحی تەجەلای طووری ئیحسانی
وەرە، بڕوانە، « کونتم خەیرو ئومە وە نووری سیماهم »
ئەبینی، چۆن هەزار ئەسراری نوور و فەیضی ڕەحمانی
تەوەکلیان و ئیمان و سەر و ڕوو عاجزی دڵیان
« عەلا ڵڵا و بیللا و لیللا » بوو عینوانی
هەموو یەک قەلب و یەک قالب، لە بۆ ڕظوانی حەق طالب
بە داییم ڕاغب و ڕاهب، لە جیلوەی قەهری سوبحانی
بە دین و دینی ڕوخساری، لەباری نوور، لەوان باری
چە بەحرانیی، چ بەڕانیی، چە « عەدنانیی »، چە « عیبرانیی »

* * *

بەڵێ، بارانی بارانە، بە داییم، قەطرە بارانە
نە وەک تاوی بەهارانە، دەمیّ بیّت و دەمیّ فانی
هەموو، مەستی دوو چاوی، نێرگسی شەهلای « موحەممەد » بوون
دەبا، ئینشابکا « حەسان » لە ذەوقا، شیعری سەحبانی
هەموو، جیلوە ئەدا جەوهەر، ئەگەر باطن، ئەگەر ظاهیر
ئەگەر « سەلمان منی »، ڕەونەقە بۆ قەلبی « سەلمانیی »
ئەگەر، دونیا بلوورین بیّ، بە مانگ و ڕۆژ نوورین بێ
بە ڕۆژا، عەینی وەک ڕۆژە، بە شەودا، مانگی نوورانی
صەفای سیمای ئەوان و نووری صافی « سەید ئەلکەونەین »
بە ئەصلۆ، عەکسی وابوو، بوون بە نووری صافی ڕۆحانی

لە ڕووی حەضرەت، بە نیسبەت، بۆ شوعاعی نووری سیمایان
نجومن، صاحیبی نوورن، لە بۆ دەیجووری نەفسانی
کەسێ، خاکی دەری ئەکسیری ئەعظەم بێ، لە تەئثیرا
عەجەب ناکەم، بە ضەربی، گەر نەعالی کەوشی دەربانی
لە پاش نەعت و ڕەزایێ، غەففار لە ئەهلی هجرەت و ئەنصار
چییە، قیمەت لە بۆ گفتار؟ لە کوێیە قەدر و میزانی؟ «37-35،50»

هەروەها، لە هۆنراوەی « یا رەسـوولەڵڵا »شـدا، بە شـێـوەیەکی زۆر جوان، ستاییشی پەیامبەری کردووە، لەگەڵ ناوی چەن گوڵێکی جوان و بۆنخۆشدا، تێکەڵاویکردووە و بە نۆزدە دێڕ هۆنراوە گوتوویەتی:

یا رەسووڵەڵڵا! ناوت چەن خۆشە
ئارەقت گوڵا و بۆنت وەنەوشە
نێرگز ئارەقی، ئەندامی تۆیە
بۆیە پەسەندە، ئەو ڕەنگ و بۆیە
ناوت بووەتە، بەستەی فریشتە
کلیلی دەرگای، باغی بەهەشتە
لە ژێر بارەگای، خوا نووسراوە
فوروستادەییت،پێ سپێرراوە
بە ناوی تۆوە، چرا هەڵکرا
لە دوور، لە نزیک، ڕێی پێ دەرکرا
خوا، ناوی کردووی، بە هاوناوی خۆی
مایەی بڵندیی، ناوی خوا تۆی
ئەی پێغەمبەر « ص » ! شیرین کردەوە
« کەعبە »ت، لە ژەنگی بت پاککردەوە
بە بۆنەی تۆوە، چرا هەڵکرا
مایەی ژیانە، بۆ هەر دوو دونیا
خوا فەرموویە، قورئانی قەدیم
« ئینەکە لە عەلا خولقین عەظیم »
کە لەدایکبوو، پێغەمبەری خوا
هەر بە بۆنەکەی، ڕووناک بوو دونیا

« ئینا فەتەحنا »، کە سوورەی « فەتحە »
سەر، تا پا بۆ تۆ، سەربەرزیی و مەدحە
لە « مەککە »دا بوو، بێ باوک و بێ کەس
بۆ « مەککە » و « کەعبە »، بوو بە فریاڕەس
لە « مەککە »دا بوو، بێ باوک و برا
بۆ « مەککە » و « کەعبە »، بوو بە کارەبا
« مەککە »ت لە دەستی، بەدکار سەندەوە
بەوە، ئایینی خۆت، هەڵساندەوە
هەر خۆم بە قوربان، شاهی « مەدینە »
سەرتاپا باڵای، شوعلەی نوورینە
هەر خۆم بە قوربان، خاوێنی هەستی
مانگی دوو لەتکرد، بە پەنجەی دەستی
ڕێنموونیکەر، کە هاتە دونیا
دونیا ڕووناکبوو، وێنەی کارەبا
مەئیوسمان نەکەی، تۆ لە قیامەت
سەر بەرزیت، بۆمان بکەی شەفاعەت
هەزاران دروود، هەزاران سەلام
لە سەر « موحەممەد »، « عەلەیهی ئەلسەلام » «40-38،50»

* * *

# « حـــــــــــەقیقیی »

# « 1997 - 1902 »

هۆنەر، بە زمانێکی ڕەوان و بێ گرێوگۆڵ، بە کوردییەکی پەتیی و خاوێن، بە شێوەیەکی تەڕ و پاراو، بە شێوازێکی جوان و نایاب، هێندێ هۆنراوەی ئایینیی، بەرز و ناسکی وەک: « موناجات، شای ئەنبیا، مەولوودنامە، جێژنی میعراج، شنەی ڕەحمەت، شوکرانە »، هەروەها، چەن پێنجینە و پێنجخشتەکییەکی دیکەشی، لە سەر هۆنراوەکانی « حاجی قادری کۆیی، بێخود ... » هۆنیوەتەوە.

لە هۆنراوەی « موناجات »دا، بە حەفتا دێڕ هۆنراوە، باسێکی جوانی گەورەیی و میهرەبانیی یەزدانی مەزنی کردووە، لێی پاڕاوەتەوە و لە سەرەتادا گوتوویەتی:

بە ناوی خوای مەزن، ئەو پادشایە
کە تەنیایە و شیای حەمد و ثەنایە
سپاسی، ئەو پەڕی شایانی بەرزی
پەڕی مێشوولەیە، بۆ شانی بەرزی
ئەوە، پەروەردگاری عالەمینێ
هەیە و هەبووە و دەبێ و دەبیە و دەبینێ
بە ڕوحم و میهرەبان و موستەعانە
تەجەللای نووری، عەرز و عاسمانە
خەدیو و خاوەنی، ڕۆژی جەزایە
نەزا و خێوی بەزەیی، ئەهلی نەزایە
ئیلاهی چاک و پاک و چەوت و بێخود
هەموو هەر عەبدی تۆین، « ئیاکە نەعبوود »

به یاری و ڕێنوێنی تۆ نیازین
به ڕهحمان و ڕهحیمی تۆ دهنازین
کهرهمکهی، شارهزاییمان له ڕێی ڕاست
به ڕێی « ئهنعهمهته »دا، بۆ چوونی جێ ڕاست
ببووری، وا نهکهی، مهغزووبی تۆ بین
له ڕێ لامان نهدهی، یا ڕهببی! ئامین «23،40»
دوای ئهوهی، باسێکی گهلێ جوانی، گهورهیی و دهسهڵاتی، یهزدانی کردووه، دیسانهوه، لێی پاڕاوهتهوه و گوتوویهتی:
خودایا! من به تۆ ئومێدهوارم
به ڕهحمان و ڕهحیمی تۆیه، کارم
ئهتۆ زانای، ههموو ڕازی نیهانی
گوناهی من، له من چاتر دهزانی
گوناهم زۆره، هاتووم سهر به شۆڕیی
له ڕێگا ڕاستهکهت، ڕێم لێ نهگۆڕی
خهتابارم خودایا! لێم ببووره
له دیوانی خودایی، کینه دووره
ئهمن عاصیی و نهزانم، تۆ غهفووری
گهلێ دووره، له عیصیانم نهبووری
به قهولی داوته پێم، دڵ خۆشه « بیللاه »
وتت: « لا تهقنیطوا مین ڕهحمهتوڵڵا »
به هیوام، ئهو دهمهی گیانم دهسێنی
نهجاتمدهی، به ئهلطافی نهێنیی
خوداوهندا! به حهققی بێ نهظیریت
به حهققی پادشایی و بێ وهزیریت
به ذاتی پاکی، بێ وێنه و میثالت
به عیلم و قودرهت و جاه و جهلالت
ئهتۆ کردت به گوڵزار، ئاووری کڵ
له بۆ ئاوور، به نێو ئاوا دهبهی گڵ
له « ئیبراهیم »ی تۆ، ئاوور بووه عهون
به عهونی تۆ، لهلهی « موسا »یه « فیرعهون »

به هۆی « ئیقرەئـ »، دەزانێنی بە موخبیر
بە « مودەثر » دەفەرمووی: « قوم فەئەنذر »
لە خەو هەستە، بلّێ، هەر چی مەبەستە
بناسێنە، بترسێنە، مەوەستە «25،40»

پاشـان، هۆنەر، بە « ئایەتەکـانی قورئانی پیـرۆز، پەیامـبـەر، کەعـبـە، بەیت ئـەلمەقـدس، هەمـوو پەیامـبـەران، جـوبریل، چوار جـێنشـینەکـە، یارانی پەیامبەر، حـەسەن و حوسێن، بە هەموو پیـاوچاکان، نوێژکاران و زمان بەرۆژوان »، خـوای گەورەی سوێنداوە و بە تکاکـار ناویبردووە، لە خوا پـاڕاوەتەوە، تا لە گونـاهەکانی خـۆشـبێ! دواییش، کـۆتایی بە هۆنراوەکەی هێناوە و گوتوویەتی:

لە چاکەی چەککراوم، ڕێ بە ترسە
لە تاوانم ببورە و لێم مەپرسە
دلۆپێکە، هەزاران بەحری بێ بن
لە دەریای ڕەحمەتت، چوون و چرا چن؟
پەڵەی هەوری کەرەم، چی لێ دەبێ کەم
پەڵەی ڕەحمت بدا، سەرجەم لە عالەم
لە کن تیشک و تروسکەی خۆر و نووری
چ فەرقێکی هەیە، نێزیک و دووریی
عیبادی تۆ، ئەوەی بوون و هەن و دێن
بە مەیلی خۆ نەبوون و نین و ناهێن
لە خانی بێ درێغت، جیرەخۆرن
لە بۆ عەفووت کەمن، هەر چەندی زۆرن
بەشی چاوڕێخشانی تۆبەیێکە
بە کوردیی، سەد گوناه و تۆبەیێکە
لە قاپی ڕەحمەتی تۆ، شا، گەدایە
گەدای « ئەلفوقر و فەخری » پادشایە
کەرامەت بۆ کەریمان، شوێن و ڕەسمە
« فەلا تەنهەر »، کەلامی تۆیە، بەسمە
زەوی و زاری عیبادەت، ویشکەدێرە
پەڵێکی هەوری ڕەحمەت، بۆ بنێرە

به خوڕەم، ڕێژنەیەکی لێ بباریێ
تەم و ژەنگی گوناهی، لێ بتاریێ
سەراسەر، کردەوەی ژینم پەرۆشە
چ خۆشە، عەفووی تۆ، بۆم بێ بە تۆشە
لە هەر کەس تۆ بپرسی، کاری نەخشین
چییە؟ فەوریی دەڵێ: جێی تۆڵەبەخشین
دروستی دەستی تۆم و تۆ دەناسم
بە دەس تۆیە، سبەینێ، باس و خواسم
بە « ئینا » و بە « لیلاە »مانە ئیمان
« ئیلەیهی راجیعون »ە ئاخریمان
« حەقیقیی » ! ئەو سەری عصیانە باری
وە لێکن، بێ سەرە، ئیحسانی باری «28-23،40»

لە هۆنراوەی « شای ئەنبیا »دا، بە بیستویەک دێڕە هۆنراوە، باسێکی نایابی، پەیامبەری هێژای کردووە، گەلێکی پێداهەڵداوە، لێی پاڕاوەتەوە و گوتوویەتی:
شای ئەنبیا، « موحەممەد »ی موختار و سەروەرە
سەر حەڵقەی نبووەت و مەحبووبی داوەرە
لەوح و قەڵەم، لە عەقڵ و کەماڵی، ئەنادەکەن
عەرشی بەرین، لە نووری جەماڵی، مونەوەرە
سوڵتانی ئەنبیایە، لە « ئادەم » هەتا « مەسیح »
فەرمانڕەوا و خاتەم و سەردار و سەروەرە
ئەو مەحرەمەی، لە بەیتی حەرەم، فەخری عالەمە
بۆ ئەنبیا، لە « مەسجیدی ئەقصا »یە، ڕەهبەرە
بەدری دوجایە، بۆ شەوەزەنگی زەلال و کوفر
شەمسی ضوحا و مەزهەری میحراب و منبەرە
نوورێکە، سێبەری نەبووە، فەخری کاینات
ئەمما، لە ڕۆژی حەشر، پەنا و پشت و سێبەرە
بێ وێنە، وێنەیێکە لە ئاوێنەی کەماڵ
نووری جەماڵی، صانیعی تێدا موصەوەرە

گەر مانگی ئاسمان هەیە، نووری لە ڕۆژەوە
مانگی زەوی، لە نووری تەجەللا، مونەوەرە
خالق، ئەگەر بە خاتری خەیرولبەشەر نەبا
کاری چ بوو، بە خیلفەتی ئەم حەوت پەیکەرە

ئیدی، هەر بەو شێوەیە، لە سەر باسکردن و پێداهەڵدانی خۆی بەردەوامبووە، تا، لە کۆتاییشدا، داوای میهرەبانیی لێ کردووە و گوتوویەتی:

ئاوور، بە ئاوری لە گوناهی مە، لادەدا
ئاوڕدەوە، کە ئاوڕی تۆ بۆ مە، لەمپەرە
فیدیێکی عەیبدارە « حەقیقیی » ! قەبووڵیکە
فەرموو، گوناهبار و پەشیمانەکەم وەرە «30-29،40»

لە هۆنراوەی « شنەی ڕەحمەت »یشدا، بە شەست دێڕە هۆنراوە، باسێکی گەلێ جوانی، هەموو « زیندەوەر، پەلەوەڕ، دار، درەخت، مەل، ئاژەڵ، کەژەکانی ساڵ، گوڵ، ئاو، بەفر، با، جوانیی سروشت و نهێنییەکانی ژیان »ی کردووە، هەموو ئەو شتانەشی، بە هێز و دەس و پەنجەی ڕەنگینی پەروەردگارەوە گرێداوە، ستاییشێکی گەلێ جوانی یەزدانی مەزنی کردووە و لە سەرەتدا گوتوویەتی:

خودایا! خەلق و ئەمری تۆ، هەوا نین
لە خەلقی کایناتتدا، خەتا نین
قەدیم و باقییە، ذات و صیفاتت
هەیی و بووی و دەبی، بۆ تۆ فەنا نین
زەمین و ئاسمان و مانگ و ڕۆژت
ڕیاز و ڕاز و ڕەمزی بێ بەها نین

پاشان، لە خۆشەویستیی یەزدانی مەزندا تواوەتەوە و جارێکی دیکەش، دانی بە بوون و تاکوتەنیایی خۆدادا ناوەتەوە و گوتوویەتی:

شەریکت نین و پێویستی کەڵەک نی
لە بۆ مڵکت، سنوور و ئینتیها نین
دەڵێن: حوسنی تەبیعەت، سەربەخۆیە
بە ماهییەت، ئەوانەی شارەزا نین

کەمێ دواتر، لە چەن دێرە هۆنراوەیەکی دیکەدا، باری گوناهباریی و لەشبەباریی خۆی پیشانداوە و گوتوویەتی:

لە بەر دەردی گوناهان، دڵ نەخۆشە
حەکیم! ئامان، چ دەردان، بێ دەوا نین
گەدایێکم، لە بەر دەرکی خودایەک
" فەلا تەنهەر " کە، غەیری تۆ، خودا نین
بە هۆی " لا تەقنطوا مین رەحمەتوڵلا "
دڵم خۆشە، کە وەعدەت بێ وەفا نین

لە کۆتاییشدا، بە کۆمەڵێ ئایەت و سوورەتی قورئانی پیرۆز، بە ناوی پەیامبەری ئیسلام، پەیامبەرانی دیکە، خواناسان و پیاوچاکان سوێندیداوە، پەشیمانیی خۆی دەربڕیوە، داوای لێبووردنی لێ کردووە و گوتوویەتی:

پەشیمانم، لە تاوانم ببوورە
پەنامهێناوە، غەیری تۆ، پەنا نین
لەگەڵ بەحری کەرەم، ناجۆرە نارت
بە کوردیی، ئاو و ئاوور، ئاشنا نین
بنێرە و بیکە دەرمانی " حەقیقیی "
شنەی رەحمەت، کە لەو چاتر، شفا نین
صیراتی موستەقیمم، پێ کەرەمکەی
نەسیبمکەی، صەفی ئەنعەمتە ئامین «42-38،40»

* * *

# « ئـــــــــــــاوات »

## « 1903 - »

هۆنـەر، گـەلێ هۆنراوەی « نـاسک، نـایـاب، تەڕ، پاراو، ڕوون، گـەش و جوان »ی هەیە. بە کوردییـەکی خۆش و بێ گـرێوگۆڵ، بە زمـانێکی سـاکـار و ئاسـان دواوە. تەنانەت، هۆنەرێکی ناوداری وەک: « هەژاری مـوکـریانیی »، دانـی بە توانا و لێـهـاتوویی هۆنەریی و هونـەرمـەندیی هۆنەردا ناوە و گوتویەتی: (شیعر و هەڵبەستی " کامیل شا " نیازیان بەوە نییـە، من و سـەد منـی و نیو منـی وەک من بڵێن: باشـە. نەخێر، عـەتر خـۆی دەردەخـا و پێی ناوێ، عـەتار بە تـەلاق و سـوێندانەوە، ڕەشبێتەوە، کە عەتری چاکە.)«11،1»

هۆنـەر، گـەلێ هۆنراوە و چامـەی « ئـایینـیی، نیـشـتـمـانپـەروەریی، ڕۆمـانسـیی، باسکردنی سـروشت و جـوانیی، شین و لاواندنەوە »ی داناوە.

« ئاوات »ی هـەست نـاسک، وەک کـوردێ، لـە دامـێنی بنـەمـاڵەیـەکی خـواناس و مـوسـوڵمـان کـەوتۆتەوە. لە کەشـێکی ئایینییـدا، چاوی بە ژیان هەڵهێناوە. لە نێو کۆڕی دەروێشـاندا، پێی گـرتووە و لە دارەدارە کەوتووە. لە تـەکـیـە و خـانەقـاکـاندا گـەورەبووە و پەروەردەکـراوە. لـەبەرئـەوە، ئـایین کــارێکی زۆری، لە هـەست و هۆشـی کــردووە. بە شـێـوەیـە، منیش دەتوانم، لەگـەڵ « هـەژاری مـوکـریـانیی »دا بڵـێم: (سـەرچاوەی ئیلهامی هۆنراوەی مامۆستا " ئاوات " ڕێی ئیسـلامەتیی و ئایین و شـەریعـەت و تەریقـەتە و دیوانی هۆنراوەکانی زۆرتری باسـی ئاینیی و لە ڕێگەی ئایینەوە خۆی خـسـتـۆتە نێو زەریـای عـیـرفـان و خـواناسـییـەوە، وە هـەر ئەو خـواناسـیی و پاکیی دڵ و دەروونە، بۆتە هۆی ئیلـهـامی هەسـتـی خـرۆشـاویی و جـوانتـرین هۆنراوەی لە سـەرچاوەی تەبعی زوڵاڵی هەڵقوڵیوە و هاتۆتە دەرەوە.)«17،1»

بۆیە، وەک هەموو هۆنەرەکانی دیکەی کورد، کە باوەڕیان بە ئایین هەبووە، « ئاوات »ی هۆنەریش، لە « ستایشی یەزدانی مەزن، پەیامبەری ئازیز و بۆنە ئایینیی »یەکان، دریغی نەکردووە، چەندین هۆنراوەی کورت و درێژی، لە دانەی مرواریی ووشە هۆنیوەتەوە، لە چوارچێوەی زیوینی دڵ و دەروونی خوێنەردا، جێی خۆیان کردۆتەوە. وەک: « ستاییشی خودا، خواناسیی، چاکە و خراپە، شوکری نیعمەت، نزام بۆ تۆبە، ستاییشی پێغەمبەر، بۆ پێغەمبەری خۆشەویست، شەوی میعراج، ئیعجاز، ڕووڕەش و ریشی سپی، تۆبەبێ، ئارەقڕشتن ... »

بۆ نموونە: لە هۆنراوەی « ڕووی ڕەش، ریشی سپی »دا، بە حەوت دێڕە هۆنراوە، بە شێوەیەکی زۆر جوان، باسی گوناهەکانی خۆی کردووە، هەستی خۆی دەربڕیوە، کە چۆن، شەو تا بەیانیی، خەو لە چاوی ناکەوێ، وەک ماری بریندار، جێ بە خۆی ناگرێ. جگە لە قاپیی پڕ بە سۆز و میهرەبانی پەروەردگاریش نەبێ، هیچ کەس و لایە شک نابا! بۆیە، ڕووی لێ ناوە و داوای چارەسەری لێ کردووە، تا، یارمەتییبدا، لێی خۆشبێ و ئارامێ بە گیانی شەکەتی بدا. هەر چەندە، پیربووە و کوێستانەکانی سەر و ریشی، بەفری لێ ناچنەوە، بەڵام، ڕووی وەک بنی مەنجەڵ ڕەش هەڵگەڕاوە. بۆ؟ چونکە، لە ئاستی خوادا، خۆی بە گوناهبار و تاوانبار زانیوە. لەگەڵ ئەوەشدا، کە ناوی « کامیل »ە و بە ناو تەواوە، هیچ کەموکوڕییەکی نەبووە! بەڵام، هێندەی خراپە کردووە، خۆی بە ناتەواو داناوە! بۆیە گوتوویەتی:

ڕووڕەشی دەرگای خودام و سەرفکەندەی « موصطەفا »
شەرمەساری ڕۆژی حەشر و ملکەچی ئالی عەبا
چارەڕەش، شەو تا بەیانیی، هەر ئەم و ئەو لا دەکەم
هەر وەکوو ماری بریندار، هەڵدەسوڕێم بێ صەدا
ڕوو لە کوێ کەم یا ڕەبی؟ چ بکەم، لە دەس عیصیانی زۆر؟
غەیری دەرگای تۆ نییە، دەرکێ، کە ڕەحمم پێ بکا
دێمە دەرگاکەت، کە بۆ چاک و خراپ ئاواڵەیە
کەوڵ و پۆستم ڕادەخەم، تا، هەم لە دنیای بێ وەفا
هەر ئەوەندەم بەس، کە تۆم ناسی و لە تۆ داوادەکەم

لێم ببوری و خۆش ببی لێم و نەسێنی لێم جەزا
ڕووم ڕەشە، ئەمما سەر و ڕیشم، وەکوو بەفری سپی
بەو سەر و ڕیشەم ببەخشە، نەک بە ڕووی هێندە سیا
« کامیل »ە نێوم، بەڵام، ناقیص لە دونیا مامەوە
چونکە، بێ مەیلی ئەتۆم زۆر کرد، هەتا توانیم خودا «10-9،1»

تەنانەت، بێ ئەوەی، لەو گەشتە هونەریی و وێژەییەی ژیانیدا، پشوویەکی دابێ، بێ وچان، ئەو ڕێبازەی گرتوویەتی، درێژەی پێ داوە. هەر لە سەر ئەو بەخۆداهاتن، ڕەخنەلەخۆگرتن و داواکارییەی خۆی بەردەامبووە. هەشت ساڵی ڕەبەق، بە سەر هۆنراوەی « ڕووی ڕەش، ڕیشی سپی »دا تێپەڕبووە، کەچیی، ئینجا، جارێکی دیکەش، لە دەروازە گەورە، پڕ بە لە میهرەبانەکەی یەزدانی مەزنی داتەوە و بە هۆنراوەیەکی حەوت دێڕیی، ناوی « تۆبەبێ »ی لێ ناوە، تا توانیوێتی، پاڕاوەتەوە، داوای لێبووردنی، لە پەروەردگاری جیهان کردووە و بە چاولێکەریی، لە « قانع » گوتوویەتی:

من سەگێکی ڕووتوقووتی ڕانەکەی تۆم، تۆبەبێ
پەت لە مل، ئامادەباشیی شوانەکەی تۆم، تۆبەبێ
تۆ طەبیبی حاذیقی دەرد و بەڵای، من دەردەدار
دڵ نەخۆش و چاوەڕێی، دەرمانەکەی تۆم، تۆبەبێ
برسیی و بێ واز و بێ هێزم، لە دەرکت کەوتووم
چاوەڕێی لوقمێکی چەور و نانەکەی تۆم، تۆبەبێ
گەر بڵێم: لەو نەسلە پاکەم، خۆ درۆ ناکەم، بەڵام
ڕووی دەوێ، لەو نەسلە بم، گاوانەکەی تۆم، تۆبەبێ
نیسبەتی خاشاک، لەگەڵ گوڵزاری باغی جەننەتێ
چۆن بکەم من؟ خاکی دەرک و بانەکەی تۆم، تۆبەبێ
تۆ شەهەنشاهی جیهانی و ئەمیری ئینس و جان
من فەقیرم، خۆ گەدای دەربانەکەی تۆم، تۆبەبێ
هەستە « کامیل »، ڕوو لە دەرکی سەییدی سەروەر بکە
هەر بڵێ: قوربان ! سەگی ئاسانەکەی تۆم، تۆبەبێ «11-10،1»

لە هۆنراوەی « ئارەقڕشتن »دا، بە هەشت دێڕە هۆنراوە گوتوویەتی:
خاڵی نوستوو! هەستە، بەستە، ئێستە، ڕۆژی مردنە
کاتی لێک جیاکردنەوەی، چاکە و خراپەکردنە
گوێت لە دەنگی « نەفخی صوور »ە لێدەدا، ئاگات دەکا
پێت دەڵێ: حەشرە، لە ترسان، شێری نەڕ، هەر وەک ژنە
چاوەڕێبن، وا تەرازووی خێر و شەڕ، هاتۆتە گۆڕ
سەگ، بە حاڵی ئەو کەسەی، خێری بە قەت خێری منە
باڵی ئاڵای کێیە؟ ئەو دەم، سەد هەزار چاک و خراپ
دەچێتە ژێر سایەی، لەوێدا، چاوڕێی لێبووردنە
« ئەحمەدی موختار »ە، شیرین سوارە، ئەو سەردارەیە
ڕووی لە هەر کەس بوو، لەوێدا، کاروباری ڕۆشنە
ئەی « شەفیعولموذنبین » ! دەستی من و داوێنی تۆ
دێمە ژێر ئاڵات و ڕێمکە، گەر چی، ئیحسانم ونە
وەک دەڵێن: ئەمنیش، لە نەسلی پاکی تۆم، ئەمما، ئەمن
ڕووڕەش و خاوەن گوناهم، کارم ئارەقڕشتنە
ئاگری دۆزەخ نەبێ، ناتوێتەوە، ئەو مارزە
لێی گەڕێ، بتوێتەوە، با، سافبێ، هەر وەک ئایینە «12-11،1»

لە هۆنراوەی « شایی و شین »یشدا، هۆنەر، دەسڕەنگینییەکی، گەلێ جوانی نواندووە، کاتێ، چاوی لە « حاجی قادری کۆیی » کردووە و بە نۆ دێڕە هۆنراوە گوتوویەتی:
لایەک شاییە، لە لایەک شینە
لایەک هەڵپەڕکێ، لایەک گرینە
لایەک، جل دەبەن بۆ بوکی ساوا
لە لایەک، کفن دەبڕن بۆ زاوا
تەماشای دونیا و وەفای ئەو
بە یەک چەسپان و لێک جیایی ئەو
با، بەس من و تۆ، بە تەمای ئەو بین
با، بەس بێ خەبەر، ئاوبردەی خەو بین
با، وەخەبەر بێین، فکری کارێ کەین

بیر و باوەڕمان، بۆ لای یاریێ کەین
ئەو یارەش دیارە، تاق و تەنیایە
بە وەفا و کەرەم، ذاتی خودایە
هەر خزمەت بەوە، پاداشی زۆرە
بە وتەی من کە، دڵت مەگۆڕە
هەر ئەو دەژێنێ، هەر ئەو دەمرێنێ
ئاخری بۆ خۆی، تەنیا دەمێنێ
« ئیمامیی »، ئەوا ڕوویکردۆتە تۆ
پێنج فەرضە، سوجدەی، هەر بردۆتە تۆ «202،1»

* * *

# « حیلمـــــــــــــــیی »

« 1985 - 1909 »

هێندێ هـۆنراوەی « نیشـتـمـانیی، ئـایینیی، کـۆمـەڵایەتـیی، دڵداریی و پلارهـاویشـتن »ی هەیە. پلارهـاویشتن و داشـــۆرین، بـەشـێکی زۆری هۆنراوەکـانی پێکدێنن. زۆربـەی هـەرە زۆری هۆنراوەکـانی، بـە ووشـەی سـاکـار و کـوردییـەکی پەتیی دارشـتـووە. بەڵام، لـە هێندێ هـۆنراوەدا، بەو لقـەدیـالێکتـە دواوە، کـە قـسـەی پـێ کـردووە. دیمـەن و جـوانیی نیشتمانەکەی، کارێکی زۆری تێکردووە و سەرنجی ڕاکێشاوە.

لە هۆنـراوەی « یـارەب ! »دا، لـە یەزدان پـاڕاوەتـەوە و بـە شـــــەش دێرە هۆنراوە گوتوویەتی:

یا رەب ! ڕووڕەشم من، گوناباریم
لە حضووری تۆ، زۆر شەرمەزارم
ذاتی پێغەمبەر، ئەگاتە فریام
چونکە، عەبدی تۆم، ئومێدەوارم
کەرەمت زۆرە، بۆ ئۆمەتی خۆت
گەورە، فەریادرەس، بگە هاوارم
هەر تۆ شافیعی، لە ڕۆژی مەحشەر
لە ڕەحمەتی تۆ، منیش بەشدارم
نائومێد نابم، ئافریدەی تۆم
هەر ذاتی حەقە، ویردی سەر زارم
« حیلمیی » لە ماڵۆ، کز و هەژارم «20،22»

* * *

# « مینە جـــــــــــــاف »

## « 1965 - 1911 »

بە یەکێ لە هۆنەرە میللییەکانی ناوچەی « گەرمیان »ی « باشووری کـــوردســـتـــان » دادەنرێ. گـــەلێ هۆنراوەی « ئایینیی، دڵداریی، کـۆمـەڵایەتیی و نیـشـتـمـانیی » داناوە. زۆربەی هۆنراوەکـانـی، بە شێوازێکی ساکار و هێندێکیشیانی، هـەر بەو زمانە هۆنیوەتەوە، کە پێی دواوە! لە هۆنراوەی « ئەی خوا »دا، بە پێنج دێڕ گوتوویەتی:

ئەی خوا! یاخیی و خەجاڵەتبارم
ڕووسیای، قاپیی پەروەردگارم
موطیعی، ئەمری نەفس و شەیطانم
پشت خەمیدەی، ژێر باری عیصیانم
طاعەت گومکردوو، بێ بیضاعەتم
مەعصیەتبار و هەم خەجاڵەتم
مەحجووبی، زومرەی گوناهبارانم
سەر حەلقەی، مەجلیس شەرمەسارانم
لە بەدکرداریی، نەم کردووە تەقصیر
بەدئەتواری خۆم، ڕووی کردوومە قیر «24،60»

لە هـۆنراوەی « ئـەی دەلیلی بـێ دەلیل »دا، بە یـازدە دێڕە هـۆنراوە، لـە یەزدانی پاک پاڕاوەتەوە و لە سەرەتادا گوتوویەتی:

ئەی دەلیلی بێ دەلیل و ئەی نەوای بێ نەوا!
ئەی ئەمیری بێ ئەمیر و ئەی خودای بێ خوا!
ئەی شەهەنشاهی سەری دین، هیمی موڵکی لا مەکان!
حامیی بێ مەرجەع و ئەی مەرجەعی گشت ئیلتیجا!
دەستگیری زومرەی داماو و مەحزوون و ذەلیل
هادیی بێ چارەیی، ئەوگاری بێ پشت و پەنا
مەڵهەمی زام و برینی، کاففەیی خوێنی دڵان
شەربەتی تەسکینی ئاری، جەرگی پڕ سۆز و سزا
ئەی کلیلی پێوەنی، پێوەنکراوی ئێش و خەم
شافیی بیماری مەعلوول و دەوای بێ دەوا
ڕابەری ئاوارەیی سارای، پایانی دەرد و ئیلتیجا
لۆکسی ڕێگەی وێڵی، هەردەی ظوڵمەت و کەرب و بەڵا
بۆ ڕجا، دێنمە تکا، تا، بۆم تکاکار بێ لە لات
شوعلەی نوور و صەفای، سیمای ذاتی مصطەفا
بمکە خاطر طاعەت و تەصدیق و تەقوایان هەموو
کاففەی ئەصحاب و ئەهلی بەیتی بێ بوغز و ڕیا
ئاگرینم، دڵ برینم، چاو نمینم، پڕ گرین
بێ موعینم، دڵ خەمینم، ئێش لە لام بێ ئینتیها
گەستە جەرگم، خەستە مەرگم، زامە بەرگم، خوێن خۆراک
زەردە ڕەنگم، قەطعە دەنگم، زۆر بە تەنگم، ڕەببەنا!
سا، بە ڕەحمی خۆت خوایا، چارەی ئەم کارە کە
غەیری تۆ، لای کێ بچێ « مینە »، دە هاوار هادیا «26- 25،60»

لە هۆنراوەیەکی دیکەشدا، بە شەستوسێ دێڕ، بە (حەوتبەندێ لە ئەنای حەزرەتی « محەمەد » )دا، لە سەرەتادا گوتوویەتی:

مەرحەبا، ئەی شاهی دەوران، ڕەحمەتەن لیلعالەمین !
مەرحەبا، ئەی شەهسواری مەحشەر و سالاری دین !
مەرحەبا، ئەی مەدحی تۆ یاسین و طاها و « وە ئەلضوحا » !
مەرحەبا، ئەی ئەشرەفی مەخلووق و خەتمولورسەلین !

ئەی نەبیی با صەفا، ئەی ئیسمی ذاتت مصطەفا!
ئەی لە نووری تۆ، مونەوەر مەشریق و مەغریب زەمین !
مەرحەبا، ئەی فەخری ئادەم، فەخری عالەم، مەرحەبا!
ئەی حەبیبی اذتی یەزدان و شەفیعو لمونبین !
دوای ئەو هەموو سلاوکردنە، پاشان، ستایشی کردووە و گوتوویەتی:
ئەی نەبیی ئوممەت پەناھ و ئەی ڕەسوولی مونتەخەب !
صاحێبی میعراج و تاج و سەروەری عالی نەسەب
حاکمی عاصی پەناھ و شەهریاری مولکی دین
ئەی ئەمیری بێ نەظیر و فەخری ئافاق و عەرەب !
ئەی لە ئایینی شەریفت، جوملە ئایین پڕ شەرەف
ئەی « موحەممەد »، ئیسمی ذاتت « ئەحمەد » و « مەحموود » لەقەب
لەو دەمەی تەشریفت برد و عەرشی عالیت، کردە فەرش
ئاسمنان پڕ شەوق و ذەوقە، ساکینانی پڕ طەڕەب
مەنبەعی ئیحسان و عەدلی دادخواهی عالەمی
یا ڕەسوولەڵلا ! چییە؟ ناپرسی دادم، ئەلعەجەب !
ئیدی، هەر بەو شێوەیە، لە سەر پێداهەڵدان و هانابردنی خۆی بەردەوامبووە، تا، لە کۆتاییشدا گوتوویەتی:
ئەی لە نوورت، بەهرەوەربوون ئەنبیا و ئەولیا!
ئەی بە شیری تۆ، سەراسەر، دینی کافر بوو تەلەف !
تێنمە ئەرجوو ئە قاپیت، ئەی شەهی کیشوەرگوشا !
عیززەتی « بووبەکر » و « عوثمان » و « عومەر »، شاهی « نەجەف »
بۆم بفەرموو، ئیلتیجایێ، لای خودای لایەزال
بەل نەجاتم بێ، لە بەحری ذیللەت و عیجز و ئەسەف
قاپیی ئەلطافی یەزدانیی، لە ڕووی من لادرێ
بێ نوزوولی ڕەحمەتی باریی لە حەق من، هەر طەرەف
صەد کەڕەت حەددی نییە « مینە »، کە مەدحی تۆ بکا
لێک هەتا ئەمرێت، ئەڵێ: ئەم بەیتە لێل ئاوازی دەف
« ئەنتە خەتم ئەلمورسەلین، ئەنتە ئیمام ئەلموتەقین
ئەنتە فەخر ئەلموئمینین، ئەنتە شەفیق ئەلموذنیبین » «35-28،60»

* * *

# « ئەخـــــــــــــــۆڵ »

## « 1988 - 1911 »

گەر چی، « ئەخـۆڵ »ی هۆنـەر، لەگـەڵ ئایین و خـواپەرسـتـیـیـدا، زۆر مـیـانەی نەبوو. بەلام، لەگـەڵ ئەوەشـدا، چەن هـۆنراوەیەکی ئایینیی هۆنیـوەتەوە. پتـر، لەوە دەچێ، هـۆنەر، زۆری لە خـۆی کردبـێ، تا، ئەو هۆنراوانەی گـوتبێ! چونکە، لە ڕووی دەربڕین و داڕشـتنـەوە، لە چاو هۆنـراوەکـانی دیکـەیدا، زۆر لاواز دەردەکـەون. لەبـەرئەوە، بە تـەواویی نەیتوانیـوە، ووشـەی کوردیی ڕەسـەن و پەتیی بەکـاربێنێ، بە کامی دڵی خـۆی، یاریی بە ووشـە بکا! بۆ نموونە: لـە هۆنراوەی « پاڕانەوە »دا، بە دە دێرە هۆنراوە گوتوویەتی:

ئیلاهی! ڕەحمکە، ڕەحم، یا ئیلاه!
تۆ صاحبی عەظەمەت و عیزز و جاه
خودایە! بە حەقی نەبی « موصطەفا »
نەوازشکە، چاری منی بێ نەوا
ئیلاهی! بە مەحبوبی چوار یار
« ئەبوبەکر » و « عەمەر » و « عەلی » و « ذی ئەلنوار »
دڵی پڕ لە دەردم، دەوا و چارەکە
عەطایە، بە عەبدێکی بێ چارەکە
ئیلاهی! بە گریانی پیرانی پیر
بە ناڵان و سۆزی، طیفڵانی شیر
شەرارەی دەروون و کڕووزەی دڵم
عیلاجیکە، وەصڵ و بە کامی دڵم
خوداوەندی ئەرض و سەما، هەر تۆی
نەجاتدەر لە جەور و جەفا، هەر تۆی
بە صیرِ و عەلانی، کە تۆی هەر خەبیر
لەکەڵ بێ کەسانا، ئەتۆی دەسگیر

له خەزنەی کەرەم، قەطرەیەک ڕەحمەتە
نەجاتمبدا، لەم هەموو ذیللەتە
من و مەسلەکی عەشق و دێوانەیی
له ئەرضی بێ بەری کرد، به ئاسمان گەیی «69،3»

هەروەها، له هۆنراوەی « وەصـفێک »یشـدا، به بیـسـتوشـەش دێڕە هۆنراوە، ستایشی پەیامبەری ئیسلامی کردووە و گوتوویەتی:

ئال و ئەصحابی « موحەممەد »ە، شەوق به دڵ ئینسان ئەدا
بێ ئەمەربووم بۆ نەمامێ، سەر لە ڕووی ئاسمان ئەدا
« بارەکەڵڵا » بۆ نەمامت، ئەی گوڵی گوڵزاری دڵ !
جوانیی تۆ، خۆی به مانگێ، یا، به ڕۆژ پیشانئەدا
تەرکی دنیا، چۆن نەکەم بۆت، ئەی شەهی « خوبان »ی من !
ڕووی گوڵی بێستانی ژینم، چینبەچین خەرمان ئەدا
ئابیتە، « شیرین »ی ئانیت، خۆ منیش « فەرهاد »ەکەم
وا قوڵنگی عەشقی پێیە، دڵ دڕی شاخان ئەدا
جیلوەیەک لەو نووری چاوەت، دای له سەر سینەم، ئیتر
بۆ غولامی دەرگەهی تۆ، حاضرم، تا جان ئەدا
حەلقەی خودامیی تۆ، وا له گوێما، تا خودا
حاکمی حوکمت ئەبێت و « موصطەفا »، فەرمان ئەکا
خالقم هەر خوایە، ئەمما، تۆش بتی ڕێی عەشقمی
هەم، مەناڵی سەر زەمینم، ئەم بەشەش یەزدان ئەدا
دڵبەرم، صاحیب سەرم جێگا دەرم هەر یارمە
چیم هەیە، هە خۆی حسێبە، فۆتە یا تاڵان ئەدا
ذەڕڕەیەک بوونی حەیاتم، یەک خودا، دووهەم ئەوە
بمکوژێ، بێ دەسەڵاتم، ئەو غەم و فەرمان ئەدا
ڕەببی لەم دنیایەدا، خۆشترم لەو کەس بوێ
دینسز و هەم جوانەمەرگبم، دڵ، کوڵی گریان ئەدا
ذەوقی زەهرە قوطب و کەیوان، من له سەر ئەرض شک ئەبەم
وا له بەر چاوم، داییم، شوعلەشی پەخشان ئەدا
سینەی شەمس و قەمەرمە، ڕەهرەوی بیابان و دەشت

من، چە ئیحتیاجی بە مانگ بم، هەر بە شەو ڕەخشان ئەدا
شافیعم غەیری « موحەممەد »، هەر ئەوە ڕۆژی جەزا
خۆ لە دنیاشا، هەوەسییە قەتڵم، یا پەخشان ئەدا
سەد وەکوو « بۆ جەهل » و « شەیتان »، نەعلەتم لێیە، ئەگەر
ناوی تۆ، من کەم فەرامۆش، تا خوا « سەیوان » ئەدا
ضدی ئەم حاڵەی وتم پێت، من ئەگەر کردم خیلاف
ڕووڕەشی قاپی خودام و هەم لە دین لامان ئەدا
طالعم گەر چی، سیاب و و ابە تەنها مامەوە
جێگەکەی جارانت ماوە، ئەو کەسە لامان ئەدا
ظوڵمت، گەر چی کردووە لێم، هەر خەڵاتی تێ ئەگەم
حەقی خۆم، قیامەت ئەسێنم، خوا بەشت ناڵان ئەدا
عالەم ئەمکاتە شاهید، چیت لە حاڵم کردووە؟
غەیری ئاخ و ئۆفی تۆ، من بێ ئەلەم دەردم نییە
باوەڕیش ناکە بە لەفظم، جەرگی وەک بریان ئەدا
قافڵەی ئۆردووی دووریت، هاتە سەر قەلعەی لەشم
غیرەتم، گەر چی نەماوە، یادی تۆ هەیە، جان ئەدا
قائیلم، بەم تۆزە بەشەم، ئەو ڕەوای نابینێ پێم
بۆ ئەوەی، ناوی نەمێنێ، خۆی لە من پەنهان ئەدا
کارێکی کردی لەگەڵما، « ذولفەقار »ی دوو ئەبرۆت
دائیما، جەللادی ڕوحمە، شیر بە هەڵکێشان ئەدا
لوئلوئە پیرۆزەیە، یا، خاڵی سەر ئەو گەردنەی
یا زمڕووت، یا زێڕجە، خۆی لە سەر زیوان ئەدا
مەرحەبەن، ئەی شاهی « خوبان »، نووری بینایی دیدەم !
هیچ نییە شوبهە، کە زوڵفت من لە سێداران ئەدا
ناڵەناڵی من، کە بۆ بالاتە، وەک هەوری بەهار
هەر وەکوو عەرعەر، کە هەڵچوو، خۆی لە ناو باغان ئەدا
وەختە بتوانم، بڵێم: زوڵفت، شەماڵ دێنێتە فەڕ
چەند کەس سووتاوی، وەکوو بۆ کوێستان ئەدا «3،110-112»

* * *

# « عــــــــــــــــەونیی »

## « 1992 - 1914 »

هۆنەر، لە هێندێ بواری « نەتەوەیی، کۆمەلایەتیی و ڕۆمانسیی »دا، گەلێ هۆنراوەی شیرین و دلگیری هۆنیوەتەوە. هەروەها، چەن هۆنراوەیەکی ئایینیشی داناوە. لە هۆنراوەی « خودایە »دا، زۆر بە ڕاشکاویی، دانی بە هەلە و گوناهەکانی خۆیدا ناوە. پاشان، داوای لێبووردنی، لە خوا کردووە، بە تەمای سۆز و میهرەبانیی یەزدان، دەسی پاڕانەوەی بەرزکردۆتەوە و بە هەشت دێڕ گوتوویەتی:

خودایە! تۆ دروستتکرد، سروشتم
لە خوانی نیعمەتی تۆ، پێگەیشتم
نییە چاکەم، لە بۆ ڕۆژی حیسابم
کە لوطفی تۆ نەبێ، من بەدڕەوشتم
بەبێ هوودە، ژیانی خۆم بەسەربرد
لە بێ بەختیی، درەنگ من تێگەیشتم
لە تاوان، ئەسپی خۆم لینگدا، بەبێ ڕێ
سەراسیمە، کە وێلی چۆل و دەشتم
پەنا بۆ کوێ بەرم، بێ سوودە ئیمڕۆ
لە زۆریی، کردەوەی ناڕێک و زوشتم
لە بەدکاریی و بەدخوویی ڕەوشتم
لە ژێر باری گوناها، کۆمە پشتم
شیاوی ئاگری دۆزەخ منم، من
بە ڕەحمی خوا، هیواداری بەهەشتم
کە هۆی بەدبەختیی خۆت، هەر خۆتی « عەونیی »
مەلێ، وابوو، لە ئەووەل سەر نویشتم «121،41»

هەروەها، هۆنەر، لە سێ چوارینەی جیاجیای دیکەشدا، دەربارەی خواناسیی و ڕۆژی لێپرسینەوە گوتوویەتی:

ڕێز و پیاوەتیی، هەر بە بەخشینە
بەهەشت وەرگرتن، بە خواناسینە
هەر کەس، بەخشین و خواناسیی نەبێ
مردنی، سەد جار، چاتر لە ژینە «226،41»

لە دووەمین چوارینەشدا گوتوویەتی:

پاش مردن، کاتێک کۆدەکرێنەوە
لە گۆڕەپانی لێپرسینەوە
هەر کەس، دەفتەرێک دەدرێتە دەستی
دەڵێن: «کردەوەی خۆت بخوێنەوە» «226،41»

لە سێیەمین چوارینەشدا گوتوویەتی:

ڕۆژی حەشرە، شەرمەزارم، ڕووم نییە، سەرهەڵبڕم
دەنکە جۆیێ چاکە، شک نابەم، پەنا بۆ کوێ بەرم
بەم هەموو تاوانەی کردوومە، نەجاتم چۆن دەبێ؟
گەر لە لای یەزدان، تکاکارم نەکا پێغەمبەرم!! «227،41»

بەڵام، لەگەڵ ئەوەشدا، ئەو چەن هۆنراوە ئایینییە جوانانەی هۆنیوەتەوە، کەچیی، سەیر ئەوەیە، لە چوارینێکی دیکەدا، یەکێ لە بنچینە گرنگەکانی، ئایینی ئیسلامی ڕەتکردۆتەوە، کە خۆی لە نوێژکردن و ناوی خودا هێناندا دەنوێنێ! بۆیە، بە شێوەیەکی زۆر خراپ و ناشیرین، «بەرماڵ، تەسبیح و عەسا»ی، ژێر پێناوە، کە بە هیچ شێوەیە، لەگەڵ ئەو دید و بۆچوونانەی پێشووتر دەربڕیوە، ناگونجێ و بە چوارینەیەک گوتوویەتی:

گەر ژیان، ماوەم بدات، ئەی پیریی! من پەیمان دەکەم
ببمە کۆیلە بۆ خەرابات، خزمەتی ڕەندان دەکەم
دەیخەمە ژێر پێمەوە، بەرماڵ و تەسبیح و عەسا
تاکوو ماوم، هەمنشینی شۆخ و چاومەستان دەکەم «228،41»

* * *

# « شـــــــــــپرزه »

## « 1998 - 1914 »

« نافیع مـەظـهەر ـ شپرزه »، هەر چەندە، خەڵکی « سـەقز »ی هەرێمی « ڕۆژهەڵاتی کوردستـان » بووه، بەڵام، مـــاوەیەکی زۆر، له شارەکانی « باشـووری کـوردسـتـان » به گـشـتیی و شـاری « سـولەیمانـیی » به تایبـەتیی ژیاوه. لـه نزیکەوه، ئاگـای له هەمـوو، ڕوداو و کـارەسـاته نەتەوەییـەکانـی کورد بووه، گۆڕانکاریی و گەشـەکردنەکانی کۆمـەڵی کوردەواریی، به چاوی خۆی دیوه. پێوەندییـەکی باشـی، لەگەڵ هێندێ ڕووناکبیر و هۆنەری وەک: « پیرەمێرد، زێوەر، قانـع، موفتیی، بەنگینه، حـەمدیی، ئەحـمـەد شـوکریی ... »دا هەبووه. لەبەرئەوه، زۆر چالاکانه، تێکەڵاوی کۆڕه وێژەیی و ڕامیارییەکەی، کۆمەڵگەی کوردەواریی بووه، بگره، بەشـــداریـیـشـی تێــدا کــردووه، چەندین جـار، گــوتـاری له ڕۆژنامەکاندا بـڵاوکردۆتەوه، لەگەڵ هۆنەرەکـاندا، چەندین نامـەیان، به هۆنراوه، بۆ یەکدی ناردووه.

هۆنەر، تەمـەنی دوازده سـاڵ بووه، دەسـی به هـۆنراوەگـوتـن کـردووه. گەلێ هـۆنراوەی، به زمـانەکـانی « کوردیی و فـارسـیی » هۆنـیـوەتەوه، زۆربەی هۆنراوەکـانی، خۆیان له بابەتی « نـەتەوەیی، ئایینیی، دڵداریی و کـۆمــەڵایەتـیی »دا دەنوێـنن، شــینی بۆ هـێندێ له پیــاوه ناودار و ڕووناکـبـیرەکـانی کـوردی وەک: « شـێخ مـەحـمـوودی حـەفـید، هـێمن، هەژار ... » کـردووه. « پیـرەمـێرد »ی هۆنەری، زۆر خـۆشـویـسـتـووه و چەندین هۆنراوەی، به سـەردا هـەڵداوه.

هۆنەر، چەن هۆنراوەیەکی ئایینیی نووسیوە، ستاییشی پەروەردگاری مەزن و پەیامبەری نازداری کردووە. تەنانەت، هۆنراوەیەکی جوان و ناسکیشی، بۆ « شێخ عەلائەددینی بیارە »ش هۆنیوەتەوە.
هەر چەندە، هۆنراوەکانی، چ لە ڕووی شێوە و چ لە ڕووی ناوەڕۆکەوە، کەمێ کز و لاوازن، بەڵام، لەگەڵ ئەوەشدا، هۆنەر هەر هەوڵیداوە، شوێن پێی، هۆنەرە کلاسیکییەکانی کورد هەڵگرێ، دەسڕەنگینیی خۆی بنوێنێ، هۆنراوەی ئایینیی دانێ، بە سەر یەزدان و پەیامبەردا هەڵدا. بۆیە، لە هۆنراوەی « زبانم لاڵە »دا، بە حەوت دێڕە هۆنراوە، ستاییشی یەزدانی کردووە و گوتوویەتی:

زبانم لاڵە، یا ڕەببی! لە بۆ حەمد و سوپاسی تۆ
چلۆن دەتوانێ، ئینسان تا بکا، تاریف و باسی تۆ
لە قورعانا ئەفەرموێ: هیچ شتێ، وێنەی ئەتۆ نابێ
بە مەخلووق ناکرێ، ئەڵبەتە، تەشبیه و قیاسی تۆ
ئەتۆ، گەنجێکی مەخفیی بووی، وەهات پێخۆشبوو، بتناسن
شعوورت دا بە مەخلووقت، هەتا بتناسێ، ناسی تۆ
لەگەڵ « موسا »، لە سەر شوانێکی سەحرا تووڕەبووی، چونکا
لەگەڵ گەورە و بچووکا، وەک یەک لوطف و تەماسی تۆ
بە وەی وا داوتە پێم، ڕازیم و شاکیر، ئەی خودای ڕازیق!
لباسی فاخیرم ناوێ، ئەگەر بمبێ، پلاسی تۆ
بە سەد گۆشت و پلاوی، هیچ کەسی ناگۆڕمەوە، هەرگیز
تریتی چێشتی بروێش و خەیار و نان و ماسی تۆ
بە ئایەی لوطف و ڕەحمەت، ئەم « شپرزە »ی خۆتە، دڵخۆشە
ئەمین و دڵنیایە ئەو، بە قەولی ڕێک و ڕاسی تۆ «282-281،62»

هەروەها، لە هۆنراوەیەکی دیکەدا، هەردوو ئایەتی ژمارە « 35 - 36 »، لە سوورەتی « نووری قورئانی پیرۆز »ی گۆڕیوە، ستاییشی خوای گەورەی کردووە و بە نۆ دێڕ گوتوویەتی:
خوا! کۆمەکبە، باش بکەم بەیان
وەصفی ذاتی تۆ، وەک ئایەی قورعان

خوا نوورێکە، زۆر ڕووناک و بەرز
ئەدرەوشێتەوە، لە عاسمان و عەرز
وەک چرا دانێ، چرات تێ نابێ
چراکەش، لە ناو شیشەی جوانابێ
شیشەکەیش، وەکوو ئەستێرەی پڕ سۆز
کە هەڵگیرسابێ، لە داری پیرۆز
داری زەیتونێ، نە غەربیی و نە شەرق
ئاری پێ نەگا و بسووتێ، وەک بەرق
ڕووناکیی، لە سەر ڕووناکیی کەوێ
ڕێنیشاندەربێ، بە وەی بیەوێ
مەثەل دادێنێ، خوا بە مانا
خوا، لە هەر شتێ، عالم و زانا
لە ناو ماڵێکا، ئیجازەئەدا
کە ناوی خوای، بەرزۆبێ تێدا
ناوی ئەو بەرن، ڕۆژی دوو جارە
تەسبیحی بکەن، صوبح و ئێوارە «286-285،62»

لە هۆنراوەی « بە قوربانی موحەممەد و عەلی »دا، بە شەش دێڕە هۆنراوە گوتوویەتی:

بە قوربانی « موحەممەد »، باوکی « فاتم »
هومێدم هەر ئەوە، ڕۆژی نەهاتم
بە قوربانی « عەلی »، زاوای « موحەممەد »
« عەلی » مەحبوب و ئامۆزای « موحەممەد »
« عەلی » پێی نایە، سەر شانی « موحەممەد »
« عەلی » خۆی کردە، قوربانی « موحەممەد »
بە قوربانی « ئەبو بەکر » و « عومەر » بم
فەدای « عوسمان »ی، پیری خوێن هەدەر بم
بەڵام، من هەر، تەوەلایی « عەلی »مە
وەلیمە، هەم حەکیمە، هە عەلیمە
« شپرزە »م تاکوو هەم، بۆ ئەو مریدم
مریدم، بەندەیێکی زەڕ خەریدم «149،62»

هەروەها، لە هۆنراوەی « یا رەسولەڵڵا »شدا و بە نۆ دێرە هۆنراوەی دیکە، ستایيشێکی پەیامبەری کردووە و گوتوویەتی:

لە ڕۆژی ترس و بیما، بمکە بیمە، یا رەسولەڵڵا !
فەقەط، یەک تیکە نان برسیمە، نیمە، یا رەسولەڵڵا !
ئەلەرزم، ئارەقی خەجڵەت ئەڕێژم، بێ سەبەب ئەگریم
بە ڕەحمت، ئەی طەبیب بڕوانە، چیمە، یا رەسولەڵڵا !
نەخۆشم، لێوبەبارم، شیر و شۆربا و ئاو، لە لام ژارە
تلاوتل، ناڵەی بێ تاقەتیمە، یا رەسولەڵڵا !
هەزار شوکری خوام، پێغەمبەری ئاخر زەمان، تۆم هەی
لە بۆ تۆشەی قیامەت، ترسی چیمە، یا رەسولەڵڵا !
گوناباری، بە قەد ئەستێرەکان و ئاوی دەریاکان
بەڵام، باکم نییە، ئەڵڵا کەریمە، یا رەسولەڵڵا !
خەوم دی، ڕووبەڕووم، پیاوێکی زانا، پێخەفی دووریم
لە لام وایە، نیشانەی ئاخریمە، یا رەسولەڵڵا !
ئومێدی من، لە تەکیە و خانەقاکانا برا، ئەمما
ئومێدی من، بە قورعانی عەظیمە، یا رەسولەڵڵا !
ئەگەر، بێ باک و بێ قەید و جەسوور و بێ ئیطاعەت بم
نیشانەی بێ حەیایی و ڕووڕەشیمە، یا رەسولەڵڵا !
چ باکم، گەر نەخۆشە ڕۆح و جیسمی « نافیعی مەظهەر »
« موحەممەد موصطەفا »، بۆ ئەو حەکیمە، یا رەسولەڵڵا !
«261-260،62»

* * *

# « حاجی برایمی شاتری جاف »

## « - 1919 »

هۆنەر، لە نێو کۆشی، خێزانێکی موسوڵمانی خوناسی دەسەڵاتداردا، چاوی بە ژیان هەڵهێناوە و گەورەبووە. هەر لە منداڵییەوە، نوێژی نەچووە، کاتێ گەورەش بووە، « حەج »ی ماڵی خوای کردووە. لە سەر دەسی، هێندێ مەلا و خوێنەواری، دەوروبەری باوکی، فێری خوێندن و نووسین بووە. هەروەها، هەر دوو بەرهەمی، وێژەیی بەرزی « گولستان و بوستان »ی « فارسیی » تەواوکردووە و بە تەواویی، سەوداسەریان بووە. زمانەکانی « کوردیی، عەرەبیی، فارسیی و توورکمانیی » زانیوە. بەڵام، هەر بە « کوردیی »، هۆنراوەی داناوە!

لە تەمەنی « 38 » ساڵیدا، دەسی بە هۆنراوەهۆنینەوە کردووە. هەموو هۆنراوەکانی، مۆرکێکی میلیی ڕەسەن، لە خۆیان دەگرن. بە زمانێکی ساکار گوتراون و هەر بەو زمانەی پەیشێوە، هۆنراوەشی پێ هۆنیوەتەوە. لەبەرئەوە، خوێنەری کورد، بە ئاسانیی لێیان تێدەگا!

زۆربەی زۆری هۆنراوەکانی، لە شێوەی نامە و نامەگۆڕینەوەدا، خۆی دەنوێنێ، بۆ خزم، دۆست و ناسیاوەکانی خۆی نووسیوە. بە هۆنراوەی گەرم، لە شایی و شینیاندا، بەشداریکردووە: ستاییشیکردوون، پیرۆزبایی جێژن و ژنهێنانی لێ کردوون، پرسەی بۆ داناون و شینی بۆ گێڕاون.

لە هۆنراوەی « مناجاتی خۆم لە خزمەتی پێغەمبەردا »، بە « 28 » دێڕهۆنراوە، سەرەتا، باسی باری گوناهباریی خۆی کردووە. پاشان، ئامۆژگاریی موسوڵمانانی کردووە، تا، لەوە پتر، تووشی گوناه و گومڕایی نەبن. ڕووی لە قاپی خوا کردووە، پاڕاوەتەوە و گوتوویەتی:

کوێرم، خەجاڵەت، داماوم، ذەلیل
زۆر گونابارم، یا ڕەسولەڵڵا ! دەغیل
لە کردە و فیعلی خۆم، پەشێوحاڵم
لە نەزانیی خۆم، وێرانەماڵم
هەرچیم کە کردمن، کردە لەمەوبەر
هیچ چاکەم نەبووە، ئەی خاکم بە سەر
ئێستە ئەزانم، وەحشیی و نەزان بووم
شوێنکەوتووی، دەستی نەفس و شەیتان بووم
شەیتانی لەعین، نەفسی ئەممارە
بە سەر ئەعضاما، ئاغا و سەرکارە
ئۆمەتی خۆتم، دەخیل، یا حەبیب !
با ئیتر، شەیتان، پێم نەدا غەریب
تاوان، معصییە، گوناه بە هەزار
چارێک شک نابەم، زیاد لە ئیستیغفار
دەغیلم، قوربان، شای شەوی میعراج !
پادشای ئەسراری، گفتوگۆ ڕەواج !
من گوناهبارم، تەوبە، هەزار جار
من داماو، فەقیر، تۆی شاهی سالار
ئۆمەتی خۆتم، عەبدێکی لارم
مەر بە شفاعەت، تۆ بکەی چارم
چاوەڕێی ڕەحم و شەفاعەتی تۆم
هەر خۆم ئەزانم، بێ طاعەتی خۆم
گوناهم زۆرە، لە ئەندازە زیادە
ڕەنجم چی داوە، هەمووی بە بادە
عومری تێپەڕبوو، جوانیی لەمەوبەر
گشت بە فیرۆ ڕۆی، هەی خاکم بە سەر
هەموویشی قەیدە، فیعل و کردارم
لە ڕێگەی طاعەت، زۆر چەوت و لارم

دوای ئەوەی، هۆنەر، زۆر بە ڕاشکاویی، دانی بە هەڵە و گوناهەکانی خۆیدا ناوە، ئینجا، دەسی پاڕانەوەی بەرزکردۆتەوە و گوتوویەتی:

یا ڕەب ! بە ڕەحمەت، پادشای ڕەحیم
لە بەر خاتری، قورئانی کەریم
لە بەر خاتری، سەدوبیسوچوار
هەزار پێغەمبەر، ئەشرەف و نازدار
لە بەر موورسەلی، سیازدەوسێ سەد
هەڵبژێراو و ناودار و ئەمجەد
لە بەر خاتری « نوح »، « ئیبراهیم »
بە « موسا »، « عەمران »، مەشهوور بە کەلیم
لە بەر موعجیزەی، « عیسا » ڕوحوڵڵا
بمبەخشە، یا ڕەب ! تو ڕەسوڵەڵڵا
لە بەر خاتری، سەدوچوار کەلام
کە فەرموودەی تۆن، چی لا یەنام
لە بەر شەرافەت، « تەورات » و « ئینجیل »
ڕاستیی بۆ ڕێگەم، بکە بە دەلیل
لە بەر ئیعجازی، سی جزمەی قورئان
بمخە ناو عەفوات، مانگی « ڕەمەزان »
لە بەر خاتری، ئەمانە هەموو
خۆشبە لە گوناه، پێش و ڕابردوو
جەبەڵی « ئوحود »، لە بۆ هاوارم
شاهیدی ئەدات، چەند بێ قەرارم
چون خوم ئەزانم، چەن چەوت و لارم
لە ڕەحمەت زیاتر، هیچ ناکا چارم
بمبەخشە، یا ڕەب ! خۆشبە لە گونام
لە بەر خاتری، ڕەسوولی کیرام
« برایم » ! مەترسە، چون خوا غەففارە
« موحەممەد » شەفیع، بۆ گوناهبارە
با گوناهی تۆیش، زیادبێ لە ئەنداز
عافواتی زۆرە، خوای بێ نیاز «25-23،6»

* * *

# « دڵـــــــــزار »

# « - 1920 »

جا، گەر بڵێم: زۆربەی هەرە زۆری، هۆنەرە کلاسیکییەکان و هێندێ، لە هۆنەرە هاوچەرخەکانی کوردیش، باوەڕێکی پتەویان، بە خوا هەبووە، بۆیە، هۆنراوەی ئایینییان هۆنیوەتەوە، هیچ لە ڕاستیی لام نەداوە. کەچیی، سەیر ئەوەیە، چەن هۆنەرێکی « کۆمۆنیست »، ئەوانەی، ئایینیان، بە تلیاکی گەلان زانیوە! هێندێ، هۆنراوەی ئایینییان گوتووە، کە لەگەڵ « بیر، باوەڕ، فەلسەفە، ئایدۆلۆژیا، ڕێباز و بەرنامەی پارت »ەکانیاندا ناگونجێ!

هەر بۆ نموونە: (هۆنەرێکی کۆمۆنیستی وەک « دڵزار »، ستاییشی پەیامبەری ئیسلامی کردووە، هۆنراوەیەکی جوانی، حەوت دێریی هۆنیوەتەوە، کە ئەوەیان بۆ « کۆمۆنیست »ەکان بقەیە! کەچیی، لە دیوانەکەیدا نییە و تۆماری نەکردووە!

هەڵبەتە، ئەو هۆنراوەیەی، سەردەمێ گوتووە، باوەڕی بە ئایین هەبووە. یا، ئەو کاتە، هێشتا، لە ڕیزی « پارتی کۆمۆنیستی عێراق »دا، کاری نەکردووە. دواتریش، کاتێ، ئەو باوەڕەی وەرگرتووە، لێی پەشیمان بۆتەوە، بۆیە، بڵاوی نەکردۆتەوە! بەڵام، هۆنراوەکە، لە دیوانەکەدا، بە شێوەی پێنجخشتەکییەکی " راجیێ "، لە سەر هەڵبەستێکی " دڵزار "، ساڵی « 1941 » هۆنراوەتەوە و لە دیوانەکەدا بڵاوکراوەتەوە. دیارە، هەموو دوو نیوەدێڕی کۆتایی هەر پێنجخشتەکییەک، لە بنەڕەتدا، هەر « دڵزار » خۆی گوتوونی.)«19»

با لێرەدا، ئەو حەوت پێنجخشتەکییە جوان و پڕ بایەخە، پێشکەش بە خوێنەرانی کورد بکەم، تا، هەموو بۆیان ڕوونبێتەوە، ئەو دوو هۆنەرە، « ڕاجیی » و « دڵزار »، لەو سەردەمەدا، بە چ شێوەیەکی بەرز و ڕازاوە، ستاییشی ئەو پەیامبەرە نازدارەی ئیسلامیان کردووە، مەگەر تەنیا هەر، لە دەس خۆیان هاتبێ و گوتبێتیان:

ئەصڵی هونەر و فەصڵی، هەموو ڕازە موحەممەد
تیشکی سەحەری ڕۆژی، پڕ ئاوازە موحەممەد
مێشکی صدفی کۆمەڵی، دەم سازە موحەممەد
شۆخێکە، لە ناو عالەمی مومتازە، موحەممەد
خاوەندی هەزار ئایەت و ئیعجازە، موحەممەد

نووڕێکە، لە ناو کیشوەری جانان، نییە حاجز
گەنجێکە، لە بۆ نەوعی بەشەر، جائز و فائز
شاهێکە، لە سەر تەختی مەقاصد، نییە عاجز
مانەندی لە ناو کۆمەڵی « خووبان »، نییە هەرگیز
سەرچاوەی حوسن و ئەدەب و نازە موحەممەد

گەر ژاڵەی « نیسان »ە، وە گەر ئاگری سوورە
گەر عونصوری ئینسانە، وە گەر صورەتی موورە
سەر بەرزە لە ڕووی، چونکە، هەیولای حضوورە
ڕەنگینە بە ڕوخساری، ئەڵێی، پرتەوی نوورە
مەخموورە بە چاو، شاهید و شەهبازە موحەممەد

بۆ قەدری بەشەر، چاوی سیای گرتووە بەژنی
سەرووی بە هەوا خستووە، بەرزی خووە بەژنی
سینەی قەفەسی، عیلم و نموونەی مووە بەژنی
وەک شەتڵە سنەوبەر، بە هەوا چووە بەژنی
ڕێککەوتووە ئەندامی، بە ئەندازە موحەممەد

بەم تەرزی، لە بۆ گەردەنی بەرز و دڵی داهی
بەم پەرچەمی، پڕ هاڵە و بەم ڕوومەتی ماهی
بەم ڕیزە گەوهەر، ڕیزە ددانە و سەری جاهی
بەم تیژی موژە و شیری برۆ و سونگی نیگاهی
خاوەندی سوپا و لەشکر و سەربازە موحەممەد

کوڵمە و لەبەکەی، پرتەوی دوو عالەمە، بە خوا
نووری قیدەم و بەهرەوەر و خاتەمە، بە خوا
زنجیرە و شیرازەی بەنیئادەمە، بە خوا
هەر چەندە، بکەم وەصفی جەمالی، کەمە، بە خوا
گەنجێکە، لە ناو ئادەمیا، شازە موحەممەد

جان، خادمی دەرگانەیەتی، بێ خۆر و بێ خەو
دڵ، عاشق و پەروانەیەتی، ڕۆژ و ئەگەر شەو
تۆش، هەر وەکوو « راجیی »، بە خوا، مەحوی لە پرتەو
« دڵزار » ! مەبە غافڵ، لە جیهەت مەدح و ثەنای ئەو
بۆ ڕاهی نەجات، مەطڵەب و دڵخوازە محەمەد «293-292،25»

* * *

# « حەسیب قــــــــــەرەداخیی »

## « 1925 - 1997 »

هۆنەرێکی ناسراوی « کۆمۆنیست »ی، وەک « حەسیب قەرەداخیی »، زۆربەی هەرە زۆری هۆنراوەکانی، بۆ خۆشەویستیی ژن و ئەوینی خاکی نیشتمانەکەی تەرخانکردووە. کەچیی، دوو هۆنراوەی ئایینیی هۆنیوەتەوە! هەر چەندە، هەر دوو هۆنراوەکە، مێژووی گوتنی، لە سەر نەنووسراوە، لەبەرئەوە نازانم، لە چ ساڵێکی تەمەنیدا دایناون! بەڵام، زۆر پێدەچێ، لە کۆتایی تەمەنیدا گوتبنی. چونکە، زۆربەی هەرە زۆری موسوڵمانان، هەر چەندە لە ژیانی خۆیاندا، بێ باوەڕیش بن، کەچیی، لەو سەردەمە درنگانەی تەمەنیاندا، هەر پاشگەزدەبنەوە، دەگەڕێنەوە، ڕوو لە دەرگەی، پڕ لە سۆز و میهرەبانیی پەروەردگاری جیهان دەکەن! جا، ئێستە، با بزانین، هۆنەر، لە هۆنراوەی « عیشقی خودایی »دا، چ جۆرە ملوانکەیەکی پیرۆزی، لە گەوهەر و مرواریی پڕ بایەخ، بۆ هۆنیوینەتەوە؟ چی نوێی پێشکەشکردووین؟ لە چ دڵ و دەروونێکی، پڕ لە ئەوینی خواپەرستیی و پاشگەزبوونەوەوە، هەستی بێ گەردی خۆی دەربڕیوە؟ بەڵێ، هۆنەر، لە حەوت پێنجینەی زۆر نایابدا، زۆر بە ڕاشکاویی و بە کوڵودڵەوە، پەشیمانیی خۆی پیشانداوە، هانای بۆ یەزدانی مەزن بردووە و گوتوویەتی:

من، ئەوا هاتم، بە کۆڵێ دەرد و ئێش و زامــــەوە<br>
مەینەتم زۆر بوو لەمەوبەر، وا، سەری لێ دامەوە<br>
نەفســــــی ئەممارەم، لە ڕێما داوی بۆ دانامەوە<br>
کێ پەنامە؟ کێ تکامە، بێجگە میهری ذاتی خوا؟<br>
تۆفی عصیان، مؤمنم من، تۆ شکای، نەشکامەوە

ئەو کەسەی خـــاوەن دەروونـــــــــــە، تێدەگا دەدی دڵان
ئەو کەسەی خاوەندی هەستە، بۆن ئەکات: عەتری گوڵان
ئەو کەسەی گەرما کوڵانـــــدی، چاوی وا لە سەر چاوان
کێ گڕەی ئەم ناخە گەرمەم، بۆ ئەخاتە بەر شەماڵ
بێجگە میهری ذاتی خواوەند، کەس وەڵامی دامەوە؟!

من، کە بەندەی ئەو خودایەم، ڕوو لە دەرگای ئەو دەنێم
بەندەیی بۆ ذاتی خواوەند، گـــەر نەکەم، بۆچی دەشێم؟!
شایەتی ئەم حیکمەتەیشە، چـــی ئەنووسم، چیش ئەڵێم
هەر خودا، خۆی من دەناسێ و چاوی وا لەم کارەیە
وا، بە شەستی ڕەحمەتـــی ئەو، جارێ تر بووژامەوە!

ئەی خودای گەورە و بە میهر و خاوەنی دەریای کەرەم!
گەر سەرم شـــــــەیدا نەبێ بۆت، بیشکێنە ئەم سەرەم
هەر بـــــــــەرەی دینە دەهێنێ، بانگبدەم، من لەو بەرەم
ئەی خوداوەنـــــد! ڕێنمایی، دەوروبەر وا تێکچووە
هەر چەنێک کەوتم لە ڕێدا، وا، لە نوێ هەڵسامەوە

عەشقی تۆ، پێش ترس و بیمە، عاشـــــــقی ذاتی ئەتۆم
ڕووم لە جوانیی بوونی تۆیە، هەر بەرەو لای ئەو ئەڕۆم
داوی ئەم ســــــۆزە پەسەندەم، کرد بە تاڵی تان و پۆم
عاشقم خـــــوایە، بە خواییت، ئەم گڕەم مەکوژێنەوە
چونکە، نووری بۆ دەروونە، ئێستاکە و ئەو سامەوە!

ئەی فرستادی خوداوەنــــــــــــــد! ئەی « محەمەد » الامان!
ئەشکی حەسرەت، وا لە چاوم هات، وەکوو چاوگەی چەمان
وا لە سەر ڕێی عومری کـــــورتا، بووم بە ئاشیانەی خەمان
دەستی یاریدەت، زەلیلم، باری مەینەت چل مەنە
قایلم بەو داخ و دەردە، قـــــەرزێ بوو، من دامەوە

بانگی حــــــــــەق هات و دەروونم کردەوە، بێ لام و جیم
دەست بە دوعام، ئەی خودای خۆم، تاکوو هەر ساتێک دەژیم
بافتی لۆمــــــــــە و نەفرەتیشە، چەرخی ڕۆژگاریێ کە دێم
أشــــــــــــهد، أن لا إله غیرک، یا ربنا!
خۆ « محمد » خۆی ڕەسووڵە، وا منیش پاڕامەوە
«333-332،15»

جا، سەیر ئەوەیە، هۆنەر، هۆنراوەی دووەمی، پێشکەش بە « مامۆستا مەلا سامان » کردووە، تا، وەک « بولبولی خۆشخوان »، ئاوازی بۆ دانێ و بە دەنگەخۆشەکەی خۆی، بیچڕێ!
با بزانین، ئەم جارەیان، لە هۆنراوەی « نزایەک »دا، هۆنەر، داوای چی کردووە؟ بە چ شێوەیە، دەسی نزای، بۆ حەوت تەبەقەی ئاسمان بەرز کردۆتەوە و پاڕاوەتەوە، کاتێ گوتوویەتی:

خوایە! داکەیت شەستی ڕەحمەت، مەزرەعەی دڵ تەژنەیە
ڕەحمەتی تۆ بێ شومارە و چاوم، هەر لەو خەزنەیە
ئێمە، بەندە و دەستە دوعاین، تۆ غەفووریت و تۆ کەریم
بۆمی ڕابێنە لەسەر خێر، نەفسی ئەممارە و سەقیم
عاشقی قورئانی تۆم و طالبی عەفوو و کەرەم
خوایە! تۆ زۆر میهرەبانی، مەمخە گێژاوی نەدەم
ئێمە چی بکەین؟ خۆ سەفەرمان حەتمییە، ئەمڕۆ سبەی
خوایە! لوطفێ، ئێمە بەندەین، بەندە بێ توێشوو نەکەی
هۆ برای هاودین و ئایین! ڕوو لە خوا بین چاترە
ئەو شتەی تۆ وا دەزانیت سیڕڕە، لای ئەو ظاهرە
ئەم گەلی کوردە هەژارە، وێڵ و مەظڵوومە برام
با، هەموومان پشتی ئەو بین، تا، دەگاتە جێ و مەرام
خوایە! ئێمە ڕوو لە تۆین و داد و هاوارمان هەیە
بەحری عصیان و هەوامان، هێندە قووڵە بێ پەیە
حەبلی سۆزت، دەستی ئێمەی کەی دەگاتێ بۆ نەجات؟!
ئێمە کوێرین، بێجگە ذاتت، کێ بەرەو خۆتمان دەبات؟!

خوایە! کوردیش، وەک گەلانی سەرزەمین، شایەتی ...
دینی تۆیان، لا پەسەندە، دێرِبەدێرِ و ئایەتی
خوایە! ئاواتی بەدیبێت، خوایە! ئاشتیی و سەروەریی
بەرژەوەندیی خاک و خەڵکی خۆی بکاتە رِابەری
دینی ئیسلامە عەقیدەم، بەندەیێکی چاوەرِێم
ذاتی پێغەمبەر سرووودمە، سەر لە رِێیا دادەنێم
باوەرِم وایە، بە لوتفت ئەم صەلاتەم بەی بە ئەو
سەد صەلاتی بۆ دەنێرم، وەک دیاریی رِۆژ و شەو
«334-333،15»

* * *

# « هێدی »

## « 1925 - »

ڕەنگە هۆنەر، تەنیا هەر، ئەم هۆنراوە ئایینییەی گوتبێ، کە بە چل و شەش دێڕە هۆنراوە، سەدەقی بەرهەمەکەی، بە ناوی « بیسمی للاهی لرەحمان لرەحیم »ەوە شکاندووە و سەرەتای دیوانەکەی پێ کردۆتەوە! سەرەتا، لەگەڵ خوای خۆی دواوە و گوتوویەتی:

سەری نامەم، بە ناوی تۆ خوایە
کە بێ ناوی تۆ، نامە بێ نەوایە
خوای بەرز و نەوی و هەوراز و لێژان
خوای ڕۆژی دەری، پیتۆڵ و گێژان
خوای تەنیای دیار و نادیاران
خوای میر و بەلەنگاز و هەژاران
خوای من، ئەی خوای دڵ شاد و دڵتەنگ !
خوای بێ یار و بێ هاڤاڵ و بێ ڕەنگ
خوای بینا، خوای زانا بە حاڵان
خوای بێ یاوەر و ڕووت و ڕەجاڵان
بە چاولێکنانێ، لێکهەڵدێنی چاوێ
بەهێزە دەستی تۆ، هەوکاری ناوێ
ئەگەر چیی، حاضر و ناظر لە گشت جێی
خەیاڵ ناگاتە ئەو جێیە، کە تۆی لێی

وجودی تۆ، ئەگەر چی، ڕوون و سووره
لە ڕادەی دەرکی زانستیش، بە دووره
خوای هەست و وتە و بیر و خەیاڵان
خوای کوێر و کەڕ و گێڕ و گەواڵان
بە جیرەی بێ منەت، تێر و بە ئێروو
لە سەر خوانی خواییت، مار و مێروو
بە تێربوون و نەبوونی مووچەخۆران
لە دەرکی تۆ نییە، تاران و تۆران
بە تۆ دەکرێ، بنێری تیشکی تاوێ
کە بێ، گیانی وەبەر، بێ گیانی باوێ
لە تۆ ڕایە، تریفەی مانگ لە شەودا
ئەتۆی بێ دار و باقی تر لە خەودا
تەڕ و پاراوی تۆن، ئەزمان لە زاران
لە دەس تۆدا، دڵی یار و نەیاران
بە ئەمری تۆ، هەور، بارانی دێنێ
بە سەر چۆڵ و چیادا، دەیڕژێنێ
بە ویستی تۆیە، خێریان لێ دەبارێ
کەشی هاوین و پاییز و بەهارێ
ئەتۆ وات کرد، کە زستانان بە سەبرن
ئەگەر زستان، لە ژێر بارستی بەفرن
خوایە! ئەی خوای جوان و دزێوان !
خوای ئەگریجە زەرد و کوڵمە زێوان
خوای سینەی سپیی و نەرم و دڵی سەنگ
خوای بسک و کەزیی شۆڕ و قەدی تەنگ

پاشان، زۆر بە ڕاشکاویی، مەبەستی لەو هەموو پێداهەڵدان و ستایشکردنەی خۆی ڕوونکردۆتەوە، لە خوا پاڕاوەتەوە، تا، لە کارەکانیدا سەرکەوتووبێ و گوتوویەتی:

من ئەوڕۆ، چم ئەوێ لێت، هەر زمانی
زمانێ بێ، کە پەسنی تۆ بزانێ

زمانێک بێ، کە زانی، زارە کارم
بە هاسانیی، ووشە باویتە زارم
زمانێک بێ، لەگەڵ ئەو واتە ئۆگر
کە " تەنیا تۆ خوای، ئیتر کەسی تر "
خەیاڵی من، مناڵێ بێ زمانە
دەنا، یادی تۆ، ئاوێتەی دڵانە
وتاری زۆرە بیلێ و چەشنی منداڵ
قسەی بۆ نایە، دەیکاتە گڕوکاڵ
لە جێیەک، پەسنی تۆ، زانا نەزانێ
چ دێ، ئیتر، لە دەستی بێ زمانێ
دڵێکم پێ بدە، دەریای ئەوین بێ
بەرین بێ، بێ برین بێ، ئاگرین بێ
دڵێک بێ، خوێن نەبێ، دڵێ بێ، لە سینە
دڵێ، بێ ژەنگ و گەرد و بوغز و کینە
بە جارێ، زۆری هێنا، دەردەداریی
دەس و هەنگاوی شلکرد، لەشبەباریی
ئیتر، با تەم، لە بەر چاو نارەوێنێ
ڕوانگەی دیدە، هەر دێ و کورتی دێنێ
لە ئاڵۆزیی وتارمڕا، دیارە
کە چی پێم کردووە، دەرد و پەژارە
بنێرە خوایە، هەتوانی برینم
کە ژانی دڵ بڕیی، خۆشیی لە ژینم
ئیتر، ئەو جار، من و ژینێکی بێ وەی
ئیتر، جێی ئاخ و داخان بگرێ، ئۆخەی
خەمێکم پێ مەدە، زێدەی توانام
خەمت، خوایە، لە توانا زیدە پێ دام
لە بەر بێ چارەییم، هەنگاوبەهەنگاو
بە سەر شێواویی دەڕوانن، سەر و چاو
دوا قۆناغی ڕێگەم، دەرکی تۆیە
خوا! بگرە دەسم، لەو هاتوچۆیە

بەزەت پێمدا بێ، ڕووناکیی بخە ڕێم
کە بەو ڕێ ڕاستەدا، ڕزگاربم و بێم
ئەگەر، کار کەوتە بەخشینی خوایی
بە گشت پاڕانەوێک، دێنی دوایی
بەڵام، کەی تامی مەرگم پێ دەچێژن
لە « کوردستان »ی ڕزگارم بنێژن
لە فیردەوسا و لە « کوردستان »ی زەنوێر
لەش و گیان بەشبن و سەیران بکەن تێر
بە ئەسپایی، دێ دەنگێ نادیاری
دەچرپێنێ بە گوێما، جاربەجاری
کە ڕۆیی کاروان و پای تۆ لەنگە
لەشت پێ ناچێ، گیان دەرکە، درەنگە
تەمەن، هەر چی هەبوو، ڕۆیی لە خەودا
ئەبینم، ئێستە، زۆر کەم ماوە مەودا
لە ئەستۆم هێند گرانە، باری تاوان
چەماون پشتم و ئەژنۆم لە تاوان
بە تەنیایی، لە ڕێگەی دوور و بێ بن
تەمام تەنیا، بە لوطفی تۆ هەیە من
لە کۆتاییشدا گوتوویەتی:
نییە تۆشەم، لە ڕوحمی تۆ زیاتر
کە لەو ڕوحمە نییە، هیچ تۆشە چاتر
نە چارێکم هەیە ئیتر، نە ڕێی دی
بەرەو قاپیت ئەوە دێم، هێدی « هێدی » «123-119،23»

* * *

# « بێـــــــــــوەی »

## « 1931 - 1996 »

زۆربەی هەرە زۆری هۆنراوەکانی، لە نامەنووسین پێکهاتوون. هۆنەر، هۆنراوەی بۆ خزم و دۆستەکانی خۆی هۆنیوەتەوە و بۆی ناردوون. هێندێ هۆنراوەی کەمیشی، دەربارەی « جێژنی نەورۆز، کەژی بەهار، باسی ڕۆمانسیی و کێشەی کۆمەڵایەتیی » داناوە.

هۆنەر، زمانەکانی « کوردیی، عەرەبیی و فارسیی »، بە باشیی زانیوە. بە هەر دوو دیالێکتی « گۆران ـ هەورامانیی » و « کرمانجیی ـ کرمانجی خواروو »، هۆنراوەی گوتووە. هەروەها، چەن هۆنراوەیەکی کەمیشی، بە زمانی « فارسیی » هۆنیوەتەوە.

هێندەی، لە هۆنراوەکانی بەشی « کرمانجی خواروو »ی وردبوومەوە و لەگەڵ هۆنراوەکانی بەشی « هەورامانیی »دا بەراوردمکردن، تێگەیشتم، هۆنەر، لە یەکەمین بەشدا، لە ڕووی هونەری هۆنراوە هۆنینەوە، لاوازبووە! واتە: پتر، دەسەڵاتی بە سەر بەشی دووەمدا شکاوە و بە شێوەیەکی جوانتر، هۆنراوەکانی خۆی ڕازاندۆتەوە!

هەر چەندە، « بێوەی »ی هۆنەر، پیاوێکی خواناس، لە بنەماڵەیەکی ئایینیی ناودار و وەچەی شێخەکانی « نەقشبەندیی ـ بیارە » بووە،* بەڵام، لە دیوانەکەیدا، تەنیا هەر، یەک چوارخشتەکیی « لەگەڵ خودای خۆم »، لە ستاییشی یەزدانی گەورەدا هۆنیوەتەوە و گوتوویەتی:

به غەیری لوطفی تۆ، قەط طالبی گەنج و گەوهەر نابم
کە لوطفت بوو، نییە فەرقی گەدابم، یا وەکوو شابم
نەزانم، کامە باشە بۆم، ئیتر، داوا لە تۆ چی بکەم؟
کەوابوو، کامە باشە بۆم، خووا وابێ، خووا وابم «17،10»

له هەوڵێکی دیکەدا، هۆنەر ویستوویەتی، کێشەکانی فەلسەفە و باسی ئایین، تێکەڵاوکا و چارەسەرێکیان بۆ بدۆزێتەوە. بەڵام، چ لە ڕووی شێوە و چ لە ڕووی ناوەڕۆکەوە، زۆر سەرکەوتوو نەبووە! وەک لە هۆنراوەی « فەلسەفەی ژیان لە ڕوانگەی ئایینەوە » دەردەکەوێ، کاتێ، بە نۆ دێڕە هۆنراوە گوتوویەتی:

سەرێ، گەر خواپەرستیی تیا نەبوو، پوچە و بەجێماوە
دڵێ، وا نووری حەق شەیدای نەکا، تەختەی سەری ئاوە
دوو چاوم، بۆیە لا چاکە، کە ڕێگەی ڕاس دیارییکەن
کە چاو ڕێگەی نەدی، گاڵۆکی کوێرێ چاکە، لەو چاوە
خێرەد، وەختێ بە کەڵکە، وا لە دەردی سەر نەجاتمدا
چ عەقڵێکە نەزانێ، کامە دانە و کامەیە داوە
دەستێک، هەر هەوڵی بردن بۆ دەم و گیرفانی ئینسان بێ
چ دەستێکە نەزانێ، کامە پاکە و کامە کڵیاوە
ئەگەر قاچوقولم، هەر بۆ پەلامار بێ، بە هەر لادا
لە ئەکاما ئەبێ، بمخاتە ناو چاوە، بە دوو پاوە
زوان، بۆیە خوا داویە، کە ڕاس و چاک و باش بێژێ
ئەگەر، هەر بەد بە خەڵک ئێژێ، ئەوە ماری کونی ناوە
ئەگەر گوێ، گوێ قوڵاغی غەیبەت و لۆمەی برایانە
خۆشا بەو ڕۆژە وا بێژن، کە پەردەی گوێتە دڕیاوە
پەنا بە خوا بەرین چاکە، مەگەر هەر ئەو بە لوطفی خۆی
بمانپارێزێ لەم داوە، چ لەم لاوە، چ لەو لاوە
« ئەمین » ! ئەگەر، لوطفی حەق فریا نەکا، لەم ڕۆژ و دەورانا
بەشەر، تا چاوە کاتۆ، تیاچووە، فەوتاوە، خنکاوە «10، 131-132»

* * *

---

* « بێوەی »، نازناوی « شێخ ئەمینی کوڕی شێخ عەلائەددینی نەقشبەندیی »یە و برای « شێخ موحەممەد عوسمانی سیراجەددینی بیارە » بوو!

# کۆتایـــــــــــی و ئەنجام

لەم لێکۆڵینەوەیەدا، نموونەم، لە سـەر هۆنراوەی ئایینیی، « 52 » هۆنەری کورد هێناوەتەوە، « 69 » سەرچاوەشم، بەکارهێناوە.
لە بەر ڕۆشنایی، ئەو نموونانەی، لە دووتوێی، ئەم بەرگەدا هاتوون، چەن خاڵێکی سەرەکییمان، بۆ ڕووندەبێتەوە:
1. هۆنراوەی ئایینیی، لە نێو کورددا، مێژوویەکی زۆر کۆنی هەیە و هۆنەرانی کورد، لە هەموو سەردەمێکدا، هۆنراوەی ئایینییان هۆنیوەتەوە.
2. کاتێ، ئایینی ئیسلام، لە کوردستاندا بڵاوبۆتەوە، هۆنراوەی ئایینیی، پتر گەشەیکردووە و پەرەیسەندووە. چونکە، زۆربەی هەرە زۆری، هۆنەرە کلاسیکییەکانی کورد، خواپەرست، زانا و مەلای ئایینیی بوون. لەبەرئەوە، هۆنراوەی ئایینییان گوتووە.
3. هۆنراوەی ئایینیی، بە هۆی هێندێ فاکتەرەوە، وردەوردە، لە بەرهەمی وێژەیی، هۆنەرە هاوچەرخەکانی کورددا، کزولاوازبووە، یا، بە تەواویی، وشکیکردووە.
4. زۆربەی زۆری، ئەو هۆنراوە ئایینییانەی گوتراون، پتر خۆیان، لە ستاییشی یەزدانی گەورە و پەیامبەری ئیسلامدا دەبینن. هێندێ لە هۆنەرانیش، هۆنراوەیان، بە سەر چوار جێنشینەکە، هێندێ لە یارانی پەیامبەر، پیاوچاکانی کورد و ئیسلامدا هەڵداوە.
5. هۆنەرە کلاسیکییەکان و هێندێ لە هۆنەرە هاوچەرخەکانیشمان، لە هۆنراوەکانیاندا، دانیان بە هەڵە، تاوان و گوناهەکانی خۆیاندا ناوە. لە پەروەردگاری جیهان پاڕاونەتەوە، تا، لە گوناهەکانیان خۆش بێ. تکایان لە پەیامبەر کردووە، تا، لای خوای مەزن، داوای لێبوردنیان بۆ بکا و گیانیان، بە بەهەشتی بەرین شادکا.

6. هۆنەرە کلاسیکییە خواناس و سۆفییەکان، لە ڕوانگەی ئایینەوە، لە هەموو دیاردە و دەرکەوتەکانی گەردوونیان ڕوانیوە. لەبەرئەوە، هۆنراوە ئایینییەکانی خۆیان، بە باسی جوانیی سروشت، هەستی خۆشەویستیی و ئەڤین موتووربەکردووە، ڕازاندوویانەتەوە، هێز و پێزێکی پتریان پێ داوە. بۆیە، خوێنەر، چێژێکی تایبەتیی، لە زۆربەی ئەو هۆنراوانە وەردەگرێ، خێراتریش، جێی خۆیان، لە نێو دڵ و دەروونیدا دەکەنەوە!
7. زۆربەی ئەو هۆنراوانەش، چ لە شێوە و چ لە ناوەڕۆکدا، لە یەکدی دەچن، یا، زۆر لە یەکدییەوە نزیکن. لەوە دەچێ، هۆنەرەکانی کورد، کەڵکیان، لە بەرهەمەکانی یەکدی وەرگرتبێ. بۆ نموونە: لە گەلێ هۆنراوەدا، هێندێ ڕاڤەی وەک: « مووی سپی، ڕووی ڕەش، پشتی چەماوە، چاوی کوێر کەلاوەی دەم،، گوێی کەڕ، زەریای ساوە، چیرۆکی ئادەم و حەوا، شێخی صەنعان ... » دووبارە و چەن بارە بوونەتەوە. یا، زۆربەی هۆنەرەکان، لە کۆتایی هۆنراوەکانیاندا، پاڕاونەتەوە و لالاونەتەوە، داوای لێبووردنیان کردووە. یا، خۆیان زۆر بە پچووک، پیشانداوە و گوتوویانە: ئێمە هیچ نین، باسی گەورەیی، دەسەڵات و میهرەبانیی خوا بکەین !
8. هێندێ لە هۆنەرە کلاسیکییەکانی کورد، هێندێ جار، هۆنراوەیەک یا، چامەیەکی دیاریکراویان گوتووە، جگە لەوەی، بۆ هەمان مەبەست گوتراون، لە هەمان کاتیشدا، گەر لە ناوەڕۆکدا، لە یەک نەچووبن، ئەوا، لە ناو و شێوەدا، زۆر لە یەکدییەوە نزیکبوون. بۆ نموونە: چامەی « بەحری نوور »، چەن هۆنەرێکی وەک: « موخلیص، مەحویی، خاکیی، نەقیب و خادیم » گوتوویانە. بەڵام، هەموویان، وەک یەک نەیانتوانیوە، بە شێوەیەکی جوان و ڕێکوپێک بیڕازێننەوە. هەر وەک، دوکتۆر « عیززەدین »یش نووسیویەتی: (سێ هۆنەر، بە ناوی « بەحری نوور »ەوە چامەیان هەیە. سەرەتا « موخلیص » نووسیویەتی، پاشان « مەحویی و خاکیی ». هەر سێ چامەیان، ناردووە بۆ « شێخ عومەری بیارە » بڕیاریان لەسەربدا. وەڵامی ئەوەبووە، هونەر بۆ « موخلیص »ە چونکە دەسپێکەرە، کارەکەی « مەحویی » شاکارە، ئەوی « خاکیی » باشە، بەڵام هەناسەی وەک ئەوان نییە.)«33،57»

دیاره، ئەو کاتەی دوکتۆر، ناوی ئەو سێ هۆنەرەی بردووە، یا، ئەو دوو هۆنەرە « نەقیب و خادیم »، هێشتا، ئەو دوو چامەیەیان نەنووسیوە، یا، دوکتۆر ئاگای لەو دوو چامەیە نەبووە، بۆیە ناوی نەبردوون!

بۆ نموونە: « موخلیص » گوتوویەتی:

هەموو ذەڕڕاتی جیسم، غەرقی لوججەی بەحری عصیانە
لە دەست ئەم نەفسە ئەممارە، عەجەب حاڵم پەرێشانە
هەوا و حیرسی دنیا، نەفسی بەد، ئەخلاقی بێ دینیی
لە مندا، جەمعی مەوجوودە، کەوا مەطلووبی شەیطانە «34-33،57»

« مەحویی » گوتوویەتی:

« وە صەلەڵلاهو عەلا »، ئەو بەحری نووری عیلم و عیرفانە
کە دەرکی غەوری ناکا، « غەیرو عیلم ڵلاهی سوبحانەهو »
« وە صەلەڵلاهو عەلا »، ئەو ذاتی پاکی قودسی ئایاتە
کە ئەخلاقی، پەسەندیدەی جەنابی حەییی مەننانە «419،55»

« خاکیی » گوتوویەتی:

ببارێنی خوا، بارانی، هەرچی فەیض و ئیحسانە
لە سەر ئەو باعیثی خەلق و گوزیدەی جەمعی ئەکوانە
دەمی صوبحی ئەزەل داکا، هەتا شامی ئەبەد بڕژێ
بە یەک تاو بێ، نەکوو تاوتاو، وەکوو تاوی بەهارانە «7،2»

« نەقیب » گوتوویەتی:

« وە صەلەڵلاهو عەلا » ذاتێ، کە قورئانی ئەناخوانە
لە جوملەی موعجیزاتی ئەووەڵی، ئایاتی سوبحانە
شەهەنشاهی سەریری « لی مەع ئەڵلا »، واسیطەی ئیمکان
ڕەسووڵی ئینس و جانە، ئونسی جانە، بەحری ئیحسانە «53-52،2»

« خادیم » گوتوویەتی:

ئەی پێشەوای، مەحفەلی سالاری ئەنبیا!
وەی ڕەهنومای، جانی عەزیزانی ئەولیا !
ئەی شەمعی جەمعی، مەجلیسی ڕەوحانیانی عەشق !
پەروانەیە بە دەوری تۆ، ئەرواحی ئەتقیا «55،21»

* * *

# سەرچاوەکان


1. ئاوات، دیوان، چاپ1، چاپخانە مهارت، تهران، 1365 هەتاویی.
2. ئەحمەدی نەقیب ـ سەیید، دیوان، چاپ1، چاپخانەی ئەلئیرشاد، بەغدا، 1985.
3. ئەخۆل، دیوان، سەرجەمی شیعرەکانی، چاپ 3، سلیمانی، 2000.
4. ئەسیری ـ دیوان، بەرگ1، چاپ1، چاپخانەی ئەلحەوادث، بەغدا، 1980.
5. ئەنوەر قادر محەمەد، لیریکای شاعیری گەورەی کورد مەولەوی، چاپ1، ستۆکهۆلم، 1990.
6. براهیمی شاتری ـ حاجی، دیوان، چاپ1، چاپخانەی ئەلحوریە، بەغدا، 1989.
7. باباتاهیری عوریان، دیوان، چوارینەکانی، رازی وەریگێراوە، چاپ2، چاپخانەی بابل، بەغدا، 1979.
8. بێخود، دیوان، کۆکردنەوە و رێکخستن و لە سەر نووسینی محمدی مەلا کریم، لە ئێران چاپکراوەتەوە، بێ ئەوەی هیچی لە سەر بێ!
9. بێسارانی، دیوان، چاپ 1، چاپخانەی میهن، سنە، 1375 هـ.
10. بێوەی، ئەمین ئەقشبەندی، بەرهەمی ژیان و دیوانی هۆنراوەکانی، چاپ1. چاپخانەی شەفیق، بەغدا، 1980.
11. پیرەمێردی نەمر، دیوان، نووسینی محمد رسول « هاوار »، ...؟
12. چڕوستانیی، دیوان، چاپ 1، چاپخانەی نەورەس، سلیمانی، 1985.
13. چەپەگوڵێ لە گوڵزاری عوثمانی، دیوان، ئامادەکردنی عەبدوڵلا مستەفا سالح، چاپ1، چاپخانەی ئەلحەوادث، بەغدا، 1991.
14. حەریق، دیوان، چاپ1، لە بلاوکراوەکانی چاپەمەنی محەمەدی، سەقز، بەهاری1369 هـ.
15. حەسیب قەرەداخی، فەرهەنگی خەم، بەرگ2، چاپ1، هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، 2002.
16. حەمدی، دیوان، چاپ1، چاپخانەی ئۆفیست، بەغدا، 1984. جاری دووەم لە لایەن « کیتاب هەرزان »دوە لە « سوید » بلاوکراوەتەوە.
17. د. حوسێن محەمەد عەزیز، چەند سەرنجێ دەربارەی ناسنامەی ئایینیی و نەتەوەیی « خەلیل منەوەر »، گۆڤاری ئێستا، ژمارە 20، سولەیمانیی، 1999.
18. د. حوسێن محەمەد عەزیز، سەلیقەی زمانەوانیی و گرفتەکانی زمانی کوردیی، چاپ1، چاپخانەی هەواڵ، لە بلاوکراوەکانی دەزگەی سەردەم، سلێمانی، 1999.

19. د. حوسێن محەمەد عەزیز، دلزار دوێنێ و ئەوڕۆ، شیعرستان، گۆڤار، ژمارە، سولەیمانیی، 2001.
20. د. حوسێن محەمەد عەزیز، دیدی نەتەوەیی و نانەتەوەیی، چاپ1، چاپخانەی ئەزمڕ، سولەیمانیی، 2002.
21. خادیم، دیوان، بەرگ1، چاپ1، چاپخانەی دار ئەلحوریە، بەغدا، 1980.
22. حیلمی، دیوان، چاپ1، چاپخانەی ئەلئیرشاد، بەغدا، 1985.
23. خالید حیسامی « هێدی »، کاروانی خەیاڵ، دیوان، چاپ1، ئینتشاراتی صلاح الدینی ئەییوبی، ارومیە، 1364.
24. خانی، مەم و زین، دیوان، هەژار کردوویە بە موکریانی، چاپ1، چاپخانەی نەجاح، بەغدا، 1960.
25. دلزار، دیوان، چاپ1، سوید ـ ستۆکهۆلم، 1992.
26. رەزا تاڵەبانی ـ شێخ، دیوان، ئامادەکردنی ناسری ئیبراهیمی، لە بلاکراوەکانی کتێبی هەرزان ـ یۆنشۆپینگ ـ سوید، 1993.
27. رەفیق حیلمی، شعر و ئەدەبیاتی کوردی، بەرگ1 و 2، چاپ2، چاپخانەی خوێندنی بالا، هەولێر، 1988.
28. رەنجوری، مەلا عومەری زەنگنە، دیوان، چاپی1، چاپخانەی افاق عربیە، بەغدا، 1983
29. زێوەر، سۆزی نیشتمان، دیوان، چاپ1، چاپخانەی مەعارف، بەغدا، 1958.
30. سالم، دیوان، کتابفرۆشی و چاپخانەی موفقی لە مەهاباد بلاویکردۆتەوە. چاپخانەی ( محمدی، سقز )
31. سیف القضات، دیوان، کۆکردنەوی قازی ئەحمەد، چاپ1، چاپخانە سبز، 1361.
32. شاهۆ، دیوان، کۆکردنەوە و رێکخستنی محمد امین کاردۆخی، بەرگ1، چاپ1، چاپخانەی راپەرین، سلیمانی، ساڵی چاپ ...؟
33. صدیق بۆرەکەیی « صفیزادە »، مێژووی وێژەی کورد، بەرگی، چاپ1، چاپخانە چهر تبریز، انتشارات ناجی ـ بانە ـ کردستان، 1370
34. صدیق بۆرەکەیی « صفیزادە »، مێژووی وێژەی کورد، بەرگ1، چاپ1، چاپخانە چهر تبریز، انتشارات ناجی ـ بانە ـ کردستان، 1370
35. صەیدی، دیوان، کۆکردنەوە و شیکردنەوەی محمد امین کاردۆخی، چاپ1، چاپخانەی کامەران، سلێمانی، 1971.
36. طاهر بەگی جاف، دیوان، چاپ3، چاپخانەی هەولێر، هەولێر، 1966.
37. طاهر فواد، دیوان، چاپ1، چاپخانەی کوردستان، هەولێر، 1970.

38. علاء الدين سجادي، میژوی ئەدەبی کوردی، چاپ1، چاپخانەی معارف، 1952.
39. علی بەردەشانی ـ شایەری کورد، گۆڤاری « روناکی » ژمارە « 8 » هەولێر، 1936.
40. عەبباس حەقیقی، دیوان، چاپ1، انتشارات صلاح الدین ایوبی، ارومیە، 1367 هـ.
41. عەونی، دیوان، چاپی یەکەم، چاپخانەی پەروەردە، هەولێر، 1997.
42. د. عیززەدین م. ڕەسووڵ، شیعری کوردی ـ ژیان و بەرهەمی شاعیرانی، بەش1، چاپ1، چاپخانەی ئەلحەوادث، بەغدا، 1980.
43. فانی مەلا حسین شێخ سعدی، دیوان، چاپ1، چاپخانەی ڕۆشنبیری، هەولێر، 1984.
44. قادری کۆیی ـ حاجی، دیوان، لە چاپکراوەکانی ئەمینداریتی گشتیی ڕۆشنبیریی و لاوانی ناوچەی کوردستان، 1986.
45. قانع، ژیان و شیعرەکانی، برهان قانع کۆیکردۆتەوە و سەرپەرشتی چاپکردنی کردووە.
46. کاکەی فەلاح ـ حەمە حەمەئەمین قادر، کاروانی شیعری نوێی کوردیی، بەرگ1، چاپ1، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا، 1978.
47. د. کامل حسن عزیز البصیر، ڕەخنەسازی مێژوو و پەیڕەوکردن، چاپ1، چاپخانەی کۆڕی زانیاری عێراق، بەغداد، 1983.
48. کانی، دیوان، چاپ1، چاپخانەی ئەلحوادث، بەغدا، 1980.
49. کەمالی، دیوان، چاپ1، مطبعە دار الشئون الثقافیە العامە، بغداد، 1986.
50. گوڵزاری کوردستان، ئامادەکردنی صالح شێخی، چاپ1، کتێبفرۆشی شێخی، سنە، 1377.
51. د. مارف خەزنەدار، لە بابەت مێژووی ئەدەبی کوردیی یەوە، چاپخانەی الموسسە العراقیە للدعایە و النشر، بەغدا، 1984.
52. محەمەد بەهادین مەلا صاحب، دیوان، پیر شالیاری زەردەشتی « هەورامی »، چاپ2، ئینتشاراتی محمدی سەنەندوج، ساڵی چاپ؟
53. د. محەمەد نووری عارف، تێکستی ئەدەبی کوردی " هۆنراوە "، بەش2، چاپ1، چاپخانەی زانکۆی سلێمانی، 1981.
54. د. مکرم تاڵەبانی، شێخ ڕەزای تاڵەبانی، ژیانی پەروەردەی بیروباوەڕی و شیعری، چاپ1، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، 2001.
55. مەحوی، دیوان، چاپ2، چاپخانەی ئۆفێست، بەغدا، 1984.

56. مەولەوی، دیوان، چاپ1 ، چاپخانەی ئەلنەجاح، 1961. « کتێبفرۆشی سیدیان مهاباد »
57. موخلیس، دیوان، چاپ1 ، چاپخانەی سەفوەت، سلێمانی، 1988.
58. مەلای جزیری، دیوان، هەژار شەرحی لێ کردووە، چاپ1 ، سروش، تهران، 1361 هـ.
59. مەلا عەبدولکەریمی مدرس، ئەنا و سکالا، چاپ1 ، چاپخانەی ئەلحوادث، بەغدا، 1987.
60. مینە جاف، دیوان، چاپ1 ، چاپخانەی ئەلجاحظ، بەغدا، 1990.
61. ناری، دیوانی کاکە حەمەی مەریوانی، کتێبفرۆشی « سیدیان » مهاباد ـ ئێران ـ ئازربایجانی غەربی.
62. نافع مەزهەر « شپرزە »، چاپ 1 ، سوید، 1995 .
63. نالی، دیوان، انتشارات صلاح الدین ایوبی، چاپ2، چاپخانەی سپهر، تهران، 1364 هـ.
64. شێخ نووریی شێخ سالح، دیوان، بەرگ1 ـ بەش1 ، چاپ1 ، چاپخانەی دار ئەلجاحیظ، بەغداد، 1985.
65. هەردەوێڵ کاکەیی، مصطفی نەریمان، شاعیری چەوساوەکان خەلیل منەوەر، دیوان، چاپ1 ، دار ئەلحوریە، بەغدا، 1984.
66. هێمن، پاشەرۆک، چاپ2، چاپخانەی پیروز، لە بلاوکراوەکانی سەییدیان، مهاباد، خاکەلێوەی 1362 هـ.
67. وەفایی، دیوان، انتشارات صلاح الدین ایوبی، اورمیه، 1364 هـ.
68. فریمان جرنفیل، التقویمان الهجری و المیلادی، ترجمه د.حسام محی الدین الالوسی، مطبعه الجمهوریه، الطبعه الثانیه، بغداد، 1986.
69. ث. ف. مینورسکی، ملاحظات و انطباعات، پیتروغراد، 1915. ترجمه من الروسیه الی العربیه و علق علیه و کتب مقدمته الدکتور معروف خەزنەدار، بغداد، 1968.

* * *

## بەرهەمە چاپکراوەکانی نووسەر :

### گوتــار :

1. بەرەو ئازادیی، گ. ڕابوون، ژ. 2، سوید، 1991،
2. لە پێناوی ڕاستیدا، گ. بەربانگ، ژ.87، ساڵی12، سوید ـ1993.
3. یەکێتی سۆڤێتی هەڵوەشاوە لە ڕوانگەی بەرژەوەندییەکانی نەتەوەی کوردەوە، گ. ڕابوون، ژ.7 ـ 8، سوید، 1993.
4. دەربارەی کەسایەتیی کورد، گ. ڕابوون، ژ. 10 ـ11، سوید، 1994.
5. بەرەو ستراتیژێکی یەکگرتووی نەتەوەیی، هەنگاو، ژ.13، لەندەن،1995.
6. سایکۆلۆژییەتی مرۆڤی ئاوارەی کورد ....، گ. گزینگ، ژ.8، سوید، 1995.
7. لێکۆڵینەوەیەک دەربارەی کۆمەڵگەی کوردەواریی، گ. گزینگ، ژ.9، 1995.
8. کۆڕیە تاقانە ساواکەی دەنگ و ڕەنگی نەتەوەکەم(MedTV)، گ. گـزینگ، ژ.13، سوید، 1996.
9. هەنگاوی یەکەم و ....، گ. بەربانگ، ژ.102، ساڵی14، سوید، 1996.
10. چەند سەرنجێ دەربارەی سەرەخۆشیی و پرسەدانان، گ. بەربانگ، ژ. 104، سوید، 1997
11. دیکتاتۆرەکان لە بەر یەک ئاوێنە قژی نەخشە و پلانەکانیان دادەهێنن، گ. بەربانگ، ژ. 105، سوید، 1997. گ. دیمۆکراسی، ژ.30، سلێمانی، 1997.
12. کەی هۆشێ بە بەر خۆماندا دەهێنینەوە؟ گ. بەربانگ، ژ. 106-107، سوید، 1998. گ. دیمۆکراسی، ژ.31، سلێمانی،1998.
13. با خۆمان چاک بناسین، گ. بەربانگ، ژ.108، سوید، 1998.
14. سێ سەرنجی زمانەوایی، مانگنامەی پەیام، ژ. 8، 1998.
15. مافی دیاریکردنی چارەنووس، گ. ئاڵا، ژ.30، 1998.
16. بۆرە نەبێ، بازەبێ، کلکی بە ئەندازەبێ، گ. بەربانگ، ژ. 109، 1998.
17. ئاشتیی بە دەنگ نییە، بە ڕەنگە، ڕ. کوردستان، ژ.7، بەرلین،1998.
18. چەن سەرنجێ دەربارەی ناسنامەی ئایینی...، گ. ئێستا، ژ.20، 1999
19. زێوەر لە نێوان کوردایەتیی و عێراقچێتیدا، گ. ئاینده، ژ.1، سولەیمانیی، 1999.
20. داری بەزەیی خوا، ڕ. کوردستانی نوێ، بەشی یەکەم، ژ.1902، 1999/713. بەشی دووەم، ژ.1903، 1999/7/14، سولەیمانیی.
21. دەربارەی مەلەفی کەرکووک، ڕ.کوردستانی نوێ، ژ.1921، 9990/8/11، سولەیمانی. مانگنامەی کوردستانی نوێ لە دەرەوەی وڵات، ژ.67، 1999/825.

22. شێوازی خەبات و مافی چارەنووسی نەتەوەکان، ڕ. کوردستانی نوێ، ژ. 1928، 1999/8/18، سولەیمانیی.
23. دەربارەی فریزیۆلۆژی کوردیی، ڕ. ئالآی ئازادی، ژ. 220، 1999/7/12.
24. خڕنووکیش لە بیاباندا درەختە، گ. گزینگ، ژ.28، سوید2000. ڕ. ئالآی ئازادی، ژ. 378 ، 2000/08/20، سولەیمانیی.
25. ژن لە ئاوێنەی تەڵخی هێندێ هۆنراوەی کوردییدا، گ. گزینگ، ژ.29، 2000. ڕ. کوردستانی نوێ، ژ. 2312، 2000/11/25، سولەیمانیی.
26. هێزی یەکێتیی لە سایەی دیمۆکراسییدا، ڕ. کوردستانی نوێ، ژ. 2314، 2000/11/27، سولەیمانیی.
27. ڕۆژمێری ڕووداوەکانی مانگی نۆڤەمبەر لە مێژووی کورددا، کوردستانی نوێ، ژ.2317، 2000/11/30. سولەیمانیی.
28. مەحویی لە نێوان خواپەرستیی و کوردایەتییدا، گ. ئاینده، ژ.15، 2000.
29. دڵزار دوێنێ و ئەوڕۆ، گ. شیعرستان، ژ. 6، سولەیمانیی، 2001.
30. نەورۆزی کورد، گ. گزینگ، ژ.31، 2001.
31. شەکرە شارەکەم سولەیمانیی، گ. گزینگ، ژ. 32،2001. گ. گەلاوێژی نوێ، ژ.26، کوردستان ـ سولەیمانیی، 2001.
32. ئابووریی هاوبەش لە نێوان مارکسیزم و ناسیۆنالیزم هەر لە کۆنەوە هەتا ئێستا، گ. مەدەنیەت، ژ.11، کوردستان ـ سولەیمانیی،2001.
33. سولەیمانیی ئانوێ، ڕ. کوردستانی نوێ، ژ. 2855، ڕۆژی شەممە، 2002.09.07، سولەیمانیی.
34. مانگی خوێن و هیوا، ڕ. کوردستانی نوێ، ژ. 2874، 09.29 .2002.

**نامیلکە و پەرتووک :**

1. دەربارەی پرۆژەکەی یەکێتی نیشتمانیی کوردستان، چ.1، سوید، 1994.
2. دوا پرۆژە، چ.1، سوید، 1994.
3. پێنج ووتاری غەمگین، چ.1، چاپخانەی باران، سوید، 1994.
4. دیموکراسی، ئایدۆلۆژی و جەنگی نێوخۆ، چ.1، چاپخانەی باران، سوید، 1994.
5. ململانێی ئایدۆلۆژی لە کوردستاندا، چ.1، چاپخانەی نەزمی، سولەیمانی 1993. چ.2 ، چاپخانەی کیتاب هەرزان، سوید، 1995.
6. پێنج کاتژمێر لەگەڵ برایم ئەحمەددا، چ.1، چاپخانەی باران، سوید، 1995. چ.2، چاپخانەی نەزمی، سولەیمانیی 1996. چ. 3، چاپخانەی سیما، سولەیمانیی، 2002.
7. نامەیەکی درێژ بۆ نەوشیروان مستەفا، چ.1، چاپخانەی باران، سوید، 1995.

8. کورد و شۆڕش و هەلی مێژوویی، چ.1، چاپخانەی کیتاب هەرزان، سوید، 1996. چ. 2، چاپخانەی هەمیشە، کوردستان، 2000.
9. فیدرالیزم و دەوڵەتی فیدراڵ، چ.1، چاپخانەی باران، سوید، 1996. چ.2، لە بلاوکراوەکانی دەزگەی دیمۆکراسیی، سولەیمانی، 1996.
10. بەڵێ لێکۆڵینەوە و ڕەخنە نەک شێواندنی ڕاستیی، چ.1، چاپخانەی کیتاب هەرزان، سوید، 1996.
11. خولانەوە لە بازنەیەکی بۆشدا، چ1، چاپخانەی ئاپێک، سوید، 1997. چ.2، چاپخانەی سیما، سولەیمانیی، 2002.
12. ڕۆڵی سیستێمی بنەماڵە لە بزاڤی ڕزگاریخوازی نیشتمانیی کوردستاندا، چ.1، چاپخانەی میدیا، سوید، 1997. چ. 2، چاپخانەی ئەزمر، سولەیمانیی، 2001.
13. گیروگرفتە سەرەکییەکانی کورد، چ. 1، چاپخانەی کیتاب هەرزان، سوید، 1998. چ. 2، چاپخانەی سیما، سولەیمانیی، 2000.
14. ئۆجەلان ئەزموونێکی نوێ و پەندی مێژوویی، چ.1، چاپخانەی میدیا، سوید، 1999. چ.2، سولەیمانیی، 1999.
15. سەلیقەی زمانەوانیی و گرفتەکانی زمانی کوردیی، چ.1، چاپخانەی هەواڵ، لە بلاوکراوەکانی دەزگای سەردەم، سولەیمانیی، 1999.
16. خلتەی بیرێکی ژاراویی، چ.1، چاپخانەی هەمیشە، سولەیمانیی، 2000.
17. مەسعوود محەمەد و دوو دیداری دۆستانە، چ.1، چاپخانەی تیشک، کوردستان - سولەیمانیی،200.
18. دید نەتەودیی و نانەتەوەیی، چ.1، چاپخانەی ئەزمر، سولەیمانیی، 2002.
19. سنوورە قەدەغەکان مەشکێنن، چ.1، چاپخانەی سیما، سولەیمانیی، 2003.
20. پەیمانێکی ڕەش و ڕۆژێکی سوور، چ.1، چاپخانەی ئەزمر، سولەیمانیی، 2003.
21. شەکرە شارەکەم «سولەیمانیی»، لە بلاوکراوەکانی شارەوانیی «سولەیمانیی»، چ1، چاپخانەی شڤان، کوردستان - سولەیمانیی، 2003.
22. یاقووت و زمرووتی کوردیی، بەرگ1، چ.1، لە بلاوکراوەکانی وەزارەتی ڕۆشنبیریی، کوردستان - سولەیمانیی، 2003.

* * *

بەرگی یەکەمی ئەم بەرهەمە، مامۆستا « حەسەن عەبدولکەریم »، وەک شارەزایەکی، « بەڕێوەبەرێتی گشتیی چاپ و بڵاوکردنەوە ــ شالیارگەی ڕۆشنبیریی » لە « سولەیمانیی »، هەڵیسەنگاندووە و لە ڕاپۆرتی خۆیدا، بۆ بەڕێوەبەری دەزگەکە نووسیوێتی:

**بەڕێز مامۆستا شێخ محەمەد**
**پاش خوێندنەوەی بەرهەمەکە، لام وایە، نەک هەر، شایانی چاپکردنە، بەڵکوو پێویستە، لە زانکۆدا، بکرێتە یەکێ لەو بابەتانەی، کە لە کۆلێژی ئادابدا بخوێنرێ.**

**حەسەن عەبدولکەریم**
2002. 09. 02

## بەرهەمی داهاتــــــوو

1. یاقووت و زمڕووتی کوردیی، بەرگی3، سرووشت و جوانیی.
2. یاقووت و زمڕووتی کوردیی، بەرگی4، ئەڤین و دڵداریی.
3. یاقووت و زمڕووتی کوردیی، بەرگی5، نەتەوەیی و نیشتمانیی.

هۆنراوە دەبێ، وەك خشتی مۆزاییك رەنگینبێ. وەك بەردی مەڕمەڕ لووسبێ. وەك گوڵی تازە پشکووتووی بەهار ( تەڕ، نوێ، گەش، جوان‌و بۆنخۆش )بێ. وەك ئاوی خاوێنی کانیاوی دامێنی چیای کوێستانەکانی کوردستان ( گیانبەخش، ڕوون، ڕەوان‌و سازگار )بێ. وەك سەرخەوی خۆشی بەهاران ( گیانفرێن‌و هەستبزوێن )بێ. وەك مەی ( خۆشیهێنەر و نەشەبەخش )بێ. هۆنراوە دەبێ، هێندە ( ساکار، بێ گرێوگۆڵ‌و ڕەوان )بێ، خوێنەر، بێ هیچ جۆرە گرفتێ، لە واتاکەی بگا، بە ئاسانیی، بە پەیژەی ئەندێشە و بیری هۆنەردا هەڵگەڕێ.

گەر هۆنراوەیەك، وەك ڕووی یار، گەش نەبێ. وەك زەردەخەنە، جوان نەبێ. وەك ئەستێرە، نەجریوێنێ. وەك ئاوی کانیی، ڕوون نەبێ. وەك باوەشی ژن، گەرموگوڕ نەبێ. وەك کامەرانیی، ئاسوودە نەبێ. وەك کیژە کورد، نازدار نەبێ. وەك کوردستان، جوان نەبێ. وەك موزیك، خۆراکی گیان نەبێ. وەك گوڵ، شیلەی ژیانی هەنگ نەبێ. وەك زەنگۆڵەی ملی کارمامز، زرنگەی نەیە. وەك باڵی پەپوولە، نەخشین‌و ڕەنگین نەبێ. وەك سرووشتی جوانی ( هەورامان )، زیندوو نەبێ. وەك نەتەوەی کورد، گیانی خۆڕاگریی تێدا نەبێ‌و تەمەندرێژ نەبێ. وەك داربەڕوو، ڕەگی قووڵ دا نەچووبێ. وەك کاکە ( مەم )، زمانی دڵی خاتوو ( زین ) نەبێ. وەك ( وەلیی )، شەیدای ( شەم )نەبێ. هەر پیتێکی، گەوهەرێ نەبێ. هەر ووشەیەکی، پارچە زێڕێ نەبێ. هەر دێڕێکی، گەنجێ نەبێ. سەراپای هۆنراوەکەش، لە زەریای قووڵی بێ بنی (جوانیی، ناسکیی، ڕەوانیی، ساکاریی، شیرینیی، تەڕوپاراویی‌و دلگیریی )دا، نقوم نەبووبێ‌و سیمفۆنیایەکی هونەریی بێ وێنەی وێژەیی هاوئاهەنگ‌و ڕێکوپێك پێك نەهێنێ، باشتر وایە، ئەو هۆنراوەیە هەر نەبێ!

THE KURDISH RUBY & EMERALD

D[illegible]z



وەزارەتی رۆشنبیری - بەڕێوەبەرێتی گشتیی چاپ و بڵاوکردنەوە

نرخی (1500) دینارە